# شەرحی

# الدُّرَرُ البَهِيةِ فِي المَسَائِلِ الفِقهِيةِ

## بەشی نوێژ


نوسینی پێشەوا

محمد بن علي الشوكاني

ئامادەكردنی

عوسمان ئەحمەد حاتەم



چاپی یەكەم

## پێشەکی

تێگەیشتن لە ئاین پلەوپایەیەکی زۆر گەورەی هەیە، بەتایبەت زانستی فقهـ دەتوانرێت بگوترێت پلەی لە دوای زانستی تەوحیدەوەیە، لەبەر ئەوەی موسڵمان ڕۆژانە پێویستی پێی دەبێت بۆ دەستنوێژگرتن و نوێژکردن و خۆشۆردنی لەشگرانی و هەموو کردەوە شەرعییەکانی تر، بوخاری و مسلم لە موعاوییەی کوڕی ئەبوسوفیانەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَن يُرِدِ اللهُ به خَيْراً يُفَقِّهْهُ في الدِّينِ))، واتە: هەرکەسێك خوای پەروەردگار بیەوێت خێری دەستگیر بکات لە ئاین تێی دەگەیەنێت.

لەم کتێبەدا دەقی (الدرر البهية شرح المسائل الفقهية)م شەرحکردووە کە دانراوی پێشەوا شەوکانییە، لەبەر ئەوەی خاوەنەکەی زانایەکی زۆر شارەزابوو لە زۆر لە زانستە شەرعییەکان زانایان گرنگییەکی زۆریان بە شەرحکردن و لێکدانەوەی داوە، وشەی (الدرر) کۆی (درة)یە کە مانای مرواریییە، (البهية) مانای جوان و ڕازاوەیە، (مرواریییە جوان و ڕازاوەکان لە پرسە فقهییەکان)، شەوکانی لە (١١٧٣ك) لە دایکبووە و لە ساڵی (١٢٥٠ك) وەفاتی کردووە، کۆمەڵێك شاکاری گرنگی هەیە لەوانە: (فَتْحُ الْقَدِيرِ الْجَامِعُ بَيْنَ فَنَّيِ الرِّوَايَةِ وَالدِّرَايَةِ من التفسير) کە بە (فتح القدر) یان (تفسير الشوكاني) ناسراوە، و (إرشاد الفحول إلى تحقيق الحق من علم الأصول)، و (نيل الأوطار شرح منتقى الأخبار)، و نوسەر خۆی مەتنی کتێبەکەی شەرحکردووە و ناوی لێناوە: (الدراري المضيئة في شرح الدرر البهية).

لەم شەرحەدا دەقی نوسینەکەی شەوکانیم وەرگێڕاوە، پاشان بڕگە بڕگە شەرحم کردووە و بەڵگەم هێناوەتەوە بۆ پرسەکانی، و زۆرجار تەنها یەك بەڵگەم باسکردووە، و ئەگەر پرسێك بەڵگەی صەحیحی لەسەر نەهاتبێت بە دوای ئیجماع یان بۆچوونی جمهوری زانایاندا گەڕاوم ئەگەر دەستم کەوتبێت هێناومە، وەك زانراوە نوسەر لێکۆڵەرە و پابەند نییە بە هیچ مەزهەبێکی فقهییەوە، و سودی زۆرم لە (الدراري المضيئة)ی نوسەر، و (الروضة الندية)ی صديق حسن خان القنوجي وەرگرتووە، ئەگەر بوخاری و مسلم فەرموودەیەکیان ڕیوایەت کردبێت باسی فەرموودەناسەکانی ترم لەگەڵدا نەکردوون، لەبەر سودێك نەبێت کە لە ڕیوایەتی جگە لە بوخاری و مسلمدا هاتووە، و ئەگەر جگە لەوانیش خاوەن سونەنەکان ڕیوایەتیان کردبێت بە لایەنی کەمەوە ناوی یەکێکیانم هێناوە و بۆچوونی ئەلبانیم لەسەر فەرموودەکە باسکردووە.

ئەم مەتنە لەگەڵ ئەوەی پوخت و کورتە زۆربەی بابەتە فقهییەکانی تێدا باسکراوە، و لەبەر زۆر درێژ نەبوونەوە ڕەچاوی کورتبڕیم کردووە بۆ ئەوەی خوێندنەوە و تێگەیشتنی ئاسان بێت لای خوێنەرانی.

عوسمان ئەحمەد حاتەم

١ی موحەڕەمی ١٤٤٦ك

٧ی تەموزی ٢٠٢٤ز

گەرمیان ـ کەلار

## كِتَابُ الصَّلَاةِ

## بَابُ مَوَاقِيتِ الصَّلَاةِ

**أَوَّلُ وقتِ الظُّهرِ: الزَّوَالُ، وَآخِرُهُ: مَصِيرُ ظِلِّ الشَّيءِ مِثلَهُ، سِوَى فَيْءِ الزَّوَالِ، وَهُوَ: أَوَّلُ وَقتِ العَصرِ، وَآخِرُهُ: مَا دَامَت الشَّمسُ بَيضَاءَ نَقِيَّةً، وَأَوَّلُ وَقتِ المَغرِبِ: غُرُوبُ الشَّمسِ، وَآخِرُهُ: ذَهَابُ الشَّفَقِ الأَحمَرِ، وَهُوَ: أَوَّلُ العِشَاءِ، وَآخِرُهُ: نِصفُ اللَّيلِ، وَأَوَّلُ وَقتِ الفَجرِ: إِذَا انشَقَّ الفَجرُ، وَآخِرُهُ: طُلُوعُ الشَّمسِ.**

## کتێبی نوێژ

## بابەتی کاتەکانی نوێژ

**سەرەتای کاتی نیوەڕۆ: لاربوونەوەی خۆرە لە ناوەڕاستی ئاسمان، و کۆتاییەکەی: ئەگەر سێبەری شتێك هێندەی خۆی لێ بێت، جگە لە سێبەری کاتی لاربوونەوە، و ئەوە: سەرەتای کاتی عەسرە، و کۆتاییەکەی: هەتا ئەو کاتەیە تیشکی خۆر سپییە و زەردی تێیکەڵ نەبووە، و سەرەتای کاتی مەغریب: ئاوابوونی خۆرە، و کۆتاییەکەی: ئاوابوونی شەفەقی سورە، کە ئەوە: سەرەتای کاتی عیشایە، و کۆتاییەکەی: نیوەی شەوە، و سەرەتای کاتی بەیانی: ئەو کاتەیە کە سپێدە دەردەچێت، و کۆتاییەکەی: هەڵهاتنی خۆرە.**

(**الصَّلَاةِ**) نوێژ لە زماندا مانای نزا و پاڕانەوەیە، و لە شەرعدا بریتییە لە هەندێك کردار و گوفتار بە کۆمەڵە مەرج و ڕوکن و واجب و سوننەتێکی دیاریکراو کە بە (الله أکبر) دەست پێدەکات و بە سەلامدانەوە کۆتایی دێت، و گەورەترین پایەی کرداری ئاینی ئیسلامە، و دووەم پایەی ئاینە دوای شایەتومان، زانایان کۆڕان هەرکەسێك باوەڕی بە نوێژکردن نەبێت کافرە، و ناکۆکن لەبارەی کەسێکەوە باوەڕی بە نوێژ هەبێت، و هەندێك جار نوێژ بکات و هەندێك جار وازی لێ بهێنێت، یان لەبەر تەمبەڵی نوێژ نەکات، ئەم کەسە هەڕەشەی توندی

لەسەرە، بەڵام جمهوری زانایان بۆچوونیان وایە ئەو کوفرەی تێیکەوتووە کوفری کردارییە و لە ئاینی ئیسلام دەرناچێت، و کاربەست داوا لەو کەسە دەکات نوێژ بکات ئەگەر نوێژی نەکرد دەکوژرێت لای جمهوری زانایان، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیە کە بوخاری و مسلم لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لاَ إِلَهَ إِلَّا اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، وَيُقِيمُوا الصَّلاَةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إِلَّا بِحَقِّ الإِسْلاَمِ، وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللهِ)).

واتە: فەرمانم پێکراوە شەڕ بکەم لە دژی خەڵکدا هەتاکو گەواهیدەدەن کە هیچ پەرستراوێکی حەق نییە جگە لە خوا، و محمد پێغەمبەری خوایە، و نوێژەکانیان بەوشێوەیە دەکەن کە فەرمانیان پێکراوە، و زەکاتی سامانەکان دەردەکەن، ئەگەر وایانکرد خوێن و سامانیان لە من پارێزراوە ئیللا بە حەقی ئیسلام نەبێت، و لێپرسینەوەیان لای خوایە.

(**مَوَاقِيت**) کۆی (میقات)ە، ڕەچاوکردنی کاتەکانی نوێژ و ئەنجامدانی لەو کاتە لە شەرعدا دیاریکراوە پێویستە، و گرنگییەکی زۆری هەیە، چونکە کەسێك پێش هاتنی کاتی نوێژەکە نوێژ بکات نوێژەکەی بەتاڵە، و داخڵبوونی کات مەرجە بۆ دروستی نوێژ، خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلۡوُسۡطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ٢٣٨﴾(البقرة).

واتە: پارێزگاری لە نوێژە فەرزەکانتان بکەن و بە جوانی لە کاتی خۆیاندا بەجێیان بهێنن و ڕەچاوی هەموو مەرج و پێویستییەکانی بکەن و بەردەوامبن

لەسەریان بەتایبەت نوێژی ناوەند کە نوێژی عەسرە، و هەستن و سەرکز و ملکەچی فەرمانی خوابن.

و دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا ١٠٣﴾(النساء).

واتە: بێگومان نوێژ لەسەر باوەڕداران فەرزکراوە، و دەبێت لە کاتی دیاری کراودا بەجێی بهێنن.

(**أَوَّلُ وقتِ الظُّهرِ: الزَّوَالُ، وَآخِرُهُ: مَصِيرُ ظِلِّ الشَّيءِ مِثلَهُ، سِوَى فَيْءِ الزَّوَالِ**) دیاریکردنی سەرەتا و کۆتای کاتەکانی نوێژ لە فەرمووده صەحیحەکاندا هاتووه، جبریل علیه السلام پێغەمبەری خوای ﷺ فێرکردووه، و پێغەمبەری خواش ﷺ ڕوونیکردووەتە بۆ هاوەڵان، خۆر کاتێك لە ناوەڕاستی ئاسمان لادەدات کەمێك سێبەری هەیە کە پێی دەگوترێت سێبەری (زوال)، دوای ئەوە سەرەتای کاتی نوێژی نیوەڕۆیە، و ئەگەر شتێك لە زەوی بچەقێنرێت و سێبەرەکەی هێندەی خۆیی لێ بێت کاتی نوێژی نیوەڕۆ کۆتایی دێت، جگە لە سێبەری کاتی لاربوونەوە، مسلم لە عبداللەی کوڕی عەمرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((سُئِلَ رَسُولُ الله ﷺ عَنْ وَقْتِ الصَّلَوَاتِ؟ فَقَالَ: ... وَقْتُ صَلَاةِ الظُّهْرِ إِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ عَنْ بَطْنِ السَّمَاءِ، مَا لَمْ يَحْضُرِ الْعَصْرُ)).

واتە: پرسیارکرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی کاتی نوێژەکان؟ فەرمووی: کاتی نوێژی نیوەڕۆ ئەو کاتەیە خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایدا، هەتا کاتی نوێژی عەسر نەیەت.

و نەسائی لە جابری کوڕی عبداللهوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((جَاءَ جبْرِيلُ عليه السلام إِلَى النَّبِيِّ ﷺ حِينَ زَالَتِ الشَّمْسُ، فَقَالَ: قُمْ يَا مُحَمَّدُ، فَصَلِّ الظُّهْرَ حِينَ مَالَتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ مَكَثَ حَتَّى إِذَا كَانَ فَيْءُ الرَّجُلِ مِثْلَهُ جَاءَهُ لِلْعَصْرِ)).

واتە: جبریل علیه السلام هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایدا، فەرمووی هەستە ئەی محمد نوێژی نیوەڕۆ بکە کاتێك خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایدا، پاشان مایەوە هەتا سێبەری پیاو هێندەی خۆی لێهات هات بۆ لای بۆ نوێژی عەسر.

سوننەتە نوێژی نیوەڕۆ لە سەرەتای کاتەکەیدا بکرێت، ئیبن حبان لە ئیبن مەسعودەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَيُّ الأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟، قَالَ: الصَّلَاةُ فِي أَوَّلِ وَقْتِهَا)).

واتە: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، کام کردەوە باشترینە؟، فەرمووی: بەجێهێنانی نوێژ لە سەرەتای کاتەکەیدا.

لە صەحیحی مسلمدا بابەتێك هاتووە: (بَابُ اسْتِحْبَابِ تَقْدِيمِ الظُّهْرِ فِي أَوَّلِ الْوَقْتِ فِي غَيْرِ شِدَّةِ الْحَرِّ)، پاشان مسلم لە جابری کوڕی سەمورەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي الظُّهْرَ إِذَا دَحَضَتِ الشَّمْسُ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆی دەکرد کاتێك خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لاییدایەت.

بەڵام کاتێك کەش و هەوا گەرم بێت سوننەتە نوێژی نیوەڕۆ دوا بخرێت هەتاکو کاتێك فێنك دەکات، بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِذا اشْتَدَّ الحَرُّ فأَبْرِدُوا عَنِ الصَّلاةِ، فإِنَّ شِدَّةَ الحَرِّ مِن فَيْحِ جَهَنَّمَ)).

واتە: ئەگەر کەش و هەوا زۆر گەرم بوو نوێژی نیوەڕۆ دوا بخەن هەتاکو فێنك دەکات، چونکە بەڕاستی زۆر گەرمی کەش و هەوا لە هاڵاو و گەرمی دۆزەخە.

(**وَهُوَ: أَوَّلُ وَقتِ العَصرِ**) ئەگەر سێبەری شتێك بوو بە هێندەی خۆی سەرەتای کاتی نوێژی عەسرە، نەسائی لە جابری کوڕی عبداللهوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((جَاءَ جِبْرِيلُ عليه السلام إِلَى النَّبِيِّ ﷺ ... ثُمَّ مَكَثَ حَتَّى إِذَا كَانَ فَيْءُ الرَّجُلِ مِثْلَهُ جَاءَهُ لِلْعَصْرِ، فَقَالَ: قُمْ يَا مُحَمَّدُ، فَصَلِّ الْعَصْرَ، ثُمَّ مَكَثَ حَتَّى إِذَا غَابَتِ الشَّمْسُ جَاءَهُ)).

واتە: جبریل علیه السلام هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ... پاشان مایەوە هەتاکو سێبەری پیاو هێندەی خۆی بوو هاتەوە بۆ عەسر، فەرمووی: هەستە ئەی محمد، نوێژی عەسر بکە، پاشان مایەوە هەتاکو خۆرئاوابوو گەڕایەوە بۆ لای.

هەتا ئەو کاتەی سێبەری هەموو شتێك دوو هێندەی خۆی لێ دێت، ئەبوداود لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، لەو فەرموودەیە جبریل علیه السلام پێشنوێژی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کردووە، جاری دووەم گەڕاوەتەوە بۆ لای، دەفەرموێت: ((ثُمَّ صَلَّى بِيَ الْعَصْرَ حِينَ كَانَ ظِلُّ كُلِّ شَيْءٍ

مِثْلَيْهِ... ثُمَّ الْتَفَتَ إِلَيَّ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، هَذَا وَقْتُ الْأَنْبِيَاءِ مِنْ قَبْلِكَ، وَالْوَقْتُ مَا بَيْنَ هَذَيْنِ الْوَقْتَيْنِ)).

واتە: پاشان نوێژی عەسری پێکردم ئەو کاتەی سێبەری هەموو شتێك دوو هێندەی خۆی بوو... پاشان جبریل لای کردەوە بەلامدا و فەرمووی: ئەی محمد ئەمە کاتی نوێژی پێغەمبەرانی پێش تۆیە، و کاتی نوێژ لە نێوان ئەم دوو کاتەدایە.

(**وَآخِرُهُ: مَا دَامَت الشَّمسُ بَيضَاءَ نَقِيَّةً**) ئەو کاتەی باشترە نوێژی عەسری تێدا بکرێت سەرەتای کاتەکەیەتی کە تیشکی خۆر سپییە و زەردی ئاوابوونی تێکەڵ نەبووە هەتاکو سێبەری هەموو شتێك دەبێتە دوو هێندەی خۆی، مسلم لە بورەیدەی کوڕی حوصەیبەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((أَنَّ رَجُلًا أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَسَأَلَهُ عَنْ مَوَاقِيتِ الصَّلَاةِ... أَمَرَهُ بِالْعَصْرِ وَالشَّمْسُ بَيْضَاءُ نَقِيَّةٌ لَمْ تُخَالِطْهَا صُفْرَةٌ)).

واتە: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری کاتەکانی نوێژی لێکرد... فەرمانی بە بیلال کرد بانگی نوێژی عەسر بدات خۆر تیشکی سپی و پاك و ڕوون بوو و هیچ زەردی تێکەڵ نەبوو.

و نابێت نوێژی عەسر دوابخرێت بۆ نزیك کاتی خۆرئاوابوون لەبەر ناچاری نەبێت، مسلم لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((تِلْكَ صَلَاةُ الْمُنَافِق، يَجْلِسُ يَرْقُبُ الشَّمْسَ، حَتَّى إِذَا كَانَتْ بَيْنَ قَرْنَيِ الشَّيْطَانِ، قَامَ فَنَقَرَهَا أَرْبَعًا، لَا يَذْكُرُ اللهَ فِيهَا إِلَّا قَلِيلًا)).

واتە: ئەوە نوێژی کەسی دووڕووە، دادەنیشێت چاودێری خۆر دەکات، هەتاکو نزیکە خۆرئاوا ببێت و لە نێوان دووشاخی شەیتاندایە، هەڵدەستێت پەلەپەل چوار ڕکات نوێژ دەکات وەك چۆن کەڵەشێر دەنووك لە زەوی دەدات، و زیکری خوای تێدا ناکات بە کەمی نەبێت.

بەڵام نوێژەکەی دروستە ئەگەر تەنها ڕکاتێکیش پێش ئاوابوونی خۆر ئەنجام بدات، بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الْعَصْرِ قَبْلَ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ فَقَدْ أَدْرَكَ الْعَصْرَ)).

واتە: هەرکەسێك بگات بە یەك ڕکاتێك نوێژی عەسر پێش ئەوەی خۆرئاوا ببێت بێگومان گەیشتووە بە نوێژی عەسر و لە دەستی نەچووە.

**(وَأَوَّلُ وَقتِ المَغرِبِ: غُرُوبُ الشَّمسِ، وَآخِرُهُ: ذَهَابُ الشَّفَقِ الأَحمَرِ)**

مسلم لە عبداللەی کوڕی عەمرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((وَوَقْتُ صَلاَةِ الْمَغْرِبِ إِذَا غَابَتِ الشَّمْسُ مَا لَمْ يَسْقُطِ الشَّفَقُ)).

واتە: کاتی نوێژی مەغریب لەو کاتەوە دەست پێدەکات کە خۆرئاوا دەبێت هەتاکو شەفەق ئاوا نەبێت.

و سوننەتە لە سەرەتای کاتەکەیدا بکرێت، بوخاری و مسلم لە ڕافعی کوڕی خەدیجەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((كُنَّا نُصَلِّي الْمَغْرِبَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، فَيَنْصَرِفُ أَحَدُنَا وَإِنَّهُ لَيُبْصِرُ مَوَاقِعَ نَبْلِهِ)).

واتە: ئێمە نوێژی مەغریبمان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دەکرد، کەسێکمان لە نوێژ دەبوویەوە ئەگەر تیری بهاویشتایە شوێنی تیرەکەی دەبینی.

و ئەحمەد و ترمزی و نەسائی لە جابرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، لەو فەرموودەی جبريل عليه السلام پێشنوێژی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەڵێت: ((ثُمَّ جَاءَهُ لِلْمَغْرِبِ حِينَ غَابَتِ الشَّمْسُ وَقْتًا وَاحِدًا لَمْ يَزُلْ عَنْهُ، فَقَالَ: قُمْ فَصَلِّ فَصَلَّى الْمَغْرِبَ)).

واتە: پاشان لە یەك کاتدا هات بۆ لای بۆ نوێژی مەغریب لێی لانەدا، فەرمووی: هەستە نوێژ بکە، نوێژی مەغریبی کرد.

و ئەحمەد و ئەبوداود لە ئەبوئەیوبی ئەنصارییەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە (حسن صحيح)ی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((لَا تَزَالُ أُمَّتِي بِخَيْرٍ أَوْ قَالَ: عَلَى الْفِطْرَةِ مَا لَمْ يُؤَخِّرُوا الْمَغْرِبَ إِلَى أَنْ تَشْتَبِكَ النُّجُومُ)).

واتە: بەردەوام ئومەتەکەم لەسەر خێرە، یان فەرمووی: لەسەر فیترەتە، هەتاکو نوێژی مەغریب پێش دەرچوونی ئەستێرەکان بکەن.

(**وَهُوَ: أَوَّلُ العِشَاءِ**) سەرەتای کاتی نوێژی عیشای ئاوابوونی سوریی خۆرە لە خۆرئاوا، مسلم لە بورەیدەی کوڕی حوصەیبەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((أَنَّ رَجُلًا أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَسَأَلَهُ عَنْ مَوَاقِيتِ الصَّلَاة.... ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ الْعِشَاءَ حِينَ غَابَ الشَّفَقُ)).

واتە: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری کاتەکانی نوێژی لێکرد... فەرمانی بە بیلال کرد بانگی نوێژی عیشا بدات کاتێك سوریی ئاسمان ئاوا دەبێت.

و سوننەتە عیشا دوا بخرێت بۆ سێیەکی شەو یان نیوەی شەو، ترمزی و ئیبن ماجە لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویت: ((لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لأَمَرْتُهُمْ أَنْ يُؤَخِّرُوا الْعِشَاءَ إِلَى ثُلُثِ اللَّيْلِ أَوْ نِصْفِهِ)).

واتە: ئەگەر لەسەر ئوممەتەکەم نارەحەت و قورس نەبووایە فەرمانم پێدەکردن نوێژی عیشا دوابخەن بۆ سێیەك یان نیوەی شەو.

و بوخاری و مسلم لە ئەبوبەرزەی ئەسلەمییەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ يَسْتَحِبُّ أَنْ يُؤَخِّرَ الْعِشَاءَ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی خۆشبوو نوێژی عیشا دوابخات.

بەڵام ئەگەر خەڵك کۆبوونەوە سوننەتە پێش بخرێت و لە سەرەتای کاتەکەیدا ئەنجام بدرێت، بوخاری و مسلم لە جابرەوە ڕیوایەتیان کردووە باسی کاتی ئەنجامدانی نوێژەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات، دەڵێت: ((وَالْعِشَاءَ أَحْيَانًا يُؤَخِّرُهَا وَأَحْيَانًا يُعَجِّلُ، كَانَ إِذَا رَآهُمْ قَدِ اجْتَمَعُوا عَجَّلَ، وَإِذَا رَآهُمْ قَدْ أَبْطَأُوا أَخَّرَ)).

واتە: نوێژی عیشا هەندێك جار دوای دەخست و هەندێك جار پێشی دەخست، ئەگەر بیبینیایە کۆبوونەوە پێشی دەخست و لە سەرەتای کاتەکەیدا نوێژی دەکرد، و ئەگەر بیبینیایە کۆنەبوونەتەوە دوای دەخست.

شەو لە ئاوابوونی خۆرەوە هەتاکو دەرکەوتنی سپێدەی ڕاستەقینەیە، ئەو کاتە بکرێتە سێ بەشەوە بەشی یەکەمی سێیەکی شەوە، و ئەگەر بکرێت بە دوو بەشەوە بەشی یەکەمی نیوەی شەوە.

(**وَآخِرُهُ: نِصفُ اللَّيلِ**) مسلم لە عبداللەی کوڕی عەمرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((فَإِذَا صَلَّيْتُمُ الْعِشَاءَ، فَإِنَّهُ وَقْتٌ إِلَى نِصْفِ اللَّيْلِ)).

واتە: ئەگەر نوێژی عیشاتان کرد، کاتەکەی هەتاکو نیوەی شەوە.

بەڵام هەندێك لە زانایان دەڵێن: کۆتایی کاتی نوێژی عیشا هەتاکو دەرکەوتنی سپێدەی ڕاستەقینەیە، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی کە مسلم لە ئەبوقەتادەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِنَّهُ لَيْسَ فِي النَّوْمِ تَفْرِيطٌ، إِنَّمَا التَّفْرِيطُ عَلَى مَنْ لَمْ يُصَلِّ الصَّلَاةَ حَتَّى يَجِيءَ وَقْتُ الصَّلَاةِ الأُخْرَى)).

واتە: لە خەوتندا کەمتەرخەمی نییە، بەڵکو ئەو کەسە کەمتەرخەمە کە نوێژ نەکات هەتا کاتی نوێژەکەی تر دێت.

بەڵام ئەم فەرموودەیە بۆ دیاریکردنی کاتی نوێژ نییە، بەڵکو بۆ کەسێکە خەوی لێ بکەوێت و کاتی نوێژەکەی لە دەست دەربچێت، ئەو کاتە نوێژەکەی دەکات، مالك و تەحاوی و ئیبن حەزم لە عوروەی کوڕی زوبێرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: (كَتَبَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رضي الله عنه إِلَى أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ رضي الله عنه أَنْ: ... صَلِّ الْعِشَاءَ مَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ثُلُثِ اللَّيْلِ، فَإِنْ أَخَّرْتَ فَإِلَى شَطْرِ اللَّيْلِ، وَلاَ تَكُنْ مِنَ الْغَافِلِينَ).

واتە: عومەری کوڕی خەتاب رضي الله عنه بۆ ئەبوموسای ئەشعەری نوسی: نوێژی عیشا بکە لە نێوان سەرەتای کاتەکەی هەتاکو سێیەکی شەو، ئەگەر دوات خست هەتاکو نیوەی شەو دوای بخە، و لەو کەسانە مەبە کە لە بێئاگاکانن.

و ئەبوداود لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، لەو فەرموودەیە جبریل علیه السلام پێشنوێژی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کردووە، جاری دووەم گەڕاوەتەوە بۆ لای، دەفەرموێت: ((وَصَلَّى بيَ الْعِشَاءَ حِينَ غَابَ الشَّفَقُ... فَلَمَّا كَانَ الْغَدُ ... صَلَّى بِيَ الْعِشَاءَ إِلَى ثُلُث اللَّيْلِ... ثُمَّ الْتَفَتَ إِليَّ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، هَذَا وَقْتُ الْأَنْبِيَاءِ مِنْ قَبْلِكَ، وَالْوَقْتُ مَا بَيْنَ هَذَيْنِ الْوَقْتَيْنِ)).

واتە: نوێژی عیشای پێکردم کاتێك سوریی خۆر ئاوابوو لە ئاسمان... و سبەینێ نوێژی عیشای پێکردم دوای تێپەڕبوونی سێیەکی شەو... پاشان جبریل لای کردەوە بەلامدا و فەرمووی: ئەی محمد ئەمە کاتی نوێژی پێغەمبەرانی پێش تۆیە، و کاتی نوێژ لە نێوان ئەم دوو کاتەدایە.

(**وَأَوَّلُ وَقتِ الفَجرِ: إِذَا انشَقَّ الفَجرُ**) سەرەتای کاتی نوێژی بەیانی دەرکەوتنی سپێدەی ڕاستەقینەیە کە سپیاییەکی ئاسۆییە لە ڕۆژهەڵاتەوە دەردەکەوێت و ئەو کاتە کۆتایی شەوە، مسلم لە عبداللەی کوڕی عەمرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((وَقْتُ صَلَاةِ الصُّبْحِ مِنْ طُلُوعِ الْفَجْرِ مَا لَمْ تَطْلُعِ الشَّمْسُ)).

واتە: کاتی نوێژی بەیانی لە دەرکەوتنی سپێدەوەیە هەتاکو خۆر هەڵنەیەت.

و باشتروایە لە سەرەتای کاتەکەیدا نوێژ بکرێت، بوخاری و مسلم لە جابرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((وَالصُّبْحَ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّيهَا بِغَلَسٍ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی بە تاریکی دەکرد.

و مسلم لە ئەبوموسای ئەشعەرییەوە ڕیوایەتی کردووە: ((عَنِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، أَنَّهُ أَتَاهُ سَائِلٌ يَسْأَلُهُ عَنْ مَوَاقِيتِ الصَّلَاةِ؟ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ شَيْئًا، قَالَ: فَأَقَامَ الْفَجْرَ حِينَ انْشَقَّ الْفَجْرُ، وَالنَّاسُ لَا يَكَادُ يَعْرِفُ بَعْضُهُمْ بَعْضًا)).

واتە: کەسێك پرسیاری کاتەکانی نوێژی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد؟ هیچ وەڵامی نەدایەوە، دەڵێت: کاتێك سپێدە دەرچوو هەستا بۆ نوێژی بەیانی، ئەو کاتە خەریك بوو خەڵك یەکتر نەناسن.

و ئەو فەرموودەی کە ئەحمەد و ئەبوداود و ترمزی و ئیبن ماجە لە ڕافعی کوڕی خەدیجەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، و دەڵێت: ((أَسْفِرُوا بِالْفَجْرِ فَإِنَّهُ أَعْظَمُ لِلْأَجْرِ)).

واتە: نوێژی بەیانی بگەیەنن بەو کاتەی دونیا ڕوون دەبێتەوە، چونکە ئەوە پاداشتی زیاترە.

هەندێك لە زانایان دەڵێن: مەبەست ئەوەیە نوێژی بەیانی بە تاریکی دەست پێبکەن و درێژی بکەنەوە بە درێژکردنەوەی خوێندنی قورئان هەتاکو دونیا ڕوون دەبێتەوە.

و ئەبوداود لە ئەبومەسعودی ئەنصارییەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ صَلَّى صَلَاةَ الصُّبْحِ مَرَّةً بِغَلَسٍ، ثُمَّ صَلَّى مَرَّةً أُخْرَى فَأَسْفَرَ بِهَا، ثُمَّ كَانَتْ صَلَاتُهُ بَعْدَ ذَلِكَ التَّغْلِيسَ حَتَّى مَاتَ لَمْ يَعُدْ إِلَى أَنْ يُسْفِرَ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ جارێك نوێژی بەیانی بە تاریكی كرد، پاشان جارێك دونیا ڕووناك بوو نوێژی بەیانی كرد، پاشان دوای ئەوە نوێژی بەیانی بە تاریكی كرد هەتاكو وەفاتی كرد و نەگەڕایەوە سەرئەوەی نوێژ لە كاتی ڕووناكی ئاسۆدا بكات.

(**وَآخِرُهُ: طُلُوعُ الشَّمسِ**) بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان كردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَن أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الصُّبْحِ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ فَقَدْ أَدْرَكَ الصُّبْحَ)).

واتە: هەركەسێك بگات بە یەك ڕكات نوێژی بەیانیدا پێش ئەوەی خۆر هەڵبێت بێگومان گەیشتووە بە نوێژی بەیانیدا.

**وَمَنْ نَامَ عَن صَلَاتِهِ أَو سَهَا عَنهَا، فَوَقتُهَا حِيَنَ يَذكُرُهَا، وَمَنْ كَانَ مَعذُورًا وَأَدرَكَ مِن الصَّلَاةِ رَكعَةً؛ فَقَد أَدرَكَهَا.**

**وَالتَّوقِيتُ: وَاجِبٌ، وَالجَمعُ لِعُذرٍ جَائِزٌ؛ وَالمُتَيَمِّمُ وَنَاقِصُ الصَّلَاةِ، أَو الطَّهَارَةِ يُصَلُّونَ كَغَيرِهِم مِن غَيرِ تَأخِيرٍ؛ وَأَوقَاتُ الكَرَاهَةِ: بَعدَ الفَجرِ حَتَّى تَرتَفِعَ الشَّمسُ، وَعِندَ الزَّوَالِ، وَبَعدَ العَصرِ حَتَّى تَغرُبَ.**

**واتە: هەركەسێك خەوی لێبكەوێت یان نوێژەكەی لەبیری بچێت، كاتەكەی ئەو كاتەیە كە بیری دەكەوێتەوە، و هەركەسێك عوزری هەبێت بگات بە ڕكاتێك لە نوێژەكەی گەیشتووەتە نوێژەكەی و لە كاتی خۆیدا ئەنجامداوە.**

**و هاتنی كاتی نوێژ بۆ ئەنجامدانی واجبە، و كۆكردنەوەی نوێژ بۆ عوزرێك دروستە، و ئەو كەسەی تەیەمومی كردووە و ئەو كەسەی دەستنوێژی كەموكورتی هەیە و بە تەواوی نەیتوانیوە دەستنوێژ بگرێت یان خۆی بە تەواوی بشوات لە لەشگرانی، وەك ئەوانی تر نوێژ دەكەن و نوێژەكەیان دواناخەن، و ئەو كاتانەی مەكروهە نوێژیان تێدا بكرێت: دوای نوێژی بەیانییە هەتاكو خۆر بەرز دەبێتەوە، و كاتێك خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمانە، و دوای نوێژی عەسرە هەتاكو خۆر ئاوا دەبێت.**

**(وَمَنْ نَامَ عَن صَلَاتِهِ أَو سَهَا عَنهَا، فَوَقتُهَا حِيَنَ يَذكُرُهَا)** مسلم لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ نَسِيَ صَلاَةً أَوْ نَامَ عَنْهَا، فَكَفَّارَتُهَا أَنْ يُصَلِّيَهَا إِذَا ذَكَرَهَا)).

واتە: هەرکەسێك نوێژێکی لەبیرچوو یان خەوی لێکەوت، کەفارەتەکەی ئەوەیە نوێژەکەی بکات ئەگەر بیری کەوتەوە.

و بوخاری لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ نَسِيَ صَلاَةً، فَلْيُصَلِّ إِذَا ذَكَرَهَا، لاَ كَفَّارَةَ لَهَا إِلَّا ذَلِكَ: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ١٤﴾(طه)).

واتە: هەرکەسێك نوێژێکی لەبیرچوو، با نوێژەکەی بکات ئەگەر بیریکەوتەوە، هیچ کەفارەتێکی نییە جگە لەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: نوێژ بەوشێوەیە بکە کە فەرمانت پێکراوە بۆ ئەوەی یادی منی تێدا بکەیت.

**(وَمَنْ كَانَ مَعذُورًا وَأَدرَكَ مِن الصَّلَاةِ رَكعَةً؛ فَقَد أَدرَكَهَا)** بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الصَّلاَةِ فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلاَةَ)).

واتە: هەرکەسێك بگات بە ڕکاتێکی نوێژ بێگومان گەیشتووەتە ئەو نوێژە و لە کاتی خۆیدا ئەنجامیداوە.

ئەو ڕکاتەی لە فەرمودە باسکراوە زانایان ناکۆکن بەچی دەگوترێت، ئایا مەبەست قورئان خوێندن و ڕکوع و هەردوو سوژدەکەیە یان بگات بە ڕکوعدا ئەو ڕکاتەی بۆ ئەژمار دەکرێت، ئەبوداود لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتی کردووە و

ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِذَا جِئْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ وَنَحْنُ سُجُودٌ فَاسْجُدُوا وَلَا تَعُدُّوهُ شَيْئًا، وَمَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً فقد أدْرك الصَّلَاة))؛ وَفِي رِوَايَةٍ: ((وَمَنْ أدْرك الرُّكُوعَ فَقَدْ أَدْرَكَ الرَّكْعَةَ)).

واتە: ئەگەر هاتن بۆ نوێژ و ئێمە لە سوژدەدا بووین سوژدە ببەن و بەهیچی دامەنێن، و هەرکەسێك بگات بە ڕکاتێکدا بێگومان گەیشتووە بە نوێژدا؛ لە ڕیوایەتێکدا دەفەرموێت: و هەرکەسێك بگات بە ڕکوعدا بێگومان گەیشووەتە بە ڕکاتەکە.

(**مَعذُورًا**) پێویستە لەسەر موسڵمانی پیاوی عاقڵی باڵغ نوێژەکانی بە جەماعەت لە مزگەوتدا بکات، بەوەش دوور دەبێت لەوەی بکەوێتە ئەو کاتەی پێی دەگوترێت کاتی ناچاری، و زانایان لەم حاڵەتەدا باسی چەند کەسێکیان کردووە، لەوانە: کەسێك بێهۆش بێت و ئەو کاتە بەهۆش بێتەوە و خەوتوو و ئافرەت کەلە حەیز و نیفاس پاك ببێتەوە و منداڵ ئەگەر باڵغ بوو و کافر ئەگەر موسڵمان بوو و هاوشێوەی ئەمانە.

(**وَالتَّوقِيتُ: وَاجِبٌ**) مەرج و پێویستە نوێژ لەو کاتەدا بکرێت کەلە فەرمووده صەحیحەکاندا دیاریکراوە، نەپێش ئەو کاتانە و نەدوای ئەو کاتە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبًا مَّوۡقُوتًا ١٠٣﴾(النِّسَاء).

واتە: بێگومان نوێژ لەسەر باوەڕداران فەرزکراوە، و دەبێت لە کاتی دیاری کراودا بەجێی بهێنن.

مسلم لە ئەبوزەڕەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَضَرَبَ فَخذِي: كَيْفَ أَنْتَ إِذَا بَقِيتَ فِي قَوْمٍ يُؤَخِّرُونَ الصَّلَاةَ عَنْ وَقْتِها؟ قَالَ: مَا تَأْمُرُ؟ قَالَ: صَلِّ الصَّلَاةَ لِوَقْتِهَا، ثُمَّ اذْهَبْ لِحَاجَتِكَ، فَإِنْ أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ وَأَنْتَ فِي الْمَسْجِدِ فَصَلِّ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دای لە ڕانم و فەرمووی: حاڵت چۆنە ئەگەر تەمەنت درێژ بێت و بگەیتە کەسانێك نوێژ لە کاتی خۆیدا ناکەن و دوای دەخەن؟ گوتی: فەرمان بەچی دەکەیت؟ فەرمووی: نوێژ لە کاتی خۆیدا بکە، پاشان بڕۆ بۆ ڕاپەڕاندنی ئیشوکارت، ئەگەر نوێژ دابەسترا تۆ لە مزگەوتدا بوویت نوێژیان لەگەڵدا بکە.

و ئەبوداود لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە (حسن صحيح)ی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَمَّنِي جِبْرِيلُ عليه السلام عِنْدَ الْبَيْتِ مَرَّتَيْنِ، فَصَلَّى بِيَ الظُّهْرَ حِينَ زَالَتِ الشَّمْسُ وَكَانَتْ قَدْرَ الشِّرَاكِ، وَصَلَّى بِيَ الْعَصْرَ حِينَ كَانَ ظِلُّهُ مِثْلَهُ، وَصَلَّى بِيَ يَعْنِي الْمَغْرِبَ حِينَ أَفْطَرَ الصَّائِمُ، وَصَلَّى بِيَ الْعِشَاءَ حِينَ غَابَ الشَّفَقُ، وَصَلَّى بِيَ الْفَجْرَ حِينَ حَرُمَ الطَّعَامُ وَالشَّرَابُ عَلَى الصَّائِمِ، فَلَمَّا كَانَ الْغَدُ صَلَّى بِيَ الظُّهْرَ حِينَ كَانَ ظِلُّهُ مِثْلَهُ، وَصَلَّى بِي الْعَصْرَ حِينَ كَانَ ظِلُّهُ مِثْلَيْهِ، وَصَلَّى بِيَ الْمَغْرِبَ حِينَ أَفْطَرَ الصَّائِمُ، وَصَلَّى بِيَ الْعِشَاءَ إِلَى ثُلُثِ اللَّيْلِ، وَصَلَّى بِيَ الْفَجْرَ فَأَسْفَرَ، ثُمَّ الْتَفَتَ إِلَيَّ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، هَذَا وَقْتُ الْأَنْبِيَاءِ مِنْ قَبْلِكَ، وَالْوَقْتُ مَا بَيْنَ هَذَيْنِ الْوَقْتَيْنِ)).

واتە: جبریل ﷺ پێشنوێژی بۆ کردم لای کەعبە دووجار، نوێژی نیوەڕۆی پێکردم کاتێك خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایدا و سێبەرەکەی بە ئەندازەی قەیتانی پێڵاو بوو، و نوێژی عەسری پێکردم کاتێك سێبەری شت هێندەی خۆی بوو، و نوێژی مەغریبی پێکردم کاتێك خۆر ئاوابوو و ڕۆژووەوان ڕۆژووەکەی شکاند، و نوێژی عیشای پێکردم کاتێك سوریی ئاوابوونی خۆر ئاوابوو، و نوێژی بەیانی پێکردم کاتێك سپێدەی ڕاست دەرکەوت و خواردن و خواردنەوەی لەسەر ڕۆژووەوان حەرام بوو، بۆ سبەینێ نوێژی نیوەڕۆی پێکردم کاتێك سێبەری شت ئەوەندەی خۆی بوو، و نوێژی عەسری پێکردم کاتێك سێبەری شت دوو هێندەی خۆی بوو، و نوێژی مەغریبی پێکردم کاتێك خۆر ئاوابوو و ڕۆژووەوان ڕۆژووەکەی شکاند، و نوێژی عیشای بۆ کردم کاتێك سێیەکی شەو تێپەڕی، و نوێژی بەیانی پێکردم کاتێك دونیا ڕووناك بوو، پاشان لای کردەوە بەلامدا و فەرمووی: ئەی محمد، ئەمە کاتی نوێژی پێغەمبەرانی پێش تۆیە، و کاتێك لە نێوان ئەم دوو کاتەدایە.

(**وَالجَمعُ لِعُذرٍ جَائِزٌ**) زانایان چەند هۆکارێکیان باسکردووە بۆ کۆکردنەوەی نوێژەکان:

یەکەم: سەفەر: ئەگەر کەسێك سەفەر بکات دەتوانێت نوێژەکانی کۆ بکاتەوە، بە جۆرێك نوێژی عەسر پێش بخات و لەگەڵ نوێژی نیوەڕۆدا بیکات، و نوێژی عیشا پێش بخات لەگەڵ نوێژی مەغریبدا بیکات (جمع تقدیم) یان بە پێچەوانەوە (جمع تأخیر)، بوخاری و مسلم لە ئەنەسەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((كَانَ

النَّبِيُّ ﷺ إِذَا ارْتَحلَ قَبْلَ أَنْ تَزِيغَ الشَّمْسُ أَخَّرَ الظُّهْرَ إِلَى وَقْتِ العَصْرِ، ثُمَّ يَجْمَعُ بَيْنَهُمَا، وَإِذَا زَاغَتْ صَلَّى الظُّهْرَ ثُمَّ رَكِبَ))؛ قال الحافظ ابن حجر: وَفِي رِوَايَة الْحَاكِمِ فِي (الأَرْبَعِينَ) بِإِسْنَاد الصَّحِيح: ((صلَّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ، ثُمَّ رَكِبَ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر سەفەری بکردایە پێش ئەوەی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لابیدایە نوێژی نیوەڕۆی دوا دەخست بۆ کاتی عەسر، پاشان پێکەوە کۆی دەکردنەوە، و ئەگەر خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لابیدایە نوێژی نیوەڕی دەکرد پاشان سوار دەبوو و سەفەری دەکرد؛ و لە ڕیوایەتێکدا: نوێژی نیوەڕۆ و عەسری پێکەوە کۆ دەکردەوە، پاشان سوار دەبوو و سەفەری دەکرد.

و ئەحمەد و ئەبوداود و ترمزی لە موعازی کوڕی جەبەلەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ فِي غَزْوَة تَبُوكَ، إِذَا ارْتَحلَ قَبْلَ زَيْغِ الشَّمْسِ أَخَّرَ الظُّهْرَ إِلَى أَنْ يَجْمَعَهَا إِلَى الْعَصْرِ فَيُصَلِّيَهُمَا جَمِيعًا، وَإِذَا ارْتَحلَ بَعْدَ زَيْغِ الشَّمْسِ عَجَّلَ الْعَصْرَ إِلَى الظُّهْرِ وَصَلَّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا، ثُمَّ سَارَ، وَكَانَ إِذَا ارْتَحلَ قَبْلَ الْمَغْرِبِ أَخَّرَ الْمَغْرِبَ حَتَّى يُصَلِّيَهَا مَعَ الْعِشَاءِ، وَإِذَا ارْتَحلَ بَعْدَ الْمَغْرِبِ عَجَّلَ الْعِشَاءَ فَصَلَّاهَا مَعَ الْمَغْرِبِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە غەزای تەبووکدا، ئەگەر بەڕێ بکەوتایە پێش ئەوەی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لابیدایە نوێژی نیوەڕۆی دوا دەخست هەتاکو لەگەڵ عەسردا پێکەوە کۆی دەکردەوە و هەردوو نوێژەکەی پێکەوە دەکرد، و ئەگەر دوای لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان بەڕێ بکەوتایە نوێژی عەسری دەهێنا بۆ لای نوێژی نیوەڕۆ و هەردوو نوێژەکەی پێکەوە دەکرد، پاشان

سەفەرەکەی درێژە پێدەدا، و ئەگەر پێش مەغریب بەڕێ بکەوتایە نوێژی مەغریبی دوا دەخست هەتاکو لەگەڵ نوێژی عیشادا دەیکرد، و ئەگەر دوای مەغریب بەڕێ بکەوتایە عیشای پێش دەخست و لەگەڵ مەغریبدا دەیکرد.

دووەم: باران: باران یەکێکی ترە لەو عوزرانەی نوێژ بەهۆیەوە کۆ دەکرێتە، مالك لە نافعەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((كَانَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ ﭭ إِذَا جَمَعَ الْأُمَرَاءُ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ فِي الْمَطَرِ جَمَعَ مَعَهُمْ)).

واتە: عبداللەی کوڕی عومەر ﭭ ئەگەر ئەمیرەکانی کۆ بکردایەتەوە لە نێوان مەغریب و عیشا لە کاتێکدا باران بووایە نوێژی لەگەڵدا کۆ دەکردنەوە.

و مسلم لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((جَمَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِالْمَدِينَةِ، فِي غَيْرِ خَوْفٍ وَلَا مَطَرٍ))، فِي حَدِيثِ وَكِيعٍ قَالَ: (قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ: لِمَ فَعَلَ ذَلِكَ؟ قَالَ: كَيْ لَا يُحْرِجَ أُمَّتَهُ).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ و عەسر، و مەغریب و عیشای کۆ کردەوە، لە مەدینە نەترس بوو و نەباران بوو؛ وەکیع دەڵێت: بە ئیبن عەباسم گوت: بۆچی وایکرد؟ گوتی: بۆ ئەوەی ئوممەتەکەی ناڕەحەت نەبن.

هەندێك لە زانایان دەڵێن: پێویستە باران زۆر بێت و مرۆڤ تەڕبکات، بەڵام جێگیربووە کەلە بارانی کەمیشدا نوێژیان کۆ کردووەتەوە، ئەحمەد و ئیبن ماجە لە ئەبومەلیحی کوڕی ئوسامەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((خَرَجْتُ إِلَى الْمَسْجِدِ فِي لَيْلَةٍ مَطِيرَةٍ، فَلَمَّا رَجَعْتُ اسْتَفْتَحْتُ، فَقَالَ

أَبِي: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: أَبُو الْمَلِيحِ، قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ زَمَنَ الْحُدَيْبِيَة، وَأَصَابَتْنَا سَمَاءٌ لَمْ تَبُلَّ أَسَافِلَ نِعَالِنَا، فَنَادَى مُنَادِي رَسُولِ اللهِ ﷺ: أَنْ صَلُّوا فِي رِحَالِكُمْ)).

واتە: لە شەوێکی باراناویدا لە ماڵ دەرچووم بۆ مزگەوت، کاتێك گەڕامەوە لە دەرگامدا، باوکم گوتی: ئەمە کێیە؟ گوتیان: ئەبومەلیحە، گوتی: بێگومان ئێمە لە کاتی حودەیبیە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین، بارانێکی کەم باری ژێرەوەی پێڵاوەکانمانی تەڕ نەکرد، بانگدەرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ جاڕیدا گوتی: لە شوێنی مانەوەکانتان نوێژ بکەن.

هەروەها قوڕولیتە و سەرمای زۆریش کە موسڵمان نارەحەت بکات بچێت بۆ نوێژ، ئەبوداود لە نافعەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((كُنَّا مَعَ ابْنِ عُمَرَ بِضَجْنَانَ، فَأَقَامَ الصَّلَاةَ، ثُمَّ نَادَى: أَلَا صَلُّوا فِي الرِّحَالِ، كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَأْمُرُ مُنَادِيًا فِي اللَّيْلَةِ الْمَطِيرَةِ أَوِ الْبَارِدَةِ: أَلَا صَلُّوا فِي الرِّحَالِ)).

واتە: لە زەجنان لەگەڵ ئیبن عومەر بووین، بانگیدا بۆ نوێژ، پاشان گوتی: لە ماڵەکانتان نوێژ بکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەوی باران و سارددا فەرمانی بە بانگدەرەکەی دەکرد بڵێت: لە ماڵەکانتان نوێژ بکەن.

و بەیهەقی لە نوعەیمی کوڕی نەحامەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((نُودِيَ بِالصُّبْحِ فِي يَوْمٍ بَارِدٍ وَأَنَا فِي مِرْطِ امْرَأَتِي، فَقُلْتُ: لَيْتَ الْمُنَادِيَ قَالَ: مَنْ قَعَدَ فَلَا حَرَجَ عَلَيْهِ، فَنَادَى مُنَادِي النَّبِيِّ ﷺ فِي آخِرِ أَذَانِهِ: وَمَنْ قَعَدَ فَلَا حَرَجَ عَلَيْهِ)).

واتە: بانگدرا بۆ نوێژی بەیانی لە ڕۆژێکی سارددا، و من لە تویێی چارۆکەی هاوسەرەکەمدا بووم، گوتم: خۆزگە بانگدەرەکە بیگوتایە: هەرکەسێك دانیشێت و نەیەت بۆ نوێژ هیچی لەسەر نییە، بانگدەرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کۆتایی بانگەکەیدا گوتی: هەرکەسێك دانیشێت و نەیەت بۆ نوێژ هیچی لەسەر نییە.

سێیەم: ئیشوکارێك موسڵمان سەرقاڵ بکات و نەتوانێت نوێژەکانی لە کاتی خۆیدا بکات ئەگەر نەیکات بە عادەت و هەموو کاتێك نوێژەکانی لە کاتی خۆیدا نەکات دروستە بۆی، نەسائی لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الأَمْرُ الَّذِي يَخَافُ فَوْتَهُ، فَلْيُصَلِّ هَذِهِ الصَّلاَةَ - يَعْنِي الجَمْعَ بَيْنَ الصَّلاتَيْنِ -)).

واتە: ئەگەر کەسێك ئیشوکارێکی بۆ هاتە پێش ترسا نوێژەکەی بفەوتێت، با ئەم نوێژە بکات، واتە: دوو نوێژ پێکەوە کۆ بکاتەوە.

و نەسائی لە جابری کوڕی زەیدەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ صَلَّى بِالْبَصْرَةِ الْأُولَى وَالْعَصْرَ، لَيْسَ بَيْنَهُمَا شَيْءٌ، وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ، لَيْسَ بَيْنَهُمَا شَيْءٌ، فَعَلَ ذَلِكَ مِنْ شُغْلٍ، وَزَعَمَ ابْنُ عَبَّاسٍ أَنَّهُ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ بِالْمَدِينَةِ الْأُولَى وَالْعَصْرَ ثَمَانِ سَجَدَاتٍ، لَيْسَ بَيْنَهُمَا شَيْءٌ)).

واتە: ئیبن عەباس نوێژی نیوەڕۆ و نوێژی عەسری پێکەوە کۆ کردەوە و هیچ نوێژی لە نێوانیاندا نەکرد، و نوێژی مەغریب و نوێژی عیشای پێکەوە کۆکردەوە هیچ نوێژی لە نێوانیادا نەکرد، ئەوەی کرد لەبەر ئیشێك، و ئیبن عەباس باسی

ئەوەی کرد لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ و نوێژی عەسر لە مەدینە کردووە بە هەشت ڕکات، و هیچ نوێژی لە نێوانیاندا نەکردووە.

و مسلم لە عبداللەی کوڕی شەقیقەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((خَطَبَنَا ابْنُ عَبَّاسٍ يَوْمًا بَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى غَرَبَتِ الشَّمْسُ وَبَدَتِ النُّجُومُ، وَجَعَلَ النَّاسُ يَقُولُونَ: الصَّلَاةَ الصَّلَاةَ، قَالَ: فَجَاءَهُ رَجُلٌ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ لَا يَفْتُرُ وَلَا يَنْثَنِي: الصَّلَاةَ الصَّلَاةَ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَتُعَلِّمُنِي بِالسُّنَّةِ لَا أُمَّ لَكَ؟! ثُمَّ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ جَمَعَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ؛ قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ شَقِيقٍ: فَحَاكَ فِي صَدْرِي مِنْ ذَلِكَ شَيْءٌ، فَأَتَيْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ فَسَأَلْتُهُ فَصَدَّقَ مَقَالَتَهُ)).

دەڵێت: ئیبن عەباس ڕۆژێك دوای عەسر گوتاری بۆ خوێندینەوە هەتاکو خۆر ئاوابوو و ئەستێرەکان دەرکەوتن، و خەڵك دەیانگوت: نوێژ نوێژ، پیاوێك لە بەنوتەمیم هات بەردەوام قسەی دەکرد و هێور نەدەبوویەوە و دەیگوت: نوێژ نوێژ، ئیبن عەباس گوتی: ئایا فێری سوننەتم دەکەیت ئەی بێ دایك[1]؟! پاشان گوتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی نوێژی نیوەڕۆ و عەسر، و نوێژی مەغریب و عیشای کۆدەکردەوە، عبداللەی کوڕی شەقیق دەڵێت: شتێك لە دڵمدا دروست بوو لەوەی باسیکرد، ڕۆیشتم بۆ لای ئەبوهورەیرە و پرسیارم لێکرد، پشتگیری قسەکەی کرد و بە ڕاستی خستنەوە.

١. هەندێك دەڵێن: (لا أم لك) بۆ جنێو و قسەی نەشیاو بەکار نایەت بەڵکو بۆ بێدەنگ کردن یان پەسندان و ستایشکردن بەکاردێت. بڕوانە: (لسان العرب)(١٢/٣٠).

چوارەم: کەسی نەخۆش کە نەتوانێت نوێژەکانی لە کاتی خۆیدا بکات و بۆ هەموو نوێژەکانی دەستنوێژ بگرێت دەتوانێت نیوەڕۆ و عەسر، و مەغریب و عیشا کۆ بکاتەوە و پێکەوە نوێژەکانی بکات، لە کام کاتیان بۆی ئاسان بوو، بە بەڵگەی فەرموودەکەی ئیبن عەباس کە پێشتر باسکرا و باسی ئەوەی کرد پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژەکانی کۆ کردووەتەوە بۆ ئەوەی ئوممەتەکەی نارەحەت نەبن، و زانراوە نەخۆشی وا هەیە ناتوانێت نوێژەکانی لە کاتە دیاریکراوەکانیدا بکات، بۆیە دەتوانێت کۆیان بکاتەوە، ئەبوداود لە حەمنەی کچی جەحشەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، باسی ئەوە دەکات کە تووشی ئیستیحازەبووە ـ کە نەخۆشییەکە تووشی ئافرەتان دەبێت ـ ڕۆیشتووە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردووە دوو ڕێگای بۆ پێشنیارکردووە، لە دووەمیاندا دەفەرموێت: ((وَإِنْ قَوِيتِ عَلَى أَنْ تُؤَخِّرِي الظُّهْرَ وَتُعَجِّلِي الْعَصْرَ وتَغْتَسِلينَ، وَتَجْمَعِينَ بَيْنَ الصَّلاَتَيْنِ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، وَتُؤَخِّرِينَ الْمَغْرِبَ وَتُعَجِّلِينَ الْعِشَاءَ، ثُمَّ تَغْتَسِلِينَ وَتَجْمَعِينَ بَيْنَ الصَّلاَتَيْنِ فَافْعَلِي...)).

واتە: ئەگەر بتوانیت نوێژی نیوەڕۆ دوا بخەیت و نوێژی عەسر پێش بخەیت و خۆت بشۆیت، و ئەو دوو نوێژە پێکەوە کۆ بکەیتەوە، و نوێژی مەغریب دوا بخەیت و نوێژی عیشا پێش بخەیت پاشان خۆت بشۆیت و ئەو دوو نوێژە پێکەوە کۆبکەیتەوە وابکە.

ئەگەر کەسێك نوێژەکانی کۆ بکاتەوە (جمع تقديم أو جمع تأخير) نابێت ڕیزبەدی نوێژەکان تێکبدات، دەبێت نوێژی نیوەڕۆ پاشان نوێژی عەسر بکات،

هەروەها بۆ مەغریب و عیشاش، بۆ نموونە کەسێك لە سەفەر بگەڕێتەوە نوێژی مەغریب و عیشای کۆ کردبێتەوە و لە کاتی نوێژی عیشادا بچێت بۆ مزگەوت، پێویستە لەگەڵ جەماعەتدا نوێژی مەغریب بکات، پاشان ئەگەر فریاکەوت نوێژی عیشایان لەگەڵدا بکات و ڕیزبەندنی نوێژەکانی تێکنەدات.

(**وَالمُتَيَمِّمُ**) کەسێك تەیەمومکردنی بۆ حەڵاڵ بێت، لە سەرەتای کاتی نوێژدا نوێژەکەی دەکات، چونکە تەیەموم جێگرەوەی دەستنوێژە، بەڵام هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەگەر کەسێك لە سەرەتای کاتی نوێژدا ئاوی دەست نەکەوێت بەڵام دڵنیا بێت پێش کۆتای هاتنی کاتی نوێژەکە ئاوی دەست دەکەوێت باشترە نوێژ نەکات هەتاکو ئاوی دەست دەکەوێت و دەستنوێژ دەگرێت پاشان نوێژ بکات.

(**وَنَاقِصُ الصَّلَاةِ، أَو الطَّهَارَةِ يُصَلُّونَ كَغَيرِهِم مِن غَيرِ تَأخِيرٍ**) کەسێك کە ناتوانێت بەوشێوەیەی پێویستکراوە نوێژ بکات، یان لەبەر برین و نەخۆشییەك نەتوانێت دەستنوێژ بگرێت، یان لەبەر نەخۆشی یان نەبوونی ئاو، یان لەبەر ساردی نەتوانێت ئاو بەکاربهێنێت و خۆی لە لەشگرانی بشوات لە سەرەتای کاتەکەیدا وەك موسڵمانان نوێژ دەکەن و نوێژەکەیان دواناخەن، چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ ١٦﴾(التَّغَابُن).

واتە: پارێزکاربن و لە خوا بترسن بە گوێرەی تواناتان.

(**وَأَوقَاتُ الكَرَاهَةِ: بَعدَ الفَجرِ حَتَّى تَرتَفِعَ الشَّمسُ، وَعِندَ الزَّوَالِ، وَبَعدَ العَصرِ حَتَّى تَغرُبَ**) ئەم سێ کاتە نەهیکراوە نوێژیان تێدا بکرێت، مسلم لە

عوقبەی کوڕی عامری جەهەنییەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((ثَلَاثُ سَاعَاتٍ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَنْهَانَا أَنْ نُصَلِّيَ فِيهِنَّ، أَوْ أَنْ نَقْبُرَ فِيهِنَّ مَوْتَانَا: حِينَ تَطْلُعُ الشَّمْسُ بَازِغَةً حَتَّى تَرْتَفِعَ، وَحِينَ يَقُومُ قَائِمُ الظَّهِيرَةِ حَتَّى تَمِيلَ الشَّمْسُ، وَحِينَ تَضَيَّفُ الشَّمْسُ لِلْغُرُوبِ حَتَّى تَغْرُبَ)).

واتە: سێ کات پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی لێکردین نوێژیان تێدا بکەین، و مردووەکانمانی تێدا بنێژین: کاتێك خۆر هەڵدێت هەتاکو بەرز دەبێتەوە، و کاتێك خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمانە هەتاکو لار دەبێتەوە، و کاتێك خەریکە ئاوادەبێت هەتاکو بە تەواوی ئاوادەبێت.

و مسلم لە عەمری کوڕی عەبەسەی سولەمییەوە ڕیوایەتی کردووە هاتووە بۆ مەدینە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، دەڵێت: پێم گوت: ((أَخْبِرْنِي عَنِ الصَّلَاةِ، قَالَ: صَلِّ صَلَاةَ الصُّبْحِ، ثُمَّ أَقْصِرْ عَنِ الصَّلَاةِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ حَتَّى تَرْتَفِعَ فَإِنَّهَا تَطْلُعُ حِينَ تَطْلُعُ بَيْنَ قَرْنَيْ شَيْطَانٍ، وَحِينَئِذٍ يَسْجُدُ لَهَا الْكُفَّارُ، ثُمَّ صَلِّ فَإِنَّ الصَّلَاةَ مَشْهُودَةٌ مَحْضُورَةٌ حَتَّى يَسْتَقِلَّ الظِّلُّ بِالرُّمْحِ، ثُمَّ أَقْصِرْ عَنِ الصَّلَاةِ فَإِنَّ حِينَئِذٍ تُسْجَرُ جَهَنَّمُ، فَإِذَا أَقْبَلَ الْفَيْءُ فَصَلِّ فَإِنَّ الصَّلَاةَ مَشْهُودَةٌ مَحْضُورَةٌ حَتَّى تُصَلِّيَ الْعَصْرَ، ثُمَّ أَقْصِرْ عَنِ الصَّلَاةِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ فَإِنَّهَا تَغْرُبُ بَيْنَ قَرْنَيْ شَيْطَانٍ وَحِينَئِذٍ يَسْجُدُ لَهَا الْكُفَّارُ)).

واتە: باسی نوێژم بۆ بکە، فەرمووی: نوێژی بەیانی بکە، پاشان نوێژ مەکە هەتاکو خۆرهەڵدێت و بەرز دەبێتەوە، چونکە کاتێك هەڵدێت لە نێوان شاخەکانی شەیتانەوە هەڵدێت، و ئەو کاتە بێباوەڕان سوژدەی بۆ دەبەن، پاشان نوێژ بکە

چونكە ئەو كاتە فریشتە ئامادەی نوێژ دەبن و نزیكە لەوەی قەبوڵ بكرێت، هەتاكو كاتێك ڕم سێبەرێكی زۆر كەمی هەیە، پاشان دەست لە نوێژكردن هەڵبگرە چونكە ئەو كاتە دۆزەخ تاوەدرێت و هەڵدەگیرسێندرێت، ئەگەر سێبەر پەیدابوو نوێژ بكە چونكە ئەو كاتە فریشتە ئامادەی نوێژ دەبن و نزیكە لەوەی قەبوڵ بكرێت هەتاكو نوێژی عەسر دەكەیت، پاشان دەست لە نوێژكردن هەڵبگرە هەتاكو خۆرئاوا دەبێت، چونكە ئەو كاتەی ئاوا دەبێت لە نێوان دوو شاخی شەیتاندا ئاوادەبێت و ئەو كاتە بێباوەڕان سوژدەی بۆ دەبەن.

و لە هەندێك نوسخەدا بەم شێوەیە هاتووە: (**وَأَوْقَاتُ الْكَرَاهَةِ فِي غَيْرِ مَكَّةَ بَعْدَ الْفَجْرِ حَتَّى تَرْتَفِعَ الشَّمْسُ، وَعِنْدَ الزَّوَالِ فِي غَيْرِ يَوْمِ الْجُمُعَةِ وَبَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ**).

(**فِي غَيْرِ مَكَّةَ بَعْدَ**) مەبەست مزگەوتی كەعبەی پیرۆزە كە هیچ كاتێك نەهی نەكراوە نوێژی تەوافی تێدا بكرێت، ئەبوداود و ئیبن ماجە و جگە لەوانیش لە جوبەیری كوڕی موتعیمەوە ڕیوایەتی كردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ، لَا تَمْنَعُنَّ أَحَدًا طَافَ بِهَذَا الْبَيْتِ وَصَلَّى أَيَّ سَاعَةٍ شَاءَ مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ)).

واتە: ئەی بەنوعەبدی مەناف، ڕێگا لە كەس مەگرن تەوافی كەعبە بكات و هەركاتێك بیەوێت نوێژ بكات لە شەو یان لە ڕۆژدا.

(**فِي غَيْرِ يَوْمِ الْجُمُعَةِ**) ئەو كاتەی نەهیكراوە نوێژی تێدا بكرێت پێش نوێژی نیوەڕۆ ڕۆژی هەینی لێ هەڵاوێركراوە، بوخاری لە سەلمانی فارسییەوە ڕیوایەتی

کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَتَطَهَّرَ بِمَا اسْتَطَاعَ مِنْ طُهْرٍ، ثُمَّ ادَّهَنَ أَوْ مَسَّ مِنْ طِيبٍ، ثُمَّ رَاحَ فَلَمْ يُفَرِّقْ بَيْنَ اثْنَيْنِ، فَصَلَّى مَا كُتِبَ لَهُ، ثُمَّ إِذَا خَرَجَ الْإِمَامُ أَنْصَتَ، غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الْأُخْرَى)).

واتە: هەرکەسێك ڕۆژی هەینی خۆی بشوات، و چەند دەتوانێت خۆی پاکوخاوێن بکاتەوە، پاشان سەر و ڕیشی چەور بکات یان خۆی بۆنخۆش بکات، پاشان بچێت بۆ نوێژ و دوو کەس کە پێوە دانیشتبن لە یەکیان جیانەکاتەوە و لە نێوانیاندا دانەنیشێت، و نوێژ بکات ئەوەند بۆی نوسراوە، پاشان ئەگەر ئیمام هات بۆ گوتار خوێندن بێدەنگ بێت، خوا لە تاوانەکانی نێوان ئەم هەینییە و هەینی ئایندەی خۆش دەبێت.

زانایان ناکۆکن ئایا نەهی لە نوێژکردن لەو کاتانە گشتییە یان هەندێك کاتی لێ تایبەتکراوە، ئەوەی بۆچوونی ئەرجەحە ئەو گشتێتییەی هەندێك حاڵەتی لێ تایبەتکراوە، نوێژێك ئەگەر هۆکارێکی هەبێت وەك نوێژی (تحية المسجد) و کەسێك ئەگەر نوێژی فەرزی بیرچووبێت، یان تەنها بگات بە یەك ڕکاتدا پێش ئاوابوونی خۆر و پێش هەڵهاتنی خۆر، بوخاري و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((من أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الصُّبْحِ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ فَقَدْ أَدْرَكَ الصُّبْحَ، مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الْعَصْرِ قَبْلَ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ فَقَدْ أَدْرَكَ الْعَصْرَ)).

واتە: هەرکەسێك بگات بە یەك ڕكات نوێژی بەیانیدا پێش ئەوەی خۆر هەڵبێت بێگومان گەیشتووە بە نوێژی بەیانیدا، و هەرکەسێك بگات بە یەك ڕكات نوێژی عەسر پێش ئەوەی خۆرئاوا ببێت بێگومان گەیشتووە بە نوێژی عەسر و لە دەستی نەچووە.

و ئەم فەرموودەیەی کە مسلم لە عائیشەوە ڕیوایەتی کردووە پاڵپشتی ئەو بۆچوونە دەکات کە نوێژێك هۆکاری هەبێت یان نوێژ فەرز لەبەر هۆیەك دوا کەوتبێت یان لە بیرچووبێت، لە دوای نوێژی عەسر و دوای نوێژی بەیانییەوە دەکرێت، دەڵێت: ((لَمْ يَدَعْ رَسُولُ اللهِ ﷺ الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعَصْرِ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَا تَتَحَرَّوْا طُلُوعَ الشَّمْسِ وَلَا غُرُوبَهَا فَتُصَلُّوا عِنْدَ ذَلِكَ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز وازی لە دوو ڕکاتەکەی دوای نوێژی عەسر نەهێناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بە دوای ئەوەدا مەگەڕێن و هەوڵ مەدەن کاتی هەڵهاتنی خۆر و ئاوابوونی نوێژ بکەن.

مانای فەرموودەکە ئەوەیە کەسێك بە ئەنقەست نوێژەکانی بخاتە ئەو کاتانە، بەڵام ئەگەر ناچاربوو یان نوێژی لە بیرچووبوو یان لەو کاتەدا چووە مزگەوتەوە یان نوێژکردنەکەی هۆکارێکی هەبوو ئەو نەهییەی لە فەرموودەکاندا هاتووە نایگرێتەوە.

و هەندێك لە زانایان دەڵێن: نوێژی مردوو لە دوای نوێژی بەیانی و نوێژی عەسرەوە دەکرێت، بەڵام لەو سێ کاتدا نەهیکراوە کات خۆرهەڵدێت هەتا بەرز دەبێتەوە و کاتێك خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمانە و کاتێك خۆر خەریکە ئاوا دەبێت،

مسلم لە عوقبەی کوڕی عامرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((ثَلَاثُ سَاعَاتٍ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَنْهَانَا أَنْ نُصَلِّيَ فِيهِنَّ، أَوْ أَنْ نَقْبُرَ فِيهِنَّ مَوْتَانَا: حِينَ تَطْلُعُ الشَّمْسُ بَازِغَةً حَتَّى تَرْتَفِعَ، وَحِينَ يَقُومُ قَائِمُ الظَّهِيرَةِ حَتَّى تَمِيلَ الشَّمْسُ، وَحِينَ تَضَيَّفُ الشَّمْسُ لِلْغُرُوبِ حَتَّى تَغْرُبَ)).

واتە: سێ کات پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی لێکردین نوێژیان تێدا بکەین، و مردووەکانمانی تێدا بنێژین: کاتێك خۆر هەڵدێت هەتاکو بەرز دەبێتەوە، و کاتێك خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمانە هەتاکو لار دەبێتەوە، و کاتێك خەریکە ئاوادەبێت هەتاکو بە تەواوی ئاوادەبێت.

## بَابُ الأَذَانِ

**يُشرَعُ لِأَهلِ كُلِّ بَلَدٍ: أَن يَتَّخِذُوا مُؤَذِّنًا أَو أَكثَرَ، يُنَادِي بِأَلفَاظِ الأَذَانِ المَشرُوعَةِ، عِندَ دُخُولِ وَقتِ الصَّلَاةِ، وَيُشرَعُ لِكُلِّ سَامِعٍ لِلأَذَانِ: أَن يُتَابِعَ المُؤَذِّنَ، ثُمَّ تُشرَعُ الإِقَامَةُ عَلَى الصِّفَةِ الوَارِدَةِ.**

**بابەتی بانگدان**

**شەرعییە بۆ خەڵکی هەموو شارێك: کە بانگدەرێك یان زیاتر دابنێن، بانگ بدات بە وشە شەرعییەکانی بانگ، کاتێك کاتی هاتنی نوێژ دەست پێدەکات، و شەرعییە بۆ کەسێك کە بانگ دەبیستێت: ئەوەی بانگدەر دەڵێت بیڵێتەوە، پاشان شەرعییە قامەت بکرێت بەوشێوەیەی کە هاتووە.**

بانگ بریتییە لە ئاگاداکردنەوەی خەڵك بۆ ئەوەی ئاگاداربن کاتی نوێژە فەرزەکان هاتووە، و خۆیان ئامادە بکەن بۆ بەجێهێنانی، بە کۆمەڵە وشەیەك کەلە فەرموودە صەحیحەکاندا هاتووە.

(**يُشرَعُ**) ئەم وشەیە بۆ سوننەت و واجب بەکاردەهێنرێت، و ئەوەی ئەرجەحە حوکمی بانگ فەرزی کیفایەیە ئەگەر لە ناوچەیەك کەسێك بانگ بدات لەسەر موسڵمانانی تر دەکەوێت، و ئەگەر بانگ نەدرێت تاوانبار دەبن، بوخاری و مسلم لە ئەنەسی کوڕی مالکەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُغِيرُ إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ، وَكَانَ يَسْتَمِعُ الْأَذَانَ، فَإِنْ سَمِعَ أَذَانًا أَمْسَكَ، وَإِلَّا أَغَارَ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ هێرشی دەکرد دوای دەرکەوتنی سپێدە، و گوێی دەگرت بۆ بانگ، ئەگەر بانگێکی ببیستایە هێرشی نەدکرد و نەیدەدا بەسەریاندا، و ئەگەر بانگی نەبیستایە هێرشی دەکردە سەریان.

و بوخاری و مسلم لە مالكی كوڕی حوەیریسەوە ڕیوایەتیان كردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووین: ((إِذَا حَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَلْيُؤَذِّنْ لَكُمْ أَحَدُكُمْ، وَلْيَؤُمَّكُمْ أَكْبَرُكُمْ)).

واتە: ئەگەر كاتی نوێژ هات یەكێكتان بانگتان بۆ بدات، و كامتان لە تەمەندا گەورەتر پێشنوێژیتان بۆ بكات.

و بانگدان پاداشتێكی گەورە هەیە، بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان كردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي النِّدَاءِ وَالصَّفِّ الأَوَّلِ، ثُمَّ لَمْ يَجِدُوا إِلَّا أَنْ يَسْتَهِمُوا عَلَيْهِ لاَسْتَهَمُوا)).

واتە: ئەگەر خەڵك بیانزانیایە چەندە خێر لە بانگدان و ڕیزی یەكەمی نوێژدا هەیە، پاشان هیچ ڕێگایەكیان دەست نەكەوتایە بۆ ئەوەی بەدەستیان بهێنن بە تیروپشك نەبێت تیروپشكیان بۆ دەكردن.

و مسلم لە موعاوییەوە ڕیوایەتی كردووە دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((الْمُؤَذِّنُونَ أَطْوَلُ النَّاسِ أَعْنَاقًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ)).

واتە: بانگدەرەكان لە هەموو خەڵك گەردن و سەریان بەرزترە لە ڕۆژی قیامەتدا و لە هەمووان زیاتر بە تەمای فەزڵ و پاداشت و ڕەحمەتی خوان.

و ئەبوداود لە نەسائییەوە ڕیوایەتی كردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((الْمُؤَذِّنُ يُغْفَرُ لَهُ مَدَى صَوْتِهِ وَيَشْهَدُ لَهُ كُلُّ رَطْبٍ وَيَابِسٍ)).

واتە: بانگدەر هەتاکو مەودای دەنگەکەی خوای پەروەردگار لێی خۆش دەبێت ـ واتە: لێخۆشبوونێکی گەورە و فراوانی بۆ هەیە ـ و هەموو تەڕ و وشکێك کە دەنگی دەبیستن گەواهی بۆ دەدەن.

و ئیبن ماجە و حاکم و بەزار لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ أَذَّنَ اثْنَتَيْ عَشْرَةَ سَنَةً وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ، وَكُتِبَ لَهُ بِتَأْذِينِهِ فِي كُلِّ مَرَّةٍ سِتُّونَ حَسَنَةً، وَبِإِقَامَتِهِ ثَلَاثُونَ حَسَنَةً)).

واتە: هەرکەسێك دوازدە ساڵ بانگ بدات بەهەشتی بۆ واجب دەبێت، و بە هەموو بانگدانێکی شەشت چاکە، و بە هەموو قامەتکردنێکی سی چاکەی بۆ دەنوسرێت.

(**يُنَادِي بِأَلفَاظِ الأَذَانِ المَشرُوعَةِ**) وشەکانی بانگ دیاریکراوە و نابێت هیچ کەم و زیادێك تێدا بکرێت، ئەبوداود لە عبداللەی کوڕی زەیدەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((لَمَّا أَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِالنَّاقُوسِ يُعْمَلُ لِيُضْرَبَ بِهِ لِلنَّاسِ لِجَمْعِ الصَّلَاةِ، طَافَ بِي وَأَنَا نَائِمٌ رَجُلٌ يَحْمِلُ نَاقُوسًا فِي يَدِهِ، فَقُلْتُ: يَا عَبْدَ اللهِ أَتَبِيعُ النَّاقُوسَ؟ قَالَ: وَمَا تَصْنَعُ بِهِ؟ فَقُلْتُ: نَدْعُو بِهِ إِلَى الصَّلَاةِ، قَالَ: أَفَلَا أَدُلُّكَ عَلَى مَا هُوَ خَيْرٌ مِنْ ذَلِكَ؟ فَقُلْتُ لَهُ: بَلَى، قَالَ: فَقَالَ: تَقُولُ: اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ،

قَالَ: ثُمَّ اسْتَأْخَرَ عَنِّي غَيْرَ بَعِيد، ثُمَّ، قَالَ: وَتَقُولُ: إِذَا أَقَمْتَ الصَّلَاةَ، اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، فَلَمَّا أَصْبَحْتُ، أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَأَخْبَرْتُهُ، بِمَا رَأَيْتُ، فَقَالَ: إِنَّهَا لَرُؤْيَا حَقٌّ إِنْ شَاءَ اللهُ، فَقُمْ مَعَ بِلَالٍ فَأَلْقِ عَلَيْهِ مَا رَأَيْتَ، فَلْيُؤَذِّنْ بِهِ، فَإِنَّهُ أَنْدَى صَوْتًا مِنْكَ، فَقُمْتُ مَعَ بِلَالٍ، فَجَعَلْتُ أُلْقِيهِ عَلَيْهِ، وَيُؤَذِّنُ بِهِ، قَالَ: فَسَمِعَ ذَلِكَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، وَهُوَ فِي بَيْتِهِ فَخَرَجَ يَجُرُّ رِدَاءَهُ، وَيَقُولُ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ يَا رَسُولَ اللهِ، لَقَدْ رَأَيْتُ مِثْلَ مَا رَأَى، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: فَلِلَّهِ الْحَمْدُ)).

واتە: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد زەنگ دروست بکرێت بۆ ئەوەی لێی بدرێت خەڵك کۆببنەوە بۆ نوێژ، لە خەودا بینم پیاوێك بەلامدا تێپەڕی زەنگێکی بە دەستەوە بوو، گوتم: ئەی بەندەی خوا ئەو زەنگە دەفرۆشیت؟ گوتی: چی پێدەکەیت؟ گوتم: بانگەوازی خەڵکی پێدەکەین بۆ نوێژ، گوتی: ئایا ڕینمایت نەکەم بۆ شتێك لەوە خێرترە؟ گوتم: بەڵێ ئەو ڕێنماییەم بکە، گوتی: بڵێ: اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ؛ پاشان ڕۆیشت و زۆر لێم دوور نەکەوتەوە، گوتی: و کاتێك قامەتت کرد بۆ نوێژ دەڵێت: اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الفَلَاحِ، قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، اللهُ أَكْبَرُ اللهُ

أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ؛ کاتێك ڕۆژم لێبوویەوە ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو خەوەی بینیم بۆم گێڕایەوە، فەرمووی: ئەوە خەوێکی حەقە (إن شاء الله)، هەستە بەسەر بیلالیدا بخوێنەوە، بۆ ئەوەی بەوشێوەیە بانگ بدات، چونکە دەنگی لە تۆ بەرزترە، و گوتراوە: دەنگی لە تۆ خۆشترە، هەستام ڕۆیشتم بۆ لای بیلال و دەمخوێندمەوە بەسەریدا و ئەویش بەوشێوەیە بانگی دەدا، عومەری کوڕی خەتاب لە ماڵەوە دەنگی بیلالی بیست خێرا هات بەشی خوارەوەی پۆشاکەکەی بە دوای خۆیدا ڕادەکێشا، و دەیگوت: سوێند بەو کەسەی بە حەق ڕەوانەی کردی ئەی پێغەمبەری خوا منیش ئەو خەوەم بینی کە عبدالله بینویەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سوپاس بۆ خوا.

(**عِندَ دُخُولِ وَقتِ الصَّلَاةِ**) داخلبوونی کات مەرج بۆ دروستی نوێژ، لەو سۆنگەیەوە بانگدان بەرپرسیارێتییەکی زۆر گەورە، چونکە دوو پایە لە پایەکانی ئیسلام وابەستەیەتی کە ئەوانیش نوێژ و ڕۆژووگرتنە، بۆیە دەبێت بانگدەرەکان ڕەچاوی کاتە شەرعییەکان بکەن و لە کاتانەدا بانگ بدەن، ئەبوداود و ئیبن خوزەیمە لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((الإِمَامُ ضَامِنٌ وَالْمُؤَذِّنُ مُؤْتَمَنٌ، اللهُمَّ أَرْشِدِ الأَئِمَّةَ، وَاغْفِرْ لِلْمُؤَذِّنِينَ)).

واتە: پێشنوێژ دەستەبەر و بریکار نوێژ ئەو کەسانەیە لەگەڵیدا نوێژ دەکەن، و بانگدەر ئەمینە دەبێت پارێزگار لە کاتی بانگدا بکات لە کاتی خۆیدا بانگ بدات، پەروەردگارا پێشنوێژەکان ڕێنمای بکە، و لە بانگدەرەکان خۆش بە.

(**وَيُشرَعُ لِكُلِّ سَامِعٍ لِلأَذَانِ: أَن يُتَابِعَ المُؤَذِّنَ**) سوننەتە بۆ هەموو موسڵمانێك كە گوێ لە بانگدەر بێت بانگەكە لە دوايەوە بڵێتەوە، ئايا هەموو ئەوەی بانگدەر دەڵێت وەكو خۆی دەڵێتەوە، زانايان چەند بۆ چوونێكيان لەوبارەيەوە:

يەكەم: هەموو بانگەكە وەك بانگدەرەكە دەڵێتەوە، بوخاری و مسلم لە ئەبوسەعيدی خودرييەوە ڕيوايەتيان كردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِذَا سَمِعْتُمُ النِّدَاءَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ الْمُؤَذِّنُ)).

واتە: ئەگەر گوێتان لە بانگ بوو، ئەوەی بانگدەر دەيڵێت ئێوەش بيڵێن.

دووەم: هەموو بانگەكە وەك بانگدەر دەڵێتەوە جگە لە (حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ) لە بری ئەو ڕستانە دەڵێت: (لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللهِ)، مسلم لە عومەر كوڕی خەتابەوە ڕيوايەتی كردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِذَا قَالَ الْمُؤَذِّنُ: اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ، فَقَالَ أَحَدُكُمْ: اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ؛ ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ؛ ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، قَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ؛ ثُمَّ قَالَ: حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، قَالَ: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللهِ؛ ثُمَّ قَالَ: حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، قَالَ: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللهِ؛ ثُمَّ قَالَ: اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ، قَالَ: اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ؛ ثُمَّ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ؛ مِنْ قَلْبِهِ دَخَلَ الْجَنَّةَ)).

واتە: ئەگەر بانگدەر گوتی: اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ، يەكێك لە ئێوە بڵێت: اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ، پاشان گوتی: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، بڵێت: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ؛ پاشان گوتی: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، بڵێت: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ؛ پاشان گوتی:

حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، بلێت: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللهِ؛ پاشان گوتی: حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، بلێت: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللهِ؛ پاشان گوتی: اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ، بلێت: اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ؛ پاشان گوتی: لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، بلێت: لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ؛ لە دڵییەوە دەچێتە بەهەشتەوە.

سێیەم: هەموو بانگەکە وەك خۆی دەڵێتەوە و لە دوا ئەوەی دەڵێت: حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، دەڵێت: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللهِ؛ و کاتێك دەڵێت: حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، دەڵێت: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللهِ؛ وەك کۆکردنەوەی بەڵگەکان.

چوارەم: جارێك وەك بانگدەرەکە هەموو وشەکانی دەڵێتەوە، و جارێك لە بری حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، دەڵێت: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللهِ.

ئایا وەڵامدانەوە بانگ لەسەر ئەوانەی دەبیستن لەبەر ئەوەی فەرمانی پێکراوە؟، جمهوری زانایان دەڵێن: سوننەتە، مسلم لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((سَمِعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ رَجُلًا يَقُولُ: اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: عَلَى الْفِطْرَةِ، ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: خَرَجْتَ مِنَ النَّارِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە پیاوێك بوو بانگی دەدە، گوتی: (الله أکبر)، فەرمووی: لەسەر فیترەتە، پاشان گوتی: (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە ئاگر دەرچوو و ڕزگار بوو؛ واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی کردووە و وەڵامی بانگەکەی نەداوەتەوە.

و مالك له سەعلەبەی کوڕی ئەبومالکی قوڕەزییەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی لە (الثمر المستطاب)دا ئاماژەی بۆ کردووە، دەڵێت: (أَنَّهُمْ كَانُوا فِي زَمَانِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ يُصَلُّونَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ حَتَّى يَخْرُجَ عُمَرُ، فَإِذَا خَرَجَ عُمَرُ وَجَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ وَأَذَّنَ الْمُؤَذِّنُونَ، قَالَ ثَعْلَبَةُ: جَلَسْنَا نَتَحَدَّثُ، فَإِذَا سَكَتَ الْمُؤَذِّنُونَ، وَقَامَ عُمَرُ يَخْطُبُ أَنْصَتْنَا فَلَمْ يَتَكَلَّمْ مِنَّا).

واتە: لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتابدا لە ڕۆژی هەینی نوێژیان دەکرد هەتاکو عومەر دەهات بۆ مزگەوت، ئەگەر دابنیشتایە لەسەر مینبەر و بانگدەرەکان بانگیان بدایە، سەعلەبە دەڵێت: ئێمە قسەمان دەکرد، ئەگەر بانگدەرەکان بانگیان تەواو بکردایە، و عومەر هەستایە بۆ گوتار خوێندنەوە بێدەنگ دەبووین، و کەسمان قسەی نەدەکرد.

ئەم سەرەش بەڵگەی ئەوەی تێدایە هاوەڵان و تابعییەکان لە کاتی بانگدا قسەیان کردووە، ئەگەر واجبووایە قسەیان نەدەکرد.

(**ثُمَّ تُشرَعُ الإقَامَةُ عَلَى الصِّفَةِ الوَارِدَةِ**) لە فەرموودەکەی عبداللەی کوڕی زەیدەدا پێشتر باسکرا تێیدا هاتبوو: ((وَتَقُولُ: إِذَا أَقَمْتَ الصَّلَاةَ، اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ)).

و ڕستەکانی قامەت بە تاك دەخوێندرێت، جگە لە (قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ)، بوخاری و مسلم لە ئەنەسەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((أُمِرَ بِلَالٌ أَنْ يَشْفَعَ الْأَذَانَ، وَأَنْ يُوتِرَ الْإِقَامَةَ، إِلَّا الْإِقَامَةَ)).

واتە: فەرمانکرا بە بیلال ڕستەکانی بانگ بە جووت بخوێنێت، و قامەت بە تاك بخوێنێت، جگە لە (قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ).

چەند پرسێکی بە شێوەیەکی گشتی لەسەر بانگ و قامەت

یەکەم: سوننەتە بانگدەر دەستنوێژی هەبێت کاتێك بانگ دەدات، چونکە بانگدان زیکرە، بەڵام ئەگەر بەبێ دەستنوێژیش بانگ بدات تاوانی لەسەر نییە، بوخاری بە موعەلەقی و مسلم لە عائیشەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَذْكُرُ اللهَ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر هەموو حاڵێکی زیکری خوای دەکرد.

دووەم: بانگدان ڕووەو قیبلە: ئەحمەد ڕیوایەتی کە عبداللەی کوڕی زەید هاتووە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەلبانی لە (الثمر المستطاب)دا هێناویەتی، دەڵێت: ((يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي رَأَيْتُ فِيمَا يَرَى النَّائِمُ وَلَوْ قُلْتُ إِنِّي لَمْ أَكُنْ نَائِمًا لَصَدَقْتُ، إِنِّي بَيْنَا أَنَا بَيْنَ النَّائِمِ وَالْيَقْظَانِ إِذْ رَأَيْتُ شَخْصًا عَلَيْهِ ثَوْبَانِ أَخْضَرَانِ فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، فَقَالَ: اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ...)).

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا من خەوم بینی وەك ئەوەی کەسێکی خەوتوو خەو دەبینێت، و ئەگەر بڵێم نەخەوتبوو ڕاست دەڵێم، من لە نێوان خەو بە خەبەریدا بووم لە ناکاو کەسێکم بینی دوو پۆشاکی سەوزی لەبەردا بوو، ڕووی کردە قیبلە و گوتی: (اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ).

و ئیبن مونزر لە (الإجماع)(الأوسط في السنن والإجماع والاختلاف)(٣/٢٨)دا دەڵێت: (أَجْمَعَ أَهْلُ الْعِلْمِ عَلَى أَنَّ مِنَ السُّنَّةِ أَنْ تُسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ بِالْأَذَانِ).

واتە: زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی لە سوننەتە ڕوو بکەیتە قیبلە لە کاتی بانگداندا.

سێیەم: بەپێوە وەستان: هەندێك لە زانایان ئەو فەرموودەیەی کە بوخاری لە ئەبوقەتادەوە ڕیوایەتی کردووە کردوویانەتە بەڵگە لەسەر ئەو مەبەستە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بە بیلالی فەرمووە: ((يَا بِلَالُ قُمْ فَأَذِّنْ بِالنَّاسِ بِالصَّلَاةِ)).

واتە: ئەی بیلال هەستە بانگ بدە بۆ خەڵك بۆ ئەوەی نوێژ بکەن.

و ئیبن مونزر لە (الإجماع)(٤٧)دا دەڵێت: (أَجْمَعَ أَهْلُ الْعِلْمِ عَلَى: أَنَّ مِنَ السُّنَّةَ أَنْ يُؤَذِّنَ الْمُؤَذِّنُ قَائِمًا).

واتە: زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی سوننەتە بانگدەر بەپێوە بانگ بدات.

چوارەم: چوونە سەر شوێنی بەرز بۆ بانگدان: ئەبوداود لە عوروەی کوڕی زوبێرەوە لە ئافرەتێکی بەنونەجارەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ((كَانَ بَيْتِي مِنْ أَطْوَلِ بَيْتٍ حَوْلَ الْمَسْجِدِ وَكَانَ بِلَالٌ يُؤَذِّنُ عَلَيْهِ الْفَجْرَ)).

واتە: ماڵەکەی من بەرزترین ماڵ بوو لە دەوری مزگەوت، و بیلال دەهات بانگی بەیانی لەسەر دەدا.

و بوخاری و مسلم لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەمە لەفزی مسلمە، دەڵێت: ((كَانَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ مُؤَذِّنَانِ بِلَالٌ، وَابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ الْأَعْمَى، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ بِلَالًا يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ، فَكُلُوا وَاشْرَبُوا، حَتَّى يُؤَذِّنَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ؛ قَالَ: وَلَمْ يَكُنْ بَيْنَهُمَا إِلَّا أَنْ يَنْزِلَ هَذَا وَيَرْقَى هَذَا)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو بانگدەر هەبوو، بیلال و ئیبن ئوم مەکتومی نابینا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیلال بە شەو بانگ دەدات، بخۆن و بخۆنەوە هەتا ئیبن ئوم مەکتوم بانگ دەدات؛ دەڵێت: لە نێوانیاندا تەنها ئەوەندە بوو بیلال دادەبەزی و ئیبن ئوم مەکتوم سەردەکەوت.

و ئیبن ئەبوشەیبە لە عبداللەی کوڕی شەقیقەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: (مِنَ السُّنَّةِ الْأَذَانُ فِي الْمَنَارَةِ، وَالْإِقَامَةُ فِي الْمَسْجِدِ، وَكَانَ عَبْدُ اللهِ يَفْعَلُهُ).

واتە: لە سوننەتە بانگ لە مەنارە بدرێت، و قامەت لە مزگەوتدا بکرێت، و عبدالله بەوشێوەیەی دەکرد.

پێنجەم: سوننەتە دوو بانگدەر هەبن بۆ بانگدان بۆ پێش کاتی بەیانی و کاتی هاتنی بەیانی، بە بەڵگەی فەرموودەی ئیبن عومەر کە بوخاری و مسلم ڕیوایەتیان کردووە و باسی ئەوەی کرد پێغەمبەری خوا ﷺ دوو بانگدەری هەبوو، و بەیهەقی لە شافیعییەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: (وَأُحِبُّ أَنْ أَقْتَصِرَ فِي الْمُؤَذِّنِينَ عَلَى اثْنَيْنِ، لِأَنَّا إِنَّمَا حَفِظْنَا أَنَّهُ أَذَّنَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ اثْنَانِ، وَلَا يَضِيقُ أَنْ يُؤَذِّنَ أَكْثَرُ مِنِ اثْنَيْنِ).

واتە: پێم خۆشە تەنها دوو بانگدەر هەبن، چونکە ئەوەی دەیزانین دوو بانگدەر بانگیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ داوە، و ڕێگری ناکرێت ئەگەر زیاتر لە دوو بانگدەریش هەبن.

شەشەم: سوننەتە بانگدەر دەنگی خۆش بێت: لە فەرموودەکەی عبداللەی کوڕی زەیدا پێغەمبەری خوا ﷺ پێ فەرمووە: ((قُمْ مَعَ بِلَالٍ فَأَلْقِ عَلَيْهِ مَا رَأَيْتَ، فَلْيُؤَذِّنْ بِهِ، فَإِنَّهُ أَنْدَى صَوْتًا مِنْكَ)).

واتە: هەستە بەسەر بیلالیدا بخوێنەوە، بۆ ئەوەی بەوشێوەیە بانگ بدات، چونکە دەنگی لە تۆ بەرزترە، و گوتراوە: دەنگی لە تۆ خۆشترە.

و نەسائی و ئیبن خوزەیمە لە ئەبومەحزورەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، باس ئەوە دەکات لاسایی بانگی هاوەڵانی پێغەمبەری خوای ﷺ کردووەتە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((قَدْ سَمِعْتُ فِي هَؤُلَاءِ تَأْذِينَ إِنْسَانٍ حَسَنِ الصَّوْتِ ... ثُمَّ قَالَ: اذْهَبْ فَأَذِّنْ عِنْدَ الْبَيْتِ الْحَرَامِ)).

واتە: ئەوانەی بانگ دەدەن یەکێکیان دەنگی خۆشە ... پاشان فەرمووی: بڕۆ لای کەعبە بانگ بدە.

حەوتەم: بانگدان بە هێورییە و قامەتکردن خێراترە، ئەو فەرموودەیە ترمزی لە جابرەوە و دەڵێت: ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ لِبِلَالٍ: إِذَا أَذَّنْتَ فَتَرَسَّلْ، وَإِذَا أَقَمْتَ فَاحْدُرْ))، ترمزی بە زەعیفی داناوە، هەروەها ئیبن حەجەر و ئەلبانیش بە زەعفیبان داناوە، بەڵام ئیبن ئەبوشەیبە و بەیهەقی لە ئەبوزوبێری بانگدەری بیت المقدسەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((جَاءَنَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، فَقَالَ: إِذَا أَذَّنْتَ فَتَرَسَّلْ، وَإِذَا أَقَمْتَ فَاحْدُرْ)).

واتە: عومەری کوڕی خەتاب سەردانی کردین، گوتی: ئەگەر بانگتدا هێور و لەسەرخۆبە، و ئەگەر قامەتت کرد خێرا بکە.

هەشتەم: سوننەتە بانگدەر پەنجە بخاتە گوێیەوە کاتێك بانگ دەدات، و لە کاتی گوتی: (حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ) سەری بە لای ڕاست و چەپدا لار بکاتەوە، ئەحمەد و ترمزی لە ئەبوجوحەیفەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((رَأَيْتُ بِلَالًا يُؤَذِّنُ وَيَدُورُ وَيُتْبِعُ فَاهُ هَا هُنَا وَهَا هُنَا وَإِصْبَعَاهُ فِي أُذُنَيْهِ...)).

واتە: بیلالم بینی بانگیدەدا سەری بە لای ڕاست و چەپدا دەچەرخاند، و پەنجەی لە گوێدا بوو.

نۆیەم: سوننەتە لە کاتی باراندا یان سەرمای زۆردا بانگدەر لە بانگەیدا بڵێت: (أَلَا صَلُّوا فِي الرِّحَالِ)، (وَمَنْ قَعَدَ فَلَا حَرَجَ)، ئەبوداود لە نافعەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((كُنَّا مَعَ ابْنِ عُمَرَ بِضَجْنَانَ، فَأَقَامَ الصَّلَاةَ، ثُمَّ نَادَى: أَلَا صَلُّوا فِي الرِّحَالِ، كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَأْمُرُ مُنَادِيًا فِي اللَّيْلَةِ الْمَطِيرَةِ أَوِ الْبَارِدَةِ: أَلَا صَلُّوا فِي الرِّحَالِ)).

واتە: لە زەجنان لەگەڵ ئیبن عومەر بووین، بانگیدا بۆ نوێژ، پاشان گوتی: لە ماڵەکانتان نوێژ بکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەوی باران و سارددا فەرمانی بە بانگدەرەکەی دەکرد بڵێت: لە ماڵەکانتان نوێژ بکەن.

و بەیهەقی لە نوعەیمی کوڕی نەحامەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((نُودِيَ بِالصُّبْحِ فِي يَوْمٍ بَارِدٍ وَأَنَا فِي مِرْطِ امْرَأَتِي، فَقُلْتُ: لَيْتَ الْمُنَادِيَ قَالَ: مَنْ قَعَدَ فَلَا حَرَجَ عَلَيْهِ، فَنَادَى مُنَادِي النَّبِيِّ ﷺ فِي آخِرِ أَذَانِهِ: وَمَنْ قَعَدَ فَلَا حَرَجَ عَلَيْهِ)).

واتە: بانگدرا بۆ نوێژی بەیانی لە ڕۆژێکی سارددا، و من لە توێی چارۆکەی هاوسەرەکمدا بووم، گوتم: خۆزگە بانگدەرەکە بیگوتایە: هەرکەسێك دانیشێت و نەیەت بۆ نوێژ هیچی لەسەر نییە، بانگدەرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کۆتایی بانگەکەیدا گوتی: هەرکەسێك دانیشێت و نەیەت بۆ نوێژ هیچی لەسەر نییە.

دەیەم: سوننەتە لە پێش هاتنی کاتی نوێژی بەیانی بانگێك بدرێت و لەو بانگەدا بڵێت: (الصَّلاَةُ خَيرٌ مِنَ النَّوْمِ)، ئەبوداود و نەسائی لە ئەبومەحزورەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((كُنْتُ أُؤَذِّنُ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ، وَكُنْتُ أَقُولُ فِي أَذَانِ الْفَجْرِ الأَوَّلِ: حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، الصَّلاَةُ خَيرٌ مِنَ النَّوْمِ، الصَّلاَةُ خَيرٌ مِنَ النَّوْمِ، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)).

واتە: من بانگم دەدا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، و لە بانگی یەکەمی بەیانیدا دوای: (حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ) دەمگوت: (الصَّلاَةُ خَيرٌ مِنَ النَّوْمِ، الصَّلاَةُ خَيرٌ مِنَ النَّوْمِ، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ).

و ئەو بانگە بۆ ئەوەیە ئەوانەی خەتوون لە خەو هەستن، و ئەوانەی خەریکی شەونوێژن پشوو بدەن و خۆیان بۆ نوێژی بەیانی ئامادە بکەن، بوخاری و مسلم و نەسائی لە ئیبن مەسعودەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەمە لەفزی نەسائییە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِنَّ بِلاَلاً يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ لِيُوقِظَ نَائِمَكُمْ، وَلِيَرْجِعَ قَائِمَكُمْ)).

واتە: بیلال بە شەو بانگ دەدات، بۆ ئەوەی خەوتووەکانتان لە خەو هەڵبسێنێت، و ئەوانەتان شەونوێژ دەکەن پشوو بدەن و خۆیان بۆ نوێژی بەیانی ئامادە بکەن.

یازدەیەم: ئەگەر دوو نوێژ پێکەوە کۆ بکرێنەوە یەك بانگ و دوو قامەت دەخوێندرێت، مسلم ئەبوداود و ئیبن خوزەیمە لە جابرەوە ڕیوایەتیان کردووە باسی حەجی ماڵئاوای پێغەمبەری خوا دەکات و ئەمە لەفزی ئیبن خوزەیمەیە، دەڵێت: ((أَتَى النَّبِيِّ ﷺ الْمُزْدَلِفَةَ فَجَمَعَ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِأَذَانٍ وَاحِدٍ وَإِقَامَتَيْنِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ موزدەلیفە، نوێژی مەغریب و عیشا پێکەوە کۆکردەوە بە یەك بانگ و دوو قامەت.

دوازدەیەم: پێویستە کەسێك بانگ بدات بە جوانی وشەکانی بانگەکە دەرببڕێت و هەڵە دەریان نەبڕێت، و هەڵە دەربرین دوو جۆرە، یەکەم: هەڵەیەك مانانی ڕستەکە بگورێت نابێت ئەو کەسە بانگ بدات، و دووەم: هەڵەیەك مانای وشەکە نەگۆڕێت: دەبێت هەوڵی باشکردنی بدرێت، و پێویستە ئاواز و مەقامە مۆسیقییەکان لە تێکەڵ بەم سروتە ئاینییە گەورە نەکرێت، تەبەرانی لە (المعجم الكبير) لە یەحیای بەکائەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: (قَالَ رَجُلٌ لِابْنِ عُمَرَ: إِنِّي لَأُحِبُّكَ فِي اللهِ، فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: لَكِنِّي أَبْغَضُكَ فِي اللهِ، قَالَ: وَلِمَ؟ فَقَالَ: إِنَّكَ تَلْحَنُ[1] فِي أَذَانِكَ، وَتَأْخُذُ عَلَيْهِ أَجْرًا).

---

(١). لە (معجم الكبير)دا بە (تُنْقِي)هاتووە.

واتە: پیاوێك بە ئیبن عومەری گوت: لەبەر خوا خۆشم دەوێیت، ئیبن عومەر گوتی: بەڵام من لەبەر خوا ڕقم لە تۆیە، گوتی: بۆچی؟ گوتی: لەبەر ئەوەی بانگدان درێژ دەکەیتەوە، و لەسەر بانگدان کرێ وەردەگریت.

و عبدالرزاق لە زەحاکی کوڕی قەتادەو ڕیوایەتی کردووە: (أَنَّ رَجُلًا قَالَ: إِنِّي لَأُحِبُّكَ فِي اللهِ، قَالَ لَهُ: وَلَكِنِّي أُبْغِضُكَ فِي اللهِ، قَالَ: لِمَ؟ قَالَ: إِنَّكَ تَبْغِي فِي أَذَانِكَ، وَتَأْخُذُ الْأَجْرَ عَلَى كِتَابِ اللهِ).

سیازدەیەم: ئایا بانگدان و قامەتکردن بۆ نوێژێك لە دەست بچێت واجبە؟، ئەگەر کەسێك بۆ نموونە خەوی لێ بکەوێت هەتاکو کاتی شەرعی نوێژەکەی تەواو دەبێت فەرمانی پێکراوە بانگ بدات و قامەت بکات، هەروەها ئەگەر کەسێك نوێژێکی لە بیر بچێت ئەو کاتەی بیری کەوتەوە بانگ دەدات و قامەت دەکات، بوخاری و مسلم لە ئەبوقەتادەوە: ((أَنَّهُمْ كَانُوا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَنَامُوا حَتَّى طَلَعَتْ الشَّمْسُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: يَا بِلَالُ، قُمْ فَأَذِّنْ النَّاسَ بِالصَّلَاةِ)).

واتە: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ خەوتن هەتاکو خۆرهەڵهات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی بیلال هەستە بانگ بدە بۆ خەڵك.

و بوخاری و مسلم عیمرانی کوڕی حوصەینەوە ڕیوایەتیان کردووە، دەڵێت: ((فأمَرَ بِلَالًا فأذَّنَ، فصَلَّيْنَا ركْعَتَينِ، ثم أَمَرهُ فأقام فصلَّيْنَا)).

واتە: فەرمانی بە بیلال کرد بانگ بدات، دوو ڕکات نوێژمان کرد، پاشان فەرمانی پێکرد قامەتی کرد و نوێژمان کرد.

چواردەیەم: ئایا کەسێك ئامادەی نوێژی بە کۆمەڵ نەبێت لەبەر عوزرییەك، یان ئافرەت کە لە ماڵەوە نوێژ دەکات بانگ دەدات و قامەت دەکات، بوخاری لە ئەبوسەعیدەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویت: ((إِذَا كُنْتَ فِي غَنَمِكَ أَوْ بَادِيَتِكَ فَأَذَّنْتَ لِلصَّلَاةِ فَارْفَعْ صَوْتَكَ بِالنِّدَاءِ؛ فَإِنَّهُ لَا يَسْمَعُ مَدَى صَوْتِ الْمُؤَذِّنِ جِنٌّ وَلَا إِنْسٌ وَلَا شَيْءٌ إِلَّا شَهِدَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)).

واتە: لەگەڵ ئاژەکانتدا بوویت یان لە بیابان بوویت و بانگتدا بۆ نوێژکردن دەنگ بەرز بکەرەوە، چونکە مەودای دەنگی بانگدەر جن و مرۆڤ هیچ شتێك نییە بیبیستن ئیللا شاهیدی بۆ دەدەن لە ڕۆژی قیامەتدا.

و ئەبوداود لە ڕیفاعەی کوڕی ڕافعەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، باسی ئەو کەسە گێڕاوەتەوە کە نوێژ بە هەڵە کرد، دەڵێت: پێغەمبەری خوا بەو کەسەی فەرموو: ((فَتَوَضَّأْ كَمَا أَمَرَكَ اللَّهُ، ثُمَّ تَشَهَّدْ فَأَقِمْ، ثُمَّ كَبِّرْ...)).

واتە: دەستنوێژ بەوشێوەیە بگرە کە خوا فەرمانی پێکردوویت، پاشان بانگ بدە و قامەت بکە، پاشان (الله أكبر) بخوێنە.

پازدەیەم: نابێت هیچ زیادەیەك لە پێش و پاشی بانگەوە زیاد بکرێت، چونکە زانروە بانگدان پەرستشە و پێویستە بەوشێوەیە جێبەجێ بکرێت، ئەبوداود لە موجاهیدەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ((كُنْتُ مَعَ ابْنِ عُمَرَ فَثَوَّبَ رَجُلٌ فِي الظُّهْرِ أَوِ الْعَصْرِ، قَالَ: اخْرُجْ بِنَا فَإِنَّ هَذِهِ بِدْعَةٌ)).

واتە: لەگەڵ ئیبن عومەر بووم پیاوێك لە نوێژی نیوەڕۆ یان نوێژی عەسر گوت: (الصَّلاةُ خَيرٌ من النَّوْمِ)، ئیبن عومەر گوتی: با دەربچین لەم مزگەوتە ئەمە بیدعەیە.

هەروەها ئەو زیکرانەی لە نوێژی بەیانیدا لە هەندێك شوێن پێش بانگ دەخوێندرێت، یان لە دوای نوێژی عیشا لە شەوی جومعەدا، و صەڵەواتدا لەسەر پێغەمبەر خوا ﷺ لە دوای کۆتای هاتنی بانگ بە بڵندگۆ و دوعاکردن بۆ بیلالی حەبەشی، بیدعە لە هیچ فەرمووده و ئەسەرێکی صەحیحدا نەهاتوون.

شازدەیەم: بانگدان تایبەتمەندی نوێژە فەرزەکان و بۆ هیچ نوێژ و بۆنەیەکی تر بانگ نادرێت، بوخاری لە عەتاوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ئیبن عەباس و جابر دەڵێن: (لَمْ يَكُنْ يُؤَذَّنُ يَوْمَ الفِطْرِ وَلاَ يَوْمَ الأَضْحَى).

واتە: بانگ نەدەدرا بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان و نوێژی جەژنی قوربان.

حەڤدەیەم: سوننەتە دوای کۆتای هاتی بانگ ئەم زیکرانە بخوێندرێت، مسلم لە عبدالله کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە ڕیوایەتی کردووە لە پێغەمبەری خوای بیستووە دەیفەرموو: ((إِذَا سَمِعْتُمُ الْمُؤَذِّنَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ، ثُمَّ صَلُّوا عَلَيَّ؛ فَإِنَّهُ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلاَةً صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ بِهَا عَشْرًا، ثُمَّ سَلُوا اللهَ لِيَ الْوَسِيلَةَ؛ فَإِنَّهَا مَنْزِلَةٌ فِي الْجَنَّةِ لَا تَنْبَغِي إِلَّا لِعَبْدٍ مِنْ عِبَادِ اللهِ، وَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَنَا هُوَ، فَمَنْ سَأَلَ لِيَ الْوَسِيلَةَ حَلَّتْ لَهُ الشَّفَاعَةُ)).

واتە: ئەگەر بیستان بانگدەر بانگی دەدا ئەوەی دەیڵێت وەك ئەو بیڵێنەوە، پاشان صەڵەواتم لەسەر بدەن، چونکە هەرکەسێك صەڵەواتێکم لەسەر بدات خوا

دە صەڵەواتی لەسەر دەدات، پاشان داوای وەسیلەم بۆ بکەن، چونکە ئەوە پلەوپایەیەکە تەنها بۆ یەك بەندە لە بەندەکانی خوایە، و ئومێدەوارم من ئەو بەندەیەبم، هەرکەسێك داوای وەسیلەم بۆ بکات شەفاعەتی منی بۆ حەڵاڵ دەبێت.

و بوخاری لە جابرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ: اللهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ، حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ)).

واتە: هەرکەسێك کاتێك بانگی بیست بڵێت: ((اللهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ))، شەفاعەتی منی بۆ حەڵاڵ دەبێت لە ڕۆژی قیامەتدا.

ومسلم لە سەعدی کوڕی ئەبووەقاصەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا دەفەرموێت: ((مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ الْمُؤَذِّنَ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، رَضِيتُ بِاللهِ رَبًّا وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولًا وَبِالإِسْلَامِ دِينًا، غُفِرَ لَهُ ذَنْبُهُ)).

واتە: هەرکەسێك بیستی بانگدەر دەیگوت: (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ) بڵێت: (رَضِيتُ بِاللهِ رَبًّا وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولًا وَبِالإِسْلَامِ دِينًا)، خوا لە تاوانی ڕابردووی خۆش دەبێت.

هەژدەیەم: سوننەتە لە سەرەتای کاتدا بانگ بدرێت، و قامەتکردن دوا بخرێت، ئیبن ماجە لە جابری کوڕی سەمورەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ((كَانَ بِلَالٌ لَا يُؤَخِّرُ الْأَذَانَ عَنِ الْوَقْتِ، وَرُبَّمَا أَخَّرَ الْإِقَامَةَ شَيْئًا)).

واتە: بیلال بانگدانی دوای هاتنی کاتەکەی دوا نەدەخست، و لەوانەیە قامەتکردنی دوا بخستایە.

چواردەیەم: وەرنەگرتنی کرێ لەسەر بانگدان: ئەحمەد و ئەبوداود و نەسائی لە عوسمانی کوڕی ئەبوعاصەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووە: ((وَاتَّخِذْ مُؤَذِّنًا لا يَأْخُذُ عَلَى أَذَانِهِ أَجْرًا)).

واتە: بانگدەرێك هەڵبژێرە کرێ لەسەر بانگدانەکەی وەرنەگرێت.

پازدەیەم: ئایا بانگدەر قامەت دەکات، ئەو فەرموودەیە: ((مَنْ أَذَّنَ فَهُوَ يُقِيمُ)) کە خاوەن سوننەکان جگە لە نەسائی ڕیوایەتیان کردووە زانایان بە زەعیفیان داناوە، بەڵام ئەو فەرموودەیەی ئەبوداود لە جابری کوڕی سەمورەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((كَانَ بِلَالٌ يُؤَذِّنُ، ثُمَّ يُمْهِلُ فَإِذَا رَأَى النَّبِيَّ ﷺ قَدْ خَرَجَ أَقَامَ الصَّلَاةَ)).

واتە: بیلال بانگی دەدا، پاشان چاوەڕوانی دەکرد، ئەگەر پێغەمبەری خوای ﷺ ببینیایە قامەتی دەکرد بۆ نوێژ.

بەڵگەی ئەوەی تێدا کە خودی بیلال بانگیداوە و قامەتی کردووە و دەشێت بکرێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی بانگدەر قامەت دەکات.

نۆزدەیەم: پێشنوێژ ڕوخستەی بانگدەر دەدات قامەت بکات، ترمزی لە جابری کوڕی سەمورەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ((كَانَ مُؤَذِّنُ رَسُولِ اللهِ ﷺ يُمْهِلُ فَلَا يُقِيمُ، حَتَّى إِذَا رَأَى رَسُولَ اللهِ ﷺ قَدْ خَرَجَ أَقَامَ الصَّلَاةَ حِينَ يَرَاهُ)).

واتە: بانگدەرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ چاوەڕوانی دەکرد و قامەتی نەدەکرد، هەتا پێغەمبەری خوای ﷺ بینیایە لە ماڵ دەردەچوو قامەتی دەکرد بۆ نوێژکردن.

ترمزی دوای ڕیوایەتکردنی ئەم فەرموودەیە دەڵێت: (وَهَكَذَا قَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: إِنَّ المُؤَذِّنَ أَمْلَكُ بِالأَذَانِ، وَالإِمَامُ أَمْلَكُ بِالإِقَامَةِ).

واتە: هەندێك لە زانایان دەڵێن: بانگدان بە دەستی بانگدەرە، و قامەتکردن بە دەستی پێشنوێژە.

بیست: سوننەتە لە نێوان بانگ و قامەتکردندا دوعا بکرێت: ئەبوداود و ترمزی لە ئەنەسەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((لَا يُرَدُّ الدُّعَاءُ بَيْنَ الْأَذَانِ وَالْإِقَامَة)) وفي رواية ابن حبان وصححه الألباني: ((الدُّعَاءُ بَيْنَ الأَذَانِ وَالإِقَامَة يُسْتَجَابُ، فَادْعُوا)).

واتە: دوعاکردن لە نێوان بانگ و قامەتدا ڕەت ناکرێتەوە؛ و لە ڕیوایەتی ئیبن حباندا دەفەرموێت: دوعا لە نێوان بانگ و قامەتدا وەڵام دەدرێتەوە، بۆیە دوعا بکەن.

و ئەبوداود لە سەهلی کوڕی سەعدەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((ثِنْتَانِ لَا تُرَدَّانِ، أَوْ قَلَّمَا تُرَدَّانِ الدُّعَاءُ عِنْدَ النِّدَاءِ، وَعِنْدَ الْبَأْسِ حِينَ يُلْحِمُ بَعْضُهُمْ بَعْضًا)).

واتە: دوعا و نزا و پاڕانەوە ڕەت ناکرێنەوە یان زۆر کەم ڕەت دەکرێنەوە،کاتی بانگدان، و لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوە و شەڕی دەستەویەخە.

و ئەبوداود و نەسائی بە عبداللەی کوڕی عەمرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە (حسن صحیح)ی داناوە، دەڵێت: ((أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ الْمُؤَذِّنِينَ يَفْضُلُونَنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: قُلْ كَمَا يَقُولُونَ، فَإِذَا انْتَهَيْتَ فَسَلْ تُعْطَهْ)).

واتە: پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بانگدەرەکان فەزڵیان بەسەرمانەوە هەیە، پێغەمبەر خوا ﷺ فەرمووی: ئەوەی دەیڵێن وەك ئەوان بیڵێرەوە، ئەگەر تەواوبوویت داوا لە خوای پەروەردگار پێت دەبەخشێت.

بیست و یەك: ئایا نوێژکەران قامەت لە دوای بانگدەرەوەکەوە دەڵێنەوە؟ لەبەر ئەوەی قامەتکردن پێی دەگوترێت بانگ ئەوەی دیارە لە دوای بانگدەرەکەوە دەیڵێنەوە، بوخاری و مسلم لە عبداللەی کوڕی موغەفەلەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلاَةٌ)).

واتە: لە نێوان هەموو بانگ و قامەتێکدا دوو ڕکات نوێژی سوننەت هەیە؛ لەم فەرموودەیە پێغەمبەری خوا ﷺ قامەتی بە بانگ باسکردووە.

## بَابُ شُرُوطِ الصَّلَاةِ

**وَيَجِبُ عَلَى المُصَلِّي: تَطهِيرُ ثَوبِهِ وَبَدَنِهِ وَمَكَانِهِ مِن النَّجَاسَةِ، وَسترُ عَورَتِهِ، وَلَا يَشتَمِلُ الصَّمَّاءَ، وَلَا يَسدُلُ، وَلَا يُسبِلُ، وَلَا يَكفِتُ، وَلا يُصَلِّي: فِي ثَوبِ حَرِيرٍ، وَلَا ثَوبِ شُهرَةٍ، وَلا مَغصُوبٍ؛ وَعَلَيهِ استِقبَالُ عَينِ الكَعبَةِ - إِن كَانَ مُشَاهِدًا لَهَا أَو فِي حُكمِ المُشَاهِدِ-، وَغَيرُ المُشَاهِدِ يَستَقبِلُ الجِهَةَ بَعدَ التَّحَرِّي.**

## بابەتی مەرجەکانی نوێژ

**واجبە لەسەر نوێژکەر: پۆشاکەکەی و لەشی و ئەو شوێنەی نوێژ لەسەر دەکات پاك بکاتەوە، و عەورەتی دابپۆشێت، و پۆشاکێك لەبەر نەکات قۆڵی نەبێت دەستەکانی لێوە دەربکات و لە خۆی بئاڵێنێت و نەتوانێت نوێژی پێوە بکات، و ترسی ئەوەی هەبێت لە کاتی ڕکوع و سوژدەدا عەورەتی دەربکەوێت، و پۆشاکێك لەبەر نەکات لە سەرەوە بۆ خوارەوە شۆڕ بێتەوە و قۆڵی هەبێت و دەست بە قۆڵەکانییەوە نەکات، و پۆشاکێك لەبەر نەکات درێژ بێت و بچێتە خوار قولەپێکانی، و پۆشاکەکەی کۆنەکاتەوە بۆ سەرەوە هەڵینەکێشێت و قۆڵەکانی هەڵنەکات، و نوێژی ناکات لە پۆشاکی ئاوریشم، و پۆشاکی شوهرەت و ناوبانگ، و پۆشاکی داگیرکراودا؛ و پێویستە لەسەری ڕووبکاتە خودی کەعبە ئەگەر بیبینێت یان حوکمی ئەو کەسەی هەبێت کە کەعبە دەبینێت، و ئەو کەسەی نایبنێت ڕوودەکاتە ئەو ئاراستەیەی کەعبەی تێدایە دوای گەڕان.**

(**شروط**) کۆی (شرط)ە، لە دەرەوەی کردەوەکەیە، بە نەبوونی کردەوەکە دروستی نییە، بەڵام مەرج بە بوونی کردەوەکە ئەنجام بدرێت، وەك دەستنوێژ، ئەگەر کەسێك بەبێ دەستنوێژ نوێژ بکات نوێژەکەی بەتاڵە، بەڵام مەرج نییە ئەگەر دەستنوێژی گرت نوێژ بکات.

(**وَيَجِبُ عَلَى المُصَلِّي: تَطهِيرُ ثَوبِهِ**) واجبە ئەو پۆشاكەی نوێژی پێوە دەكرێت پاك بێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ۝٤﴾(المدثر).

واتە: دڵ و دەروونت و پۆشاكت پاك ڕابگرە.

ئیبن كەسیر دەڵێت: عیكرمە لە ئیبن عەباسەوە دەڵێت: كەسێك هات بۆ لای پرسیاری ئەم ئایەتەی لێكرد، لە وەڵامیدا گوتی: لەسەر تاوان و ناپاكی پۆشاك مەپۆشە، و لە ڕیوایەتێكی تردا دەڵێت: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ۝٤﴾ لە زمانی عەرەبدا مانای ئەوەیە پۆشاكەكانت پاك ڕابگرە، و لە ڕیوایەتێكی تردا: خۆت لە تاوان پاك ڕابگرە.

و ئیبن ماجە لە جابری كوڕی سەمورەوە ڕیوایەتی كردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((سَأَلَ رَجُلٌ النَّبِيَّ ﷺ، يُصَلِّي فِي الثَّوْبِ الَّذِي يَأْتِي فِيهِ أَهْلَهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، إِلَّا أَنْ يَرَى فِيهِ شَيْئًا فَيَغْسِلَهُ)).

واتە: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد، نوێژ بكات لەو پۆشاكەدا كە تێیدا لەگەڵ هاوسەرەكەی جووتبووە؟ فەرمووی: بەڵێ، مەگەر ئەوەی شتێك بە پۆشاكەكەیەوە ببینێت ئەو كاتە دەبێت بشۆات.

و ئەبوداود و نەسائی و ئیبن ماجە لە موعاوییەوە ڕیوایەتیان كردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((سَأَلْتُ أُخْتِي أُمَّ حَبِيبَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ: هَلْ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُصَلِّي فِي الثَّوْبِ الَّذِي يُجَامِعُهَا فِيهِ؟، قَالَتْ: نَعَمْ، إِذَا لَمْ يَرَ فِيهِ أَذًى)).

واتە: پرسیارم لە ئوم حەبیبەی خوشکم کە هاوسەری پێغەمبەری خوابوو ﷺ کرد: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ بەو پۆشاکەوە کە جووت دەبوو لەگەڵ هاوسەرەکانیدا نوێژی دەکرد؟، گوتی: بەڵێ، ئەگەر پیسییەکی پێوە نەبینیایە.

و بوخاری و مسلم لە ئەسمائی کچی ئەبوبەکرەوە ڕیوایەتیان کردووە باسی ئەوە دەکات ئافرەتێك هاتووە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردووە دەربارەی ئەو پۆشاکەی خوێنی حەیزی بەردەکەوێت چی بکات، پێی فەرموو: ((تَحُتُّه، ثُمَّ تَقْرُصُهُ بالماءِ))؛ لە ڕیوایەتی ترمزیدا کە ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، هاتووە: ((وَصَلِّي فِيهِ)).

واتە: دەیکرێنێت، پاشان ئاوی بەسەردا دەکات و پاکی دەکاتەوە، و نوێژی پێوە بکات.

بەڵام ئەگەر بە پۆشاکێکی پیسەوە نوێژ بکات و لە نێو نوێژەکەدا پێی بزانێت و بتوانێت دایبکەنێت دایدەکەنێت و لە نوێژەکەی بەردەوام دەبێت، و ئەگەر دوای نوێژەکەی پێی بزانێت نوێژەکەی صەحیحە و دووبارەی ناکاتەوە، یان نەزانێت کە بەو پۆشاکەوە نوێژ بکات دروست نییە، یان لە بیری چووبێت بە پۆشاکێکی پیسەوە نوێژ بکات دووبارەکردنەوەی لەسەر نییە، ئەبوداود لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە دەڵێت: ((بَيْنَما رَسُولُ اللهِ ﷺ يُصَلِّي بِأَصْحَابِهِ إِذْ خَلَعَ نَعْلَيْهِ فَوَضَعَهُمَا عَنْ يَسَارِهِ، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ الْقَوْمُ أَلْقَوْا نِعَالَهُمْ، فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللهِ ﷺ صَلاَتَهُ، قَالَ: مَا حَمَلَكُمْ عَلَى إِلْقَاءِ نِعَالِكُمْ، قَالُوا: رَأَيْنَاكَ أَلْقَيْتَ نَعْلَيْكَ فَأَلْقَيْنَا نِعَالَنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ جِبْرِيلَ

ﷺ أَتَانِي فَأَخْبَرَنِي أَنَّ فِيهِمَا قَذَرًا - أَوْ قَالَ: أَذًى - وَقَالَ: إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ إِلَى الْمَسْجِدِ فَلْيَنْظُرْ، فَإِنْ رَأَى فِي نَعْلَيْهِ قَذَرًا أَوْ أَذًى فَلْيَمْسَحْهُ وَلْيُصَلِّ فِيهِمَا)).

واتە: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد بە هاوەڵاکانی لەناکاو پێڵاوەکانی لەپێی داکەند و لای چەپی دانان، کاتێك هاوەڵانی ئەوەیان بینی پێڵاوەکانیان داکەند، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژەکەی تەواوکرد، فەرمووی: چی پاڵنەرتان بوو پێڵاوەکانتان دابکەن، گوتیان: بینمان پێڵاوەکانت داکەند ئێمەش پێلاوەکان داکەند، پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی جبریل هات بۆ لام پێی ڕاگەیاند کە پێڵاوەکانت پیسییان پێوەیە، و فەرمووی: ئەگەر کەسێکتان هات بۆ مزگەوت بابڕوانێت، ئەگەر بە پێلاوەکانییەوە پیسییەکی بینی با بە زەویدا بیخشێنێت و نوێژیان پێوە بکات.

(**وَبَدَنِهِ**) پاکی جەستەش پێویستە بۆ دروستی نوێژ، ئەحمەد و ئیبن ماجە لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((تَنَزَّهُوا مِنَ الْبَوْلِ فَإِنَّ أَكْثَرَ عَذَابِ الْقَبْرِ مِنَ الْبَوْلِ)).

واتە: دووربن و خۆتان پاك ڕابگرن لە میز، چونکە بێگومام زۆربەی سزای گۆڕ بە هۆی خۆ پاك ڕانەگرتنەوەیە لە میز.

شەوکانی دەڵێت: جمهور بۆچوونیان وایە پاکی پۆشاك و جەستە و شوێنی نوێژ واجبە بۆ نوێژ، و کۆمەڵێك بۆچوونیان وایە مەرجن بۆ دروستی نوێژ، و هەندێکی تر بۆچوونیان وایە سوننەتن، و ئەوەی حەقە واجبن، هەرکەسێك نوێژ بکات بە

پۆشاکێکەوە پیسی پێوە بێت بە ئەنقەست، کەمتەرخەم بووە لە بەجێهێنانی واجبێك و نوێژەکەی دروستە[1].

و ئیبن عبدالبر دەڵێت: (وَقَدْ أَجْمَعُوا أَنَّ مِنْ شَرْطِ الصلاة طهارة الثياب والماء وَالْبَدَنَ).

واتە: زانایان کۆدەنگن کە لە مەرجەکانی نوێژ پاکی پۆشاك و ئاو و جەستەیە[2].

(**وَمَكَانِهِ مِن النَّجَاسَةِ**) و ئەو شوێنەش کە نوێژی لەسەر دەکرێت پێویستە پاك بێت، بوخاری لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((قَامَ أَعْرَابِيٌّ فَبَالَ فِي الْمَسْجِدِ، فَتَنَاوَلَهُ النَّاسُ، فَقَالَ لَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ: دَعُوهُ وَهَرِيقُوا عَلَى بَوْلِهِ سَجْلاً مِنْ مَاءٍ، أَوْ ذَنُوبًا مِنْ مَاءٍ)).

واتە: پیاوێکی دەشت نشین هەستا میزی کردە مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ، خەڵك سەرزەنشتیان کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: لێیگەڕێن و دۆڵکەیەك ئاو بکەن بەسەر میزەکەیدا.

بەڵام ئەگەر پیسی شوێنەکە ڕاستەخۆ بەر مرۆڤ نەکەوێت کاتێك نوێژ دەکات نوێژکردن لەو شوێنە نوێژەکەی بە تاڵ ناکاتەوە، بۆ نموونە ئەگەر کەسێك لەسەر فەرشێك یان بەرماڵێك نوێژ بکات و گۆشەیەکی پیس بێت نوێژەکەی دروستە،

---

(١). (الدراري المضية)(٧٧/١).

(٢). (التمهيد)(٢٤٢/٢٢).

مسلم لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يُصَلِّي عَلَى حِمَارٍ وَهُوَ مُوَجِّهٌ إِلَى خَيْبَرَ)).

واتە: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لەسەر گوێدرێژێك نوێژ دەكرد، كاتێك بەرەو خەیبەر دەڕۆیشت.

ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەوەی تێدایە ئەگەر لە شوێنێكدا نوێژ بكات پیسی تێدا بێت، بەڵام ئەو پیسییە بەر لەشی نوێژكەرەكە نەكەوێت نوێژەكەی دروستە، چونكە گوێدرێژ بەدەر نابێت لە پیسی[1].

(وَسترُ عَورَتِهِ) داپۆشینی عەورەت مەرجە، ئەگەر كەسێك نوێژ بكات عەورەتی دانەپۆشێت نوێژەكەی دروست نییە، ئەمە بۆچوونی جمهوری زانایە، ئەحمەد و ئەبوداود و ترمزی و ئیبن ماجە لە عائیشەوە ڕیوایەتیان كردووە ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا دەفەرموێت: ((لَا يَقْبَلُ اللهُ صَلَاةَ حَائِضٍ إِلَّا بِخِمَارٍ)).

واتە: خوای پەروەردگار نوێژ هیچ ئافرەتێكی باڵغ قەبوڵ ناكات ئەگەر سەری دانەپۆشی بێت لە نوێژەكەیدا.

ئیبن عبدالبر دەڵێت: ئەو زانایانەی داپۆشینی عەورەت بە فەرزێك لە فەرزەكانی نوێژ دەزانن ئیجماع دەكەنە بەڵگە لەسەر پووچەڵی نوێژی ئەو كەسەی دەتوانێت پۆشاكەكەی لەبەر بكات بەڵام لەبەری نەكات و بەرووتی نوێژ بكات[2].

---

(١). بڕوانە: (فتح الباری)(٢/٥٧٧)، و(نيل الأوطار)(٢/١٤٦).

(٢). (الاستذكار)(٢/١٩٧).

عەورەتی پیاو لە نێوان ناوك و ئەژنۆیدایە، تەبەرانی لە (معجم الصغیر)دا لە عبداللەی کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبوتالیبەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَا بَيْنَ السُّرَّةِ وَالرُّكْبَةِ عَوْرَةٌ)).

واتە: نێوان ناوك و ئەژنۆ عەورەتە.

بەڵام پێویستە لە نوێژدا سەرشانەکانیشی داپۆشێت، بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((لَا يُصَلِّي أَحَدُكُمْ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ، لَيْسَ عَلَى عَاتِقَيْهِ مِنْهُ شَيْءٌ)).

واتە: کەسێك لە ئێوە نوێژ نەکات لە پۆشاکێکدا هیچ لەو پۆشاکە بەسەر شانەکانییەوە نەبێت.

بەڵام عەورەتی ئافرەت هەموو لەشییەتی جگە لە لەپی دەستەکان و ڕوخساری، ترمزی لە ئیبن مەسعودەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((الْمَرْأَةُ عَوْرَةٌ)).

واتە: ئافرەت عەوەرەتە.

و خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ ﴿٣١﴾﴾(النُّورِ).

واتە: جوانییان دەرنەخەن، ئەوە نەبێت بە ئاشکرا دیارە.

تەبەری دەڵێت: ﴿إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ﴾ ئەو بۆچوونەی لە هەموو بۆچوونەکان لە صەوابەوە نزیکترە قسەی ئەو کەسانەیە کە دەڵێن: مەبەست لە ڕوخسار و لەپی

دەستەکانە؛ و ئیبن کەسیر دەڵێت: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾ مانای ئەوەیە هیچ شتێك لە جوانییان بۆ کەسانی بێگانە دەرنەخەن، ئیللا ئەوە نەبێت ناشاردرێتەوە، و ئیبن مەسعود دەڵێت: وەك پۆشاك، و ئیبن عەباس دەڵێت: مەبەست ڕوخسار و لەپی دەستەکان و ئەنگوستیلەیە، هاوشێوەی ئەمە لە ئیبن عومەر و عیکرمە و سەعیدی کوڕی جوبەیر و ئەبوشەعسا و زەحاك و ئیبراهیمی نەخعی و جگە لە ئەوانیشەوە گێڕدراوەتەوە؛ و ئەبوداود لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ئەگەر ئافرەت باڵغبوو ناشێت هیچ شوێنێکی ببینرێت ئیللا ڕوخسار و لەپی دەستەکانی نەبێت.

(**وَلَا يَشتَمِلُ الصَّمَّاءَ**) زانایان چەند لێکدانەوەیەکیان بۆ کردووە، بەڵام ئەو لێکدانەوەی زۆریان جەختی لێدەکەنەوە ئەوەیە: پۆشاکێك لەبەر بکات هیچ دەرچەیەکی نەبێت دەستەکانی لێوە دەربکات و تەسك بێت و نەتوانێت بە ئاسانی نوێژەکەی بەجێ بهێنێت، و ترسی ئەوەی هەبێت لایەکی بەرز بکاتەوە عەورەتی دەربکەوێت، بوخاری و مسلم لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ: ((نَهَى عَنِ اشْتِمَالِ الصَّمَّاءِ)).

واتە: نەهیکردووە کەسێك پۆشاکێك لەبەر بکات دەرەچەی نەبێت و تەسك بێت و ترسی دەرکەوتنی عەورەتی هەبێت.

(**وَلَا يَسدُلُ**) بریتییە لە پۆشاکێك لە سەرەوە بۆ خوارەوە شۆڕ بێتەوە و قۆڵی هەبێت و دەست بە قۆڵەکانییەوە نەکات، و ترسی ئەوەی هەبێت بکەوێت و

عەورەتی دەربکەوێت، ئەبوداود لە ئەبوداودەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ((أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنِ السَّدْلِ فِي الصَّلَاةِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە پۆشاکێك لەبەر بکرێت هیچ دەرەچەیەکی نەبێت لەسەرەوە بۆ خوارەوە بێت، و ترسی دەرکەوتنی عەورەتی هەبێت.

(**وَلَا يُسبِلُ**) و پۆشاکێك لەبەر نەکرێت درێژ بێت و بچێتە خوار قولەپێکانی، بوخاری لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ مِنَ الْإِزَارِ فَفِي النَّارِ)).

واتە: ئەو پۆشاکەی دێتەخوار قولەپێکان لە ئاگردایە.

و مسلم لە ئەبوزەڕەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: الْمَنَّانُ الَّذِي لَا يُعْطِي شَيْئًا إِلَّا مَنَّهُ، وَالْمُنَفِّقُ سِلْعَتَهُ بِالْحَلِفِ الْفَاجِرِ، وَالْمُسْبِلُ إِزَارَهُ)).

واتە: سێ کەس خوای پەروەردگار قسەیان لەگەڵدا ناکات لە قیامەتدا: ئەو کەسەی منەت دەکات و هیچ شتێك نابەخشێت ئیللا منەت دەکات بەسەر ئەو کەسەدا کە پێی دەبەخشێت، و ئەو کەسەی برەو بە کاڵاکەی دەدات بە سوێندی درۆ، و ئەو کەسەی پۆشاکەکەی درێژە و دەچێتە خوار قولەپێکانی.

(**وَلَا يَكفِتُ**) کۆکردنەوەی پۆشاك و هەڵکێشانی بۆ سەرەوە و هەڵکردنی قۆڵەکان نەهی لێکراوە، بوخاری و مسلم لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ، عَلَى

الْجَبْهَةِ وَأَشَارَ بِيَدِهِ عَلَى أَنْفِهِ وَالْيَدَيْنِ، وَالرُّكْبَتَيْنِ، وَأَطْرَافِ الْقَدَمَيْنِ، وَلَا نَكْفِتَ الثِّيَابَ وَالشَّعَرَ)).

واتە: فەرمانم پێکراوە سوژدە لەسەر حەوت ئێسقان ببەم، لەسەر نێوچاوان و بە دەستی ئاماژەی کرد بۆ لوتی، و دەستەکان، و ئەژنۆکان، و کەناری پێکان، و پۆشاك کۆنەکەینەوە و هەڵی نەکەین و قۆڵەکانمان هەڵنەکەین، و قژ نەبەستین و کۆینەکەینەوە.

و مسلم لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە کە: ((أَنَّهُ رَأَى عَبْدَ اللهِ بْنَ الْحَارِثِ يُصَلِّي وَرَأْسُهُ مَعْقُوصٌ مِنْ وَرَائِهِ، فَقَامَ فَجَعَلَ يَحُلُّهُ، فَلَمَّا انْصَرَفَ أَقْبَلَ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، فَقَالَ: مَا لَكَ وَرَأْسِي؟ فَقَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّمَا مَثَلُ هَذَا مَثَلُ الَّذِي يُصَلِّي وَهُوَ مَكْتُوفٌ)).

واتە: عبداللەی کوڕی حارسی بینیوە نوێژی دەکرد و قژی لە پشتی سەرییەوە بەستبوو، هەستا قژی کردەوە، کاتێك نوێژەکەی تەواوکرد هات بۆ لای ئیبن عەباس، گوتی: ئەوە چیت دەوێت لە سەرم؟ گوتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: نموونەی ئەم کەسە وەك کەسێکە نوێژ بکات و دەستەکانی بەسترابێتەوە.

(**وَلا يُصَلِّي: فِي ثَوبِ حَرِيرٍ**) پۆشاکی ئاوریشم بۆ پیاوان حەرامە، لە نوێژ و دەرەوەی نوێژیش، ترمزی لە ئەبوموسای ئەشعەرییەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((حُرِّمَ لِبَاسُ الحَرِيرِ وَالذَّهَبِ عَلَى ذُكُورِ أُمَّتِي، وَأُحِلَّ لِإِنَاثِهِمْ)).

واتە: پۆشاکی ئاوریشم و زێڕ حەرامکراوە لەسەر نێرینەکانی ئوممەتەکەم، و حەڵاڵە بۆ مێیەنەکانیان.

بەڵام ئاوریشمی دەستکرد یان پۆشاکێك کەلە مادەی تر بێت و ئاوریشمی تێکەڵ بێت دروستە، ئەحمەد و ئەبوداود ە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داواوە، دەڵێت: ((إِنَّمَا نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنِ الثَّوْبِ الْمُصْمَتِ حَرِيرًا)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها نەهی لەو پۆشاکی ئاوریشمە کردووە کە هیچ پارچەیەکی تری تێکەڵ نەبێت و تەنها ئاوریشم بێت.

(**وَلَا ثَوبِ شُهرَةٍ**) پۆشاکی شوهرەت هەموو کاتێك نەهی لێکراوە، و بۆ نوێژ لە پێشتر، ئیبن ماجە لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ لَبِسَ ثَوْبَ شُهْرَةٍ فِي الدُّنْيَا، أَلْبَسَهُ اللهُ ثَوْبَ مَذَلَّةٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، ثُمَّ أَلْهَبَ فِيهِ نَارًا)).

واتە: هەرکەسێك پۆشاکی شوهرەت لە دونیا لەبەربکات خوای پەروەردگار پۆشاکی زەلیلی لەبەردەکات لە ڕۆژی قیامەتدا، پاشان ئاگری تێبەردەدات.

پۆشاکی شوهرەت بە هەموو پۆشاکێك دەگوترێت کە عادەتی خەڵکی ئەو ناوچەیە نەبێت بیپۆشن، یان گوتراوە: هەموو پۆشاکێکە زیادەڕۆی کرابێت لە نرخ و بەهاکەیدا و خاوەنەکە بۆ فیز و خۆبەگەورە زانین بیپۆشێت.

(**وَلا مَغصُوبٍ**) ئەگەر کەسێك بە پۆشاکێکی داگیرکراوەوە نوێژ بکات نوێژەکەی دروستە، هەروەها ئەگەر لەسەر زەوییەکی داگیرکراو نوێژ بکات،

بەڵام تاوانبار دەبێت، بوخاری و مسلم لە ئەبوبەکرە نەفیعی کوری حارسەوە ڕیوایەتیان کردووە باسی حەجی ماڵئاوای دەکات، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((إِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ وَأَعْرَاضَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ)).

واتە: بێگومان خوێنتان و سامانتان و کەسایەتیتان بۆ یەکتر حەرامە.

نەوەوی دەڵێت: نوێژکردن لەسەر زەوی داگیرکراو حەرامە بە ئیجماعی زانایان، و لای ئێمە و جمهوری فەقیهەکان و ئوصولییەکان نوێژەکەی دورستە، و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و جوبائی و جگە لەویش لە موعتەزیلە دەڵێن: نوێژەکەی باتڵە، بەڵام ئوصولییەکان ئیجماعی پێش ئەوان دەکەنە بەڵگە بەسەریانەوە[1].

(**وَعَلَيهِ استِقبَالُ عَينِ الكَعبَةِ إن كَانَ مُشَاهِدًا لَهَا**) واجبە موسڵمان لە کاتی نوێژکردندا ڕوو بکاتە قیبلە، کاتێك لە مزگەوتی حەرام نوێژ دەکات و کەعبە دەبینێت.

(**أَو فِي حُكمِ المُشَاهِدِ**) و کەسێك ئەگەر لە دەرەوەی مزگەوتی حەرام نوێژ بکات وەك کەسێك کەلە حەرەمی مەککەدا نوێژ بکات، و مزگەوتی حەرام ببینێت ڕوو دەکاتە مزگەوتی حەرام ئەگەر کەعبەش نەبینێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ١٤٤﴾(البقرة).

واتە: ڕوو بکە ئاراستەی مزگەوتی حەرام کە کەعبەی پیرۆزە.

(١). (المجموع)(٣/١٦٤).

و بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە باسی ئەو کەسە دەکات کە هاتووە و بە هەڵە نوێژی کردووە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووو: ((اسْتَقْبِلِ الْقِبْلَةَ فَكَبِّرْ)).

واتە: ڕوو بکە قیبلە و (الله أکبر) بخوێنە.

(**وَغَيرُ المُشَاهِدِ يَستَقبِلُ الجِهَةَ بَعدَ التَّحَرِّي**) هەموو موسڵمانانی دونیا کاتێك نوێژ دەکەن پێویستە ڕوو بکەن ئەو ئاراستەیەی کەعبەی تێدایە، خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ ﴿١٤٤﴾﴾(البقرة).

واتە: لە هەرشوێنێك بوون ڕوو بکەنە ئاراستەی کەعبە.

و ترمزی و ئیبن ماجە لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویێت: ((مَا بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ قِبْلَةٌ)).

واتە: نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا قیبلەیە.

پێویستە نوێژکەر بە دوای ئاراستەی کەعبەدا بگەڕێت، دوای ئەوە ئەگەر ئاراستەی کەعبەشی هەڵە کردبێت نوێژەکەی دروستە، دارەقوتنی و حاکم لە جابرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ((كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي مَسِيرٍ أَوْ سَفَرٍ فَأَصَابَنَا غَيْمٌ فَتَحَيَّرْنَا فَاخْتَلَفْنَا فِي الْقِبْلَةِ فَصَلَّى كُلُّ رَجُلٍ مِنَّا عَلَى حِدَةٍ وَجَعَلَ أَحَدُنَا يَخُطُّ بَيْنَ يَدَيْهِ لِنَعْلَمَ أَمْكِنَتَنَا، فَذَكَرْنَا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَلَمْ يَأْمُرْنَا بِالْإِعَادَةِ، وَقَالَ: قَدْ أَجْزَأَتْ صَلاَتُكُمْ)).

واتە: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین لە ڕێگایەکدا یان لە سەفەرێکدا، ئاسمان بوو هەور و ئاراستەی قیبلەمان لێ تێکچوو و ناکۆك بووین،

هەرکەسێکیان بۆ خۆی نوێژی کرد و هێڵێکی لە بەردەستی خۆیدا کێشا بۆ ئەوەی بزانین ڕووە قیبلە نوێژمان کردووە، ئەوەمان باسکرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێنەکردین نوێژەکەمان دووبارە بکەینەوە، و فەرمووی: نوێژەکەتان دروستە.

و هەندێك لە زانایان ئیجماعیان هێناوە لەسەر ئەوەی ڕووکردنە قیبلە مەرجە، نەوەوی دەڵێت: ڕووکردنە قیبلە مەرجە بۆ دروستی نوێژ، ئیللا لە دوو حاڵەتدا نەبێت[1]؛ ئەو دوو حاڵەتەش: حاڵی ترسی زۆر، و نوێژی سوننەتە لە سەفەردا.

ئەگەر موسڵمان لە فڕۆکە یان شەمەندەفەر یان پاپۆر یان ئۆتومبێلدا بێت و بترسێت ئەگەر دابەزێت نوێژ بکات یان بترسێت هەتاکو دەگاتە جێگای مەبەست کاتی نوێژەکەی لە دەست بچێت دەتوانێت ڕووی لە قیبلە نەبێت نوێژ بکات؟ لیژنەی هەمیشەی فەتوا دەڵێن: ئەگەر کەسێك سواری ئۆتۆمبێل یان شەمەندەفەر یان فرۆکە یان چوارپێیەك ببێت بترسێت لە نەفسی خۆی ئەگەر دابەزێت بۆ بەجێهێنانی نوێژی فەرز و بزانێت ئەگەر دوای بخات هەتاکو دەگاتە ئەو شوێنەی دەتوانێت نوێژی تێدا بکات کاتەکەی لە دەست بچێت، نوێژ دەکات بە گوێرەی توانای لەبەر ڕەهای ئەو فەرموودەیەی خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ﴾(البقرة).

واتە: خوا ئەرك ناخاتە سەر شانی هیچ کەس بەدەر لە توانای.

و ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ﴾(التغابن).

واتە: لە خوا بترسن بە گوێرەی تواناتان.

---

(١). (المجموع)(٣/١٨٩).

و ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖ﴾(الحج).

واتە: لە ئایندا داوای شتێکی لێ نەکردوون لە تواناتاندا نەبێت.

و ئەوەی نوێژ دەکات لەسەر ئەو شتانەی باسکرا ڕوویان لە هەرکوێ بوو بە بەردەوامی یان تەنها سەرەتای نوێژەکەی ڕوو دەکات قیبلە، ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ توانای، ئەگەر لە توانایدا بوو هەتا نوێژەکەی تەواو دەکات ڕووی لە قیبلە بێت و ئەوە واجبە لەسەری، چونکە ڕووکردنە قیبلە مەرجە بۆ دروستی نوێژی فەرز لە شوێنی نیشتەجێ بوون و لە سەفەریشدا[1].

بەشێوەیەکی گشتی پوختەی مەرجەکانی نوێژە کە زانایان باسیان کردوو و نوسەر هەندێکیانی باسکردووە بریتین لە:

یەکەم: ئیسلام: مەرجی هەموو پەرستشێکە و مەرجی نوێژەیشە و کەسێك موسڵمان نەبێت نوێژەکەی دروست نییە.

دووەم: عەقڵ و ژیری: عەقڵیش مەرجی قەبوڵبوونی هەموو پەرستشەکانە، و کەسێك ئەگەر عەقڵ و ژیری لە دەست دابێت قەڵەمی لەسەر هەڵگیراوە و نوێژی لەسەر پێویست نییە و ئەگەر نوێژیش بکات نوێژەکەی دروست نییە.

سێیەم: جیاکاری (التمييز): بۆ دروستی نوێژ تەمەنی جیاکاری پێویستە و زانایان باسی ئەوەیان کردووە لە تەمەنی حەوتساڵییەوە دەست پێدەکات، ئەبوداود لە عبداللەی کوڕی عەمرەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە (حسن

---

(١). (فتاوى اللجنة الدائمة - ١)(٨/١٢٣-١٢٤).

صحيح)ی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مُرُوا الصَّبِيَّ بِالصَّلَاةِ إِذَا بَلَغَ سَبْعَ سِنِينَ، وَإِذَا بَلَغَ عَشْرَ سِنِينَ فَاضْرِبُوهُ عَلَيْهَا)).

واتە: فەرمان بە منداڵ بکەن نوێژ بکات ئەگەر تەمەنی گەیشتە حەوت ساڵ، و ئەگەر تەمەنی گەیشتە دە ساڵ لەسەر نوێژ نەکردن لێ بدەن.

چوارەم: لەشگران نەبوون و هەبوونی دەستنوێژ: مسلم لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((لَا تُقْبَلُ صَلَاةٌ بِغَيْرِ طُهُورٍ)).

واتە: خوای پەروەردگار نوێژ قەبوڵ ناکات لە کەسێك لەشی گران بێت یان دەستنوێژی نەبێت.

پێنجەم: پاکی پۆشاك و شوێن و جەستە پێشتر بە درێژی باسکرا.

شەشەم: داپۆشینی عەورەت، کەسێك ئەگەر بتوانێت عەورەتی داپۆشێت و داینەپۆشێت نوێژەکەی دروست نییە.

حەوتەم: داخلبوونی کات: مەرجە بۆ دروستی نوێژ لەو کاتە دیاریکراوەدا بەجێ بهێنرێت کەلە شەرعدا دیاریکراوە.

هەشتەم: ڕووکردنە قیبلە بۆ نوێژ فەرز و سوننەتە مەرجە بەو درێژییەی باسکرا.

نۆیەم: نییەت: نییەت هێنانی ئەو نوێژەی کاتی هاتووە مەرجە بۆ دروستی نوێژەکە و دەبێت نییەتیش لە ئەنجامدانی تەنها گوێڕایەڵی و ڕەزامەندی خوای پەروەردگار بێت[١].

---

(١). ئەو مەرجانە لە (شروط الصلاة وأركانها وواجباتها)ی محمدی کوڕی عبدالوهابدا هاتووە.

## بَابُ كَيفِيَّةِ الصَّلاةِ

**لا تَكُونُ شَرعِيَّةٌ إلَّا بِالنِّيَّةِ، وَأَرْكَانُهَا كُلُّهَا مُفتَرَضَةٌ، إلّا قُعُودَ التَّشَهُّدِ الأَوسَطِ وَالاستِرَاحَةِ.**

## بابەتی چۆنییەتی نوێژ

**نوێژ شەرعی نییە بە نییەت نەبێت، و ئەرکانەکانی هەمووی فەرزە، جگە لە تەحیاتی ناوەڕاست و دانیشتنی پشوودان (جلسة الاستراحة).**

(**لا تَكُونُ شَرعِيَّةٌ إلَّا بِالنِّيَّةِ**) نییەت مەرج بۆ دروستی نوێژ و بە زمان زیکرکردنی بیدعە، و شوێنی دڵە، و گرنگە بۆ جیاکردنەوە عادەت لە پەرستن و پەرستنێك لە پەرستنێکی تر، بوخاری لە عومەرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ)).

واتە: پاداشت و قەبوڵبوونی کردەوەکان بە گوێرەی نییەتەکانییەتی؛ و هەموو کردەوەکان پێویستە بە دڵسۆزییەوە تەنها لەبەر خوای پەروەردگار ئەنجام بدرێت، و بە دووربێت لە ڕیایی و بەرچاوی.

(**وَأَرْكَانُهَا كُلُّهَا مُفتَرَضَةٌ**) هەموو ڕوکنەکانی نوێژ فەرزە، و جمهوری زانایان جیاوازی ناکەن لە نێوان واجب و فەرز و لە ئوصولدا بەوە پێناسەیان کردووە: بە ئەنجامدانی موسڵمان پاداشتی دەست دەکەوێت و بە ئەنجام نەدانی تووشی تاوان دەبێت، و (أركان) کۆی (ركن)ە، و بریتییە لەو فەرزەی کەلە نێو پەرستنەکەدایە، و بە ئەنجامنەدانی ڕوکنێك لە ڕوکنەکان نوێژ بە تاڵ دەبێتەوە، بۆ نموونە ئەگەر کەسێك لە ڕکاتێکدا ڕکوع نەبات نوێژەکەی دروست نییە و بە سوژدەی سەهویش قەرەبوو ناکرێتەوە، هەتاکو نەگەڕێتەوە ئەو ڕوکنە بەجێ نەهێنێت، و زانایان باسی ئەوەیان کردووە هەموو ئەو کردار و گوفتارانەی پێغەمبەری خوا

ﷺ فەرمانی بەو کەسە کردووە کە نوێژەکەی هەڵە کرد ڕوکنە، و ڕوکنەکانی نوێژ بریتین لە:

یەکەم: بەپێوە وەستان بۆ نوێژە فەرزەکان بۆ کەسێك کە بتوانێت، بوخاری لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((كَانَتْ بي بَوَاسِيرُ، فَسَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الصَّلاَةِ، فَقَالَ: صَلِّ قَائمًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَقَاعِدًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَعَلَى جَنْبٍ)).

واتە: مایەسیریم هەبوو، پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد چۆن نوێژ بکەم؟ فەرمووی: بەپێوە نوێژ بکە، ئەگەر نەتوانی بە دانیشتنەوە نوێژ بکە، ئەگەر نەتوانی لەسەرلا نوێژ بکە.

و بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بەو کەسەی نوێژی هەڵەکرد فەرمووی: ((إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلاَةِ فكَبِّرْ)).

واتە: ئەگەر هەستایت بۆ نوێژ الله أكبر بخوێنە.

دووەم: (الله أكبر)ی ئیحرام: بە (الله أكبر) هەموو کردار و گوفتارێکی دەرەوەی نوێژ قەدەغە دەبێت، و نوێژ دەست پێ دەکات، بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بەو کەسەی نوێژی هەڵەکرد فەرمووی: ((إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلاَةِ فَأَسْبِغْ الْوُضُوءَ، ثُمَّ اسْتَقْبِلِ الْقِبْلَةَ فَكَبِّرْ)).

واتە: ئەگەر هەستایت بۆ نوێژ بە جوانی دەستنوێژ بگرە، پاشان ڕوو بکەرە قیبلە و الله أكبر بخوێنە.

و ئەحمەد و خاوەن سونەنەکان جگە لە نەسائی لە عەلییەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە (حسن صحيح)ی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مِفْتَاحُ الصَّلَاةِ الطُّهُورُ، وَتَحْرِيمُهَا التَّكْبِيرُ، وَتَحْلِيلُهَا التَّسْلِيمُ)).

واتە: کلیلی نوێژ پاکییە لە لەشگرانی و بێ دەستنوێژی، و بە الله أکبر حەرام دەبێت، و سەلامدانەوە حەڵاڵ دەبێتەوە.

سێیەم: خوێندنی سورەتی الفاتحە: خوێندنی سورەتی الفاتحە بۆ هەموو ڕکاتێك فەرزە، بۆ هەموو کەسێك کە نوێژ دەکات ئیمام بێت یان نوێژ بکات لە دوای ئیمامەوە یان بە تەنها نوێژ بکات، و ئەو بۆچوونەی ئەرجە لە نوێژی بە کۆمەڵدا ئەو کەسەی لە دوای ئیمامەوە نوێژ دەکات لەو ڕکاتانەی ئیمام دەنگ بەرز دەکاتەوە سورەتی الفاتحە ناخوێنێت و گوێ لە ئیمام دەگرێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ۝٢٠٤﴾(الأعراف).

واتە: ئەگەر قورئان خوێندرایەوە گوێی بۆ بگرن و بێدەنگبن بەڵکو بەر بەزەیی خوا بکەون.

ئیبن ئەبوشەیبە و تەبەری و ئیبن ئەبوحاتەم و بەیهەقی لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: خەڵك لە نوێژدا قسەیان دەکرد ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ۝٢٠٤﴾؛ و تەبەری و بەیهەقی لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ﴿وَٱذْكُر رَّبَّكَ فِي نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً﴾ ئەمە دەربارەی نوێژە فەرزەکانە، هەرچی باس و خوێندنەوەی ترە

دوای ئەوە سوننەتە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی فەرزدا قورئانی دەخوێند، هاوەڵەکانی لە دوایەوە قورئانیان خوێند و لێی تێکچوو، ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ۝٢٠٤﴾ ئەمە دەربارەی نوێژی فەرزە؛ و ئیبن ئەبوحاتەم لە ئەبووائیلەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ئیبن مەسعود سەلامی کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد، وەڵامی نەدایەوە، (پێش ئەوە کەسێك لە نوێژدا قسەی دەکرد و باسی کار و فەرمانی خۆی دەکرد)، کاتێك نوێژەکەی تەواوکرد وەڵامیدایەوە و فەرمووی: خوای پەروەردگار چی بوێت ئەنجامی دەدات، خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ۝٢٠٤﴾؛ و تەبەرانی لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ۝٢٠٤﴾ واتە: لە جەژنەکان و جومعە و ئەو نوێژانەی ئیمام بە دەنگی بەرز قورئانی تێدا دەخوێنێت، گوێی لێ بگرن.

و بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بەو کەسەی نوێژی هەڵەکرد فەرمووی: ((ثُمَّ اقْرَأْ مَا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ)).

واتە: پاشان ئەوەندەی قورئان کە لەبەرتە و ئاسانە بۆت بیخوێنە؛ و ئەم پرسە زۆر جێی ناکۆکییە لای زانایان.

ئەو قورئانەی لەم فەرموودەیە بە ڕەهایی هاتووە وابەستەکراوە، بوخاری و مسلم لە عوبادەی کوڕی صامتەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ)).

واتە: نوێژ نییە بۆ کەسێك کە سورەتی الفاتحە نەخوێنێت.

و ئەوەی کەلە دوای ئیمامەوە لەو ڕکاتانەی بە دەنگی بەرز قورئان دەخوێنێت گۆی دەگرێت و قورئان ناخوێنێت، ئەحمەد و خاوەن سونەنەکان جگە لە ترمزی لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی و ئیمامی مسلم بە صەحیحیان داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إنَّما جُعِلَ الإمامُ لِيُؤتَمَّ به؛ فإذا كَبَّرَ فَكَبِّروا، وإذا قَرَأَ فأَنْصِتوا)).

واتە: ئیمام دانراوە بۆ ئەوەی چاوی لێ بکرێت، ئەگەر (الله أكبر)ی خوێند ئێوەش (الله أكبر) بخوێنن، و ئەگەر قورئانی خوێند بێدەنگبن و گوێی بۆ بگرن.

چوارەم و پێنجەم: ڕکوع و دڵنیابوون لە جووڵەکەوتنی ئەندامەکانی لەش لە ڕکوعدا: خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱرْكَعُوا۟ وَٱسْجُدُوا۟ وَٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمْ وَٱفْعَلُوا۟ ٱلْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ۩ ﴿٧٧﴾﴾(الحج).

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ڕکوع و سوژدە ببەن و پەروەردگارتان بپەرستن و کردەوەی چاك ئەنجام بدەن، بەڵکو سەرفرازبن.

و بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بەو کەسەی نوێژی هەڵەکرد فەرمووی: ((ثُمَّ ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعًا)).

واتە: پاشان ڕکوع ببە و لە ڕکوعدا بوەستە هەتاکو دڵنیا دەبێت هەموو ئەندامەکانی لەشت لە جووڵە کەتووە.

و ئیبن مونزر دەڵێت: (أجمَعوا على أنَّ القادِرَ لا تُجزِئُه الصَّلاةُ إلَّا أن يركَع ويسجد).

واتە: زانایان کۆدەنگن کەسێك بتوانێت ڕکوع و سوژدە نەبات نوێژەکەی دروست نییە[1].

شەشەم و حەوتەم: ڕاستبوونەوە لە ڕکوع و وەستان هەتاکو دڵنیابوون لە جووڵەکەوتنی ئەندامەکانی لەش: بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بەو کەسەی نوێژی هەڵەکرد فەرمووی: ((ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَسْتَوِيَ قَائِمًا)).

واتە: دوای ڕکوع ڕاستببەرەوە هەتاکو ڕێك ڕادەوەستیت و دڵنیا دەبێت هەموو ئەندامەکانی لەشت لە جووڵەکەتووە.

هەشتەم و نۆیەم: سوژدەبرن و دڵنیابوون لە جووڵە کەوتنی ئەندامەکانی لەش لە سوژدەدا: بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بەو کەسەی نوێژی هەڵەکرد فەرمووی: ((ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا)).

واتە: دوای ئەوەی لە ڕکوع ڕاست دەبیتەوە سوژدە ببە و لە سوژدەکەتدا بوەستە هەتاکو دڵنیا دەبیت هەموو ئەندامەکانی لەشت لە جووڵەکەوتووە.

---

(١). (الإجماع)(٤٢).

و پێویستە سوژدەبردن لەسەر حەوت ئێسقان بێت، بوخاری و مسلم لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ، عَلَى الْجَبْهَةِ وَأَشَارَ بِيَدِهِ عَلَى أَنْفِهِ وَالْيَدَيْنِ، وَالرُّكْبَتَيْنِ، وَأَطْرَافِ الْقَدَمَيْنِ)).

واتە: فەرمانم پێکراوە سوژدە لەسەر حەوت ئێسقان ببەم، لەسەر نێوچاوان و بە دەستی ئاماژەی کرد بۆ لوتی، و دەستەکان، و ئەژنۆکان، و کەناری پێکان.

دەیەم و یازدەیەم: ڕاستبوونەوە لە سوژدە و وەستان هەتاکو دڵنیابوون لە جووڵەکەوتنی هەموو ئەندامەکانی لەش و سوژدەی دووەم: بوخاری لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بەو کەسەی نوێژی هەڵەکرد فەرمووی: ((ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا، ثُمَّ افْعَلْ ذَلِكَ فِي صَلَاتِكَ كُلِّهَا))؛ وَقَالَ أَبُو أُسَامَةَ فِي الْأَخِيرِ: ((حَتَّى تَسْتَوِيَ قَائِمًا)).

واتە: دوای ئەوەی سوژدە دەبەیت سەرت بەرز بکەرەوە و بوەستە هەتاکو دڵنیا دەبێت کە هەموو ئەندامەکانی لەشت لە جووڵە کەوتووە، پاشان سوژدە ببە و بوەستە هەتاکو دڵنیا دەبیت هەموو ئەندامەکانی لەشت لە جووڵە کەوتوون، پاشان سەرت بەرز بکەرەوە و بوەستە هەتاکو دڵنیا دەبێت کە هەموو ئەندامەکانی لەشت لە جووڵە کەوتووە، پاشان بەوشێوەیە بکە لە هەموو نوێژەکەتدا؛ و لە ڕیوایەتێکدا لە بری جاری دووەمی: ((ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا))، پاشان دوای ئەوەی تەحیات خوێند هەستە هەتاکو ڕێك ڕادەوەستیت[1].

(١). بڕوانە: (شروط الصلاة وأركانها وواجباتها)ی محمدی کوڕی عبدالوهاب.

ئەلبانی دەڵێت: ((ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا)) لەم ڕیوایەتە لە جاری دووەمدا (شاذ)ە، ئەگەر صەحیح بووایە بەڵگە بوو لەسەر دانیشتنی پشوودان بەڵکو لەسەر وەستان و دڵنیابوون لە جووڵەکەوتنی هەموو ئەندامەکانی لەش، و کەس لە زانایان ئەو بۆچوونەیان نییە[1].

دوازدەیەم: تەحیاتی کۆتایی: زانایان ناکۆکن ئایا ڕوکنە یان واجبە، ڕوکنە لە مەزهەبی شافعی و حەنبەلی و کۆمەڵێك لە زانایین سەلەفە، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی نەسائی و دارەقوتنی و بەیهەقی لە ئیبن مەسعودەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((كُنَّا نَقُولُ فِي الصَّلَاة، قَبْلَ أَنْ يُفْرَضَ التَّشَهُّدُ: السَّلَامُ عَلَى اللهِ، السَّلَامُ عَلَى جِبْرِيلَ وَمِيكَائِيلَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَا تَقُولُوا هَكَذَا، فَإِنَّ اللهَ عزوجل هُوَ السَّلَامُ، وَلَكِنْ قُولُوا: التَّحِيَّاتُ لِلهِ، وَالصَّلَوَاتُ، وَالطَّيِّبَاتُ)).

واتە: ئێمە لە نوێژدا پێش ئەوەی ئەحیات فەرز بکرێت دەمانگوت: سەلام لەسەر خوا بێت، سەلام لەسەر جبریل و میکائیل بێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وامەڵێن، چونکە خوای پەروەردگار سەلامە، بەڵکو بڵێن: ((التَّحِيَّاتُ لِلهِ، وَالصَّلَوَاتُ، وَالطَّيِّبَاتُ)).

سیازدەیەم: سەلامدانەوە: جمهوری زانایان بۆچوونیان وایە یەکەم سەلامدانەوە ڕوکنە، ئەحمەد و خاوەن سونەنەکان جگە لە نەسائی لە عەلییەوە ڕیوایەتیان

---

(١). بڕوانە: (مختصر صحيح الإمام البخاري)(١٠٨/٤).

کردووە و ئەلبانی بە (حسن صحیح)ی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مِفْتَاحُ الصَّلَاةِ الطُّهُورُ، وَتَحْرِيمُهَا التَّكْبِيرُ، وَتَحْلِيلُهَا التَّسْلِيمُ)).

واتە: کلیلی نوێژ پاکییە لە لەشگرانی و بێ دەستنوێژی، و بە الله أکبر حەرام دەبێت، و سەلامدانەوە حەڵاڵ دەبێتەوە.

نەوەوی دەڵێت: مەزهەبی ئێمە ئەوەیە سەلامدانەوە قەرز و ڕوکنێکە لە روکنەکانی نوێژ و بەبێ سەلامدانەوە دروست نییە، و ئەوە بۆچوونی جمهوری زانایانە لە هاوەڵان و تابعییەکان و زانایانی دوای ئەوانیش[1].

و هەندێك لە زانایان هەردوو سەلامدانەوەکەی نوێژ بە ڕوکن دەزانن، بەڵام ئەحمەد لە زورارەی کوڕی ئەوفاوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((سُئِلَتْ عَائِشَةُ عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ بِاللَّيْلِ؟ فَقَالَتْ: كَانَ يُصَلِّي الْعِشَاءَ... ثُمَّ يُسَلِّمُ تَسْلِيمَةً وَاحِدَةً، السَّلَامُ عَلَيْكُمْ)).

واتە: پرسیار لە عائیشە کرا دەربارەی شەونوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ گوتی: نوێژی عیشای دەکرد... پاشان یەك سەلامی دەدایەوە، دەیفەرموو: السلام علیکم.

و ئیبن مونزر لە عەماری کوڕی ئەبوعەمارەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((كَانَ مَسْجِدُ الْأَنْصَارِ يُسَلِّمُونَ تَسْلِيمَتَيْنِ عَنْ أَيْمَانِهِمْ وَعَنْ شَمَائِلِهِمْ، وَكَانَ مَسْجِدُ الْمُهَاجِرِينَ يُسَلِّمُونَ تَسْلِيمَةً وَاحِدَةً)).

واتە: مزگەوتی ئەنصارییەکان دوو سەلامیان دەدایەوە بە لای ڕاست و بە لای چەپیاندا، و مزگەوتی کۆچەرییەکان یەك سەلامیان دەدایەوە.

---

(١). (المجموع)(٣/٤٨١).

و ئیبن مونز دەڵێت: هەموو ئەو زانایانەی زانستیان لێوەردەگیرێت بۆچوونیان وایە نوێژ ئەو کەسەی یەك سەلام دەداتەوە دروستە، و من پێم خۆشە دوو سەلام بدرێتەوە لەبەر ئەو بەڵگانەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕدراوەتەوە، و نوێژەکەی دروستە ئەگەر یەك سەلام بداتەوە[1].

چواردەیەم: بەدوای یەکدا ئەنجامدانی ئەو ڕوکنانە: چونکە لەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەو کەسە کرد کە نوێژی بە هەڵە کرد (ثُمَّ) هاتووە، بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە: ((أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ الْمَسْجِدَ؛ فَدَخَلَ رَجُلٌ فَصلَّى، ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى النَبِيِّ ﷺ، فَرَدَّ النَّبِيُّ ﷺ عَلَيْه السَّلاَمَ؛ فَقَالَ: ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ فَصلَّى، ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ؛ فَقَالَ: ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ ثَلاَثًا، فَقَالَ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أُحسِنُ غَيْرَهُ فَعَلِّمْنِي، قَالَ: إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلاَةِ فكَبِّرْ، ثُمَّ اقْرَأْ مَا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ، ثُمَّ ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَعْتَدِلَ قَائمًا، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا، ثُمَّ افْعَلْ ذَلِكَ فِي صَلاَتِكَ كُلِّهَا)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەژوورەوە بۆ مزگەوت، و پیاوێکیش هاتەژوورەوە نوێژی کرد، پاشان هات سەلامی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی سەلامەکەی دایەوە؛ و فەرمووی: بگەڕێرەوە نوێژ بکە، چونکە بێگومان تۆ نوێژت نەکردووە، پاشان هات سەلامی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد؛ فەرمووی: بگەڕێرەوە نوێژ بکە، چونکە بێگومان تۆ نوێژت

---

(١). (الأوسط في السنن والإجماع والاختلاف)(٢٢٣/٣).

نەکردووە، سێ جار وای پێ فەرموو، پیاوەکە گوتی: سوێند بەو کەسەی بە حەق ڕەوانەی کردوویت لەوە باشتر نازانم نوێژ بکەم فێرم بکە، فەرمووی: ئەگەر هەستایت بۆ نوێژ (الله أكبر) بکە، پاشان ئەوەندەی قورئان دەیزانیت بیخوێنە، پاشان ڕکوع ببە هەتاکو دڵنیا دەبێت و هەموو جەستەت لە جووڵە دەکەوێت، پاشان سەرت بەرز بکەرەوە هەتاکو ڕێك ڕادەوەستیت، پاشان سوژدە ببە هەتاکو دڵنیا دەبێت و هەموو جەستەت لە جووڵە دەکەوێت، پاشان سەرت بەرز بکەرەوە هەتاکو دڵنیا دەبێت هەموو لەشت بە دانیشتنەوە لە جووڵە کەتووە، پاشان سوژدە ببە هەتاکو دڵنیا دەبێت و هەموو جەستەت لە جووڵە دەکەوێت، پاشان لە هەموو نوێژەکەتدا بەوشێوەیە بکە.

و ئەو فەرموودانەی گێڕدراوەتەوە و باسی نوێژی پێغەمبەری خوایان ﷺ کردووە بەو ڕیزبەندییە باسی نوێژیان کردووە، و بوخاری لە مالکی کوڕی حوەریسەوە ڕیوایەتی کردووە کە لەگەڵ کۆمەڵە گەنجێکدا هاتوون بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەڕانەوەیاندا پێی فەرموون: ((صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي)).

واتە: بەوشێوەیە نوێژ بکەن کە منتان بینی نوێژم دەکرد.

(**إلّا قُعُودَ التَّشَهُّدِ الأَوسَطِ**) وەك دیارە نوسەر تەحیاتی ناوەڕاست بە سوننەت دەزانێ، بەڵام ئەوەی ئەرجە واجبە، ئەحمەد و نەسائی لە ئیبن مەسعودەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا محمد ﷺ دەفەرموێت: ((إِذَا قَعَدْتُمْ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ فَقُولُوا: التَّحِيَّاتُ لِلهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ السَّلَامُ...)).

واتە: ئەگەر لە هەموو ڕکاتێکدا دانیشتن تەحیات بخوێنن و بڵێن: التحيات لله...

و ئەبوداود لە ڕیفاعەی کوڕی ڕافعەوە لە باسی ئەو کەسەی کەلە نوێژەکەیدا هەڵەی کرد ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((فَإِذَا جَلَسْتَ فِي وَسَطِ الصَّلَاةِ فَاطْمَئِنَّ وَافْتَرِشْ فَخِذَكَ الْيُسْرَى ثُمَّ تَشَهَّدْ)).

واتە: ئەگەر لە ناوەڕاستی نوێژدا دانیشتیت ئۆقرە بکرە و ئارام بگرە و پێی چەپ و ڕانت ڕابخە پاشان تەحیات و شایەتمان بخوێنە.

(**وَالاستِراحَةِ**) پشووی دانیشتن کاتێك لە ڕکایەتی یەکەم و ڕکاتی سێیەم تەواو دەبێت و لە سوژدە سەر بەرز دەکاتەوە، سوننەتە، بوخاری لە مالك کوڕی حوەیریسەوە ڕیوایەتی کردووە: ((أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي، فَإِذَا كَانَ فِي وِتْرٍ مِنْ صَلَاتِهِ لَمْ يَنْهَضْ حَتَّى يَسْتَوِيَ قَاعِدًا)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بینی نوێژی دەکرد، ئەگەر لە ڕکاتی تاکی نوێژەکەیدا بووایە هەڵنەدەستا هەتاکو ڕێك دانەیشتایە.

و ئەبوداود و ترمزی لە ئەبوحەمیدی ساعدییەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، باسی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات، دەڵێت: ((ثُمَّ ثَنَى رِجْلَهُ وَقَعَدَ وَاعْتَدَلَ حَتَّى يَرْجِعَ كُلُّ عَظْمٍ فِي مَوْضِعِهِ، ثُمَّ نَهَضَ)).

واتە: پاشان پێی درێژکرد و دانیشت و ڕێکبوویەوە هەتاکو هەموو ئێسقانێك گەڕایەوە شوێنی خۆی، پاشان هەستا.

**(وَلا يَجِبُ مِن أَذكَارِهَا إلّا: التَّكبِيرُ، وَالفَاتِحَةُ فِي كُلِّ رَكعَةٍ وَلَو كَانَ مُؤتَمًّا، وَالتَّشهُّدُ الأَخِيرُ، وَالتَّسلِيمُ؛ وَمَا عَدَا ذَلِكَ فَسُنَنٌ، وَهِيَ: الرَّفعُ فِي المَوَاضِعِ الأَربَعَةِ، وَالضَّمُّ، وَالتَّوَجُّهُ بَعدَ التَّكبِيرَةِ، وَالتَّعَوُّذُ، وَالتَّأمِينُ، وَقِرَاءَةُ غَيرِ**

**الفَاتِحَةِ مَعَهَا، وَالتَّشَهُّدُ الأَوسَطُ، والاستِرَاحَةُ، وَالأَذكَارُ الوَارِدَةُ فِي كُلِّ رُكنٍ، والاستِكثَارُ مِن الدُّعَاءِ بِخَيْرَيِ الدُّنيَا وَالآخِرَةِ، بِمَا وَرَدَ وَبِمَا لَم يَرِد).**

**و هیچ لە زیکرەکانی واجب نییە جگە لە: (الله أكبر)ی داخلبوونی نوێژ، و خوێندنی سورەتی الفاتحە لە هەموو ڕکاتێکدا، ئەگەر لە پشتی ئیمامیشەوە نوێژ بکات، و تەحیاتی کۆتایی، و سلامدانەوە؛ و جگە لەوانە سوننەتن، کە بریتین لە: دەست بەرزکردنەوە لەو چوار شوێنە، و دەستگرتن، و خوێندنی دوعای دەستپێك، و پەناگرتن بە خوا لە شەیتان، و ئامینکردن دوای خوێندنی سورەتی الفاتحە، و خوێندی جگە لە سورەتی الفاتحە لەگەڵ سورەتی الفاتحە، و تەحیاتی ناوەڕاست، و دانیشتنی پشوودان، و ئەو زیکرانەی هاتووە لە هەموو ڕوکنێکدا، و زۆر دوعاکردن و داواکردنی خێری دونیا و قیامەت، بەو زیکرانەی لە فەرموودەکاندا هاتووە و ئەوەش نەهاتووە.**

زۆرجار کاتێك باسی نوێژ دەکرێت چوار زاراوە بەکاردەهێنێت، کە بریتین لە: (مەرج، رکن، واجب، سوننەت)، مەرج بریتییە لەوەی لە دەرەوەی کردەووەکەیە و بە نەبوونی کردەوەکە بە تاڵ دەبێتەوە، بۆ نموونە: دەستنوێژ مەرجی دروستی نوێژە، و ڕوکن لەگەڵ کردەوەکەدایە دیسان بە ئەنجامنەدانی کردەوەکە هەڵدەوەشێتەوە، بۆ نموونە: خوێندنی سورەتی الفاتحە و ڕکوع و سوژدە ڕوکنی نوێژن بە ئەنجامنەدانی هەر ڕوکنێك کردەوەکە بە تاڵ دەبێتەوە، و واجب فەرمانکراوە بە ئەنجامدانی و ئەنجامنەدانی کردەوەکە بەتاڵ نابێتەوە بەڵام ئەو کەسەی بە ئەنقەس واجبێك ئەنجام نادات تاوانبارە، و سوننەت بە ئەنجامدانی خاوەنەکەی پاداشتی دەست دەکەوێت و بە ئەنجامنەدانی تاوانبار نابێت.

(**وَلا يَجِبُ مِن أَذكَارِهَا إلّا: التَّكبِيرُ**) نوسەر لەم بڕگەیە باسی زیکرەکانی نوێژ دەکات و ئاماژە بۆ ئەوە دەکات تەنها چوار زیکر واجبە، پێشتر ئاماژەمان بۆ ئەوە

کرد کە (الله أکبر) ئیحرام ڕوکنێکە لە ڕوکنەکانی نوێژ، ئەگەر کەسێك ئەو (الله أکبر) نەخوێنێت نوێژەکەی دانامەزرێت و دروست نییە.

(**وَالفَاتِحَةُ فِي كُلِّ رَكعَةٍ وَلَو كَانَ مُؤتَمًّا**) دیسان لە ڕوکنەکانی نوێژدا ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد خوێندنی سورەتی الفاتحە لە هەموو ڕکاتێکی نوێژدا ڕوکنە، ئەگەر ئیمام بێت یان لە پشتی ئیمامەوە نوێژ بکات، و ئاماژەمان بۆ ئەو ناکۆکییەش کرد ئەو کەسەی نوێژ لە پشتی ئیمامەوە دەکات لەو نوێژانەی ئیمام دەنگی تێدا بەرزدەکاتەوە بۆ خوێندنی سورەتی الفاتحە چی دەکات.

(**وَالتَّشهُّدُ الأَخِيرُ**) دیسان پێشتر باسی ناکۆکی زانایانمان کرد ئایا تەحیاتی کۆتایی ڕوکنە یان واجبە، لە مەزهەبی شافعی و حەنبەلی و کۆمەڵێك لە زانایانی سەلەفدا بە ڕوکنی دەزانن.

(**وَالتَّسلِيمُ**) و سەلامدانەوەش زانایان ناکۆکن لە بارەی حوکمەکەیەوە، جمهوری زانایان یەك سەلامدانەوە بە ڕوکن دەزان و هەندێك لە زانایان هەردوو سەلامدانەکەوە و بە ڕوکن دەزانن، و هەندێکیان بە واجبی دەزانن.

(**وَمَا عَدَا ذَلِكَ فَسُنَنٌ، وَهِيَ: الرَّفعُ فِي المَوَاضِعِ الأَربَعَةِ**) نوسەر بۆچوونی وایە جگە لەوانەی باسیکرد سوننەتە، ئەو چوار شوێنەی باسیکردووە کە دەستی تێدا بەرزدەکرێتەوە لەو فەرموودەیەدا باسکراوە کە بوخاری و مسلم لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، إِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ، وَإِذَا كَبَّرَ لِلرُّكُوعِ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ رَفَعَهُمَا كَذَلِكَ أَيْضًا، وَقَالَ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ؛ وَكَانَ لَا يَفْعَلُ ذَلِكَ فِي السُّجُودِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستەکانی بەرز دەکردەوە هەتا ئاستی شانەکانی: ئەگەر دەستی بە نوێژ بکردایە، و ئەگەر (الله أكبر)ی بکردایە بۆ چوونە ڕكوع، و ئەگەر سەری بەرز بکردایەتەوە لە ڕکوع دیسان دەستی بەز دەکردەوە، و دەیفەرموو: ((سَمِعَ اللّٰهُ لِمَنْ حَمِدَه، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ))، و دەستی لە سوژدەدا بەرز نەدەکردەوە.

و بوخاری لە نافعەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((أَنَّ ابْنَ عُمَرَ كَانَ إِذَا دَخَلَ فِي الصَّلَاةِ كَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيْه، وَإِذَا رَكَعَ رَفَعَ يَدَيْه، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللّٰهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَفَعَ يَدَيْه، وَإِذَا قَامَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ رَفَعَ يَدَيْه، وَرَفَعَ ذَلِكَ ابْنُ عُمَرَ إِلَى نَبِيِّ اللّٰهِ ﷺ)).

واتە: ئیبن عومەر ئەگەر دەستی بە نوێژ بکردایە دەستی بەرز دەکردەوە، و بچووایە بۆ ڕکوع دەستی بەرز دەکردەوە، و ئەگەر بیگوتایە: ((سَمِعَ اللّٰهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)) دەستەکانی بەرز دەکردەوە، و ئەگەر لە دوو ڕکاتی نوێژ هەستایە دەستی بەرز دەکردەوە، و ئیبن عومەر ئەمەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕایەوە.

بەڵام جگە لەو شوێنانە هەندێك جار جێگیربووە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستەکانی بەرزکردووەتەوە، نەسائی لە مالکی کوڕی حوەیریسەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە: ((رَأَى النَّبِيَّ ﷺ رَفَعَ يَدَيْهِ فِي صَلَاتِه، وَإِذَا رَكَعَ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ، وَإِذَا سَجَدَ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ السُّجُودِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا فُرُوعَ أُذُنَيْهِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بینیوە دەستەکانی بەرزکردووەتەوە لە نوێژەکەیدا، ئەگەر بچووایەتە ڕکوع، و ئەگەر سەری لە ڕکوع بەرز بکردایەوە، و ئەگەر

سوژدەی ببردایە، و ئەگەر سەری لە سوژدە بەرز بکردایەتەوە، دەستەکانی بەرز دەکردەوە هەتاکو دەیگەیاندە ئاستی سەرەوەی گوێکانی.

نەسائی ئەم فەرموودەیە لە دوو بابەتدا هێناوە: (بَابُ رَفْعِ الْيَدَيْنِ لِلسُّجُودِ)، واتە: بابەتی دەست بەرزکردنەوە بۆ سوژدە؛ و: (بَابُ رَفْعِ الْيَدَيْنِ عِنْدَ الرَّفْعِ مِنَ السَّجْدَةِ الْأُولَى)، بابەتی بەرزکردنەوە دەستەکان کاتی سەر ڕاستکردنەوە لە سوژدەی یەکەم.

و دارەقوتنی لە وائلی کوڕی حوجرەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە: ((أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللهِ ﷺ يَرْفَعُ يَدَيْهِ حِينَ يَفْتَتِحُ الصَّلَاةَ وَإِذَا رَكَعَ وَإِذَا سَجَدَ)).

واتە: پێغەمبەری خوای ﷺ بینیوە دەستەکانی بەرزدەکردەوە کاتێك دەستی بە نوێژ دەکرد، و ئەگەر ڕکوعی ببردایە، و ئەگەر سوژدەی ببردایە.

و ئەحمەد و ئیبن ئەبوشەیبە و دارمی لە وائلی کوڕی حوجرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە: ((أَنَّهُ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَكَانَ يُكَبِّرُ إِذَا خَفَضَ، وَإِذَا رَفَعَ، وَيَرْفَعُ يَدَيْهِ عِنْدَ التَّكْبِيرِ)).

واتە: نوێژی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ کردووە، (الله أكبر)ی دەخوێند، کاتێك دانەویایە، و کاتێك بەرز ببووایەتەوە، و دەستەکانی بەرز دەکردەوە لە کاتی هەموو (الله أكبر)ێکدا.

و ئەو شێوازانەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە لە بەرزکردنەوەی دەستەکاندا دوو جۆرە، یەکەم: بەرزکردنەوەی دەستەکان هەتاکو ئاستی گوێکان:

نەسائی لە مالکی کوڕی حوەیریسەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە: ((رَأَى النَّبِيَّ ﷺ رَفَعَ يَدَيْهِ فِي صَلَاتِهِ... حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا فُرُوعَ أُذُنَيْهِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بینیوە دەستەکانی بەرزکردووەتەوە لە نوێژەکەیدا... دەستەکانی بەرز دەکردەوە هەتاکو دەیگەیاندە ئاستی سەرەوەی گوێکانی.

دووەم: بەرزکردنەوەی دەستەکان هەتاکو ئاستی شانەکان: بوخاری و مسلم لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ...)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستەکانی بەرز دەکردەوە هەتا ئاستی شانەکانی.

(**وَالضَّمُّ**) دەستگرتن لە نوێژدا فەرمانی پێکراوە، بوخاری لە ئەبوحازمەوە لە سەهلی کوڕی سەعدەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((كَانَ النَّاسُ يُؤْمَرُونَ أَنْ يَضَعَ الرَّجُلُ الْيَدَ الْيُمْنَى عَلَى ذِرَاعِهِ الْيُسْرَى فِي الصَّلَاةِ))؛ (قَالَ أَبُو حَازِمٍ: وَلَا أَعْلَمُهُ إِلَّا يَنْمِي ذَلِكَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ).

واتە: خەڵك فەرمانیان پێدەکرا دەستی ڕاستیان بخەنە سەر مەچەکی چەپیان لە نوێژدا؛ ئەو حازم دەڵێت: وادەزانم ئەوەی تەنها لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕایەوە.

شەوکانی دەڵێت: ئەم فەردەیە دەشێت بکرێتە بەڵگە لەسەر واجبی دانانی دەست لەسەر دەست لە نوێژدا[1]؛ بەڵام جمهوری زانایان بە سوننەتی دەزانن، نەوەوی دەڵێت: مەزهەبی ئێمە ئەوەیە سوننەتە، و ئەوە بۆچوونی عەلی کوڕی ئەبوتالب و ئەبوهورەیرە و عائیشە و هەندێکی ترە لە هاوەڵان رضي الله عنهم، و سەعیدی

(١). (نيل الأوطار)(٢/٢١٨).

کوڕی جوبەیر و و نەخعی و ئەبومجلز و هەندێکی تر لە تابعییەکان، و بۆچوونی سوفیانی سەوری و ئەبوحەنیفە و هاوەڵانی و ئەحمەد و ئیسحاق و ئەبوسەور و داود و جمهوری زانایانە، ترمزی دەڵێت: کردار لەسەر ئەمەیە لای زانایان لە هاوەڵان و تابعییەکان و زانایانی دوای ئەوانیش[1].

و ئەو بۆچوونەی کە ئەرجەحە لە شوێنی دانانی دەستەکان سەر سنگە، ئەحمەد لە هولبی تائییەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ((رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَنْصَرِفُ عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ يَسَارِهِ، وَرَأَيْتُهُ يَضَعُ هَذِهِ عَلَى صَدْرِهِ))؛ وَصَفَّ يَحْيَى: الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى فَوْقَ الْمِفْصَلِ.

هولبی تائی دەڵێت: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی دوای کۆتایی هاتنی نوێژ بە لای چەپ و ڕاستیدا دەڕۆیشت، و دەڵێت: بینیم دەستی لەسەر سنگی دادەنا؛ یەحیای کوڕی سەعیدی قەتان وەسفی دانانی دەستەکانی کردووە دەڵێت: دەستی ڕاستی لەسەر مەچەکی دەستی چەپی دادەنا.

و ئیبن خوزەیمە لە وائیلی کوڕی حوجرەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَضَعَ يَدَهُ اليُمْنَى عَلَى يَدِهِ اليُسْرَى عَلَى صَدْرِهِ)).

واتە: نوێژم کرد لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دەستی ڕاستی لەسەر دەستی چەپی دانا لەسەر سنگی.

---

(١). (المجموع)(٣/٣١١).

(**وَالتَّوَجُّهُ بَعدَ التَّكبِيرَةِ**) خوێندنی دوعای دەستپێك (دعاء الاستفتاح)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەو کەسە کرد کە نوێژی بە هەڵە کردووە، ئەبوداود لە ڕیفاعەی کوڕی ڕافعەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((لاَ تَتِمُّ صَلاَةٌ لأَحَدٍ مِنَ النَّاسِ حَتَّى يُكَبِّرَ، وَيَحْمَدُ الله جَلَّ وَعَزَّ، وَيُثْنِي عَلَيْهِ، ويَقرَأَ بما تَيسَّرَ مِنَ القُرآنِ...)).

واتە: نوێژی هیچ کەسێك تەواو نییە، هەتاکو (الله أكبر) نەخوێنێت، و سوپاس و ستایشی خوا نەکات و پەسنی نەدات، و سورەتی الفاتحە نەخوێنێت[1].

و بە چەند شێوازێك هاتووە، دەتوانرێت هەرجارێك یەك لەو شێوازانە بخوێندرێت، لەوانە: بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەمە لەفزی بوخارییە، دەڵێت: ((كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَسْكُتُ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَبَيْنَ الْقِرَاءَةِ إِسْكَاتَةً، قَالَ: أَحْسِبُهُ قَالَ هُنَيَّةً فَقُلْتُ: بِأَبِي وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللهِ، إِسْكَاتُكَ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَالْقِرَاءَةِ، مَا تَقُولُ؟ قَالَ: أَقُولُ: اللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، اللَّهُمَّ نَقِّنِي مِنَ الْخَطَايَا كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الْأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، اللَّهُمَّ اغْسِلْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان (الله أكبر) و خوێندنی سورەتی الفاتحەدا کەمێك بێدەنگ دەبوو، گوتم: دایك و باوکم بە فیدات بێت ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو بێدەنگییەت لە نێوان (الله أكبر) و خوێندنی سورەتی الفاتحەدا، چی دەڵێت؟ فەرمووی: دەڵێم: ((اللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ

---

(١). (أصل صفة الصلاة)(٢٣٨/١).

وَالْمَغْرِبِ، اللَّهُمَّ نَقِّنِي مِنَ الْخَطَايَا كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الْأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، اللَّهُمَّ اغْسِلْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ)).

و مسلم لە عەلییەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ: ((كَانَ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ، قَالَ: وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ، إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ...)).

واتە: ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ هەستایە بۆ نوێژ دەیفەرموو: وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ، إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ...

(**وَالتَّعَوُّذُ**) پەناگرتن بە خوای پەروەردگار لە کاتی خوێندنی قورئان فەرمانی پێکراوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ۝٩٨﴾(النحل).

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر ویستت قورئان بخوێنیت، پەنا بە خوا بگرە لە شەیتانی نەفرەت لێکراو و لە خێر بە دوورکراو.

تەبەری و ئیبن ئەبوحاتەم لە ئیبن زەیدەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ﴿فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ۝٩٨﴾ ئەمە بەڵگەیە لە خواوە ڕێنمایی بەندەکانی کردووە، کاتێك ویستیان قورئان بخوێنن پەنا بە خوا بگرن لە شەڕی شەیتان؛ و ئەبوداود و ترمزی و نەسائی و ئیبن ماجە لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری

خوا ﷺ: ((أَعُوذُ بِاللهِ السَّمِيعِ الْعَلِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، مِنْ هَمْزِهِ وَنَفْخِهِ، وَنَفْثِهِ))ی دەخوێند، پاشان قورئانی دەخوێند؛ و عبدالرزاق لە عەتاوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: خوێندنی ((أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)) واجبە بۆ هەموو خوێندنێکی قورئان لە نوێژدا، یان لە دەرەوەی نوێژ؛ و ئیبن کەسیر دەڵێت: ئەمە فەرمانە لە خواوە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ، هەرکاتێك ویستیان قورئان بخوێنن پەنا بە خوا بگرن لە شەیتانی نەفرەت لێکراو و لە خێر بە دوورکراو؛ ئەلبانی دەڵێت: ئەوەی پەسەندە وەك چۆن لە هەموو ڕکاتێکی نوێژدا سورەتی فاتیحە دەخوێندرێت، دەبێت ((أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)) بخوێندرێت، ئیبن حەزم لە (المحلى)(٢٤٧/٣)دا ئەو بۆچوونەی پەسەندکردووە، و ڕەهایی ئەم ئایەتەی کردووەتە بەڵگە کە دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ٩٨﴾[١]؛ و ئیبن حەجەر دەڵێت: گشتگیری ئایەتەکە ئەوە دەخوازێت ((أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)) لە سەرەتای هەموو ڕکاتێکدا بخوێندرێت[٢]؛ و نەوەوی دەڵێت: ئەوە بۆچوونی پەسەندە لە مەزهەبی ئێمەدا لە هەموو ڕکاتێکدا دەخوێندرێت[٣].

و خوێندنی (بسم الله) واجبە، چونکە ئایەتێکە لە ئایەتەکانی سورەتی الفاتحە، ئەبوداود و ترمزی لە ئوم سەلەمەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی

(١). (أصل صفة الصلاة)(٢٧٦/١).

(٢). (التلخيص)(٣٠٦/٣).

(٣). (المجموع)(٣٢٤/٣).

داناوە، دەڵێت: ((أنَّ النَّبِيَّ ﷺ قرأ في الصلاةِ: بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، وعَدَّها آيةً)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژدا (بسم الله الرحمن الرحيم)ی خوێندووە و بە ئایەتێکی داناوە.

و تەبەری لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ڕیوایەتی کردووە و ئیبن حەجەر بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ئیبن عەباس سورەتی الفاتحەی خوێندەوە، پاشان ئایەتی: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِي وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ۝٨٧﴾(الحِجْر)، گوتی: سورەتی الفاتحە (فاتحة الكتابة) و ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ ئایەتی حەوتەمییەتی.

و سوننە (بسم الله) بە دەنگی نزم بخوێندرێت، مسلم لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ فَلَمْ أَسْمَعْ أَحَدًا مِنْهُمْ يَقْرَأُ: بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)).

واتە: نوێژم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکر و عومەر و عوسماندا کرد نەمبیست کەسیان: بسم الله الرحمن الرحيم بخوێنێت.

(**وَالتَّأْمِينُ**) ئامینکردن لە دوای خوێندنی سورەتی الفاتحە سوننەتە و مانای ئەوەیە: خوایە وەڵامی پاڕانەوەکەمان بدەرەوە، بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((إِذَا أَمَّنَ الإِمَامُ فَأَمِّنُوا، فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلائِكَةِ: غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)).

واتە: ئەگەر پێشنوێژ (إمام) گوتی ئامین ئێوەش بڵێن ئامین، چونکە هەرکەس گوتنی ئامینەکەی لەگەڵ گوتنی ئامینی فریشتەکان تەبابێت و یەکبگرێت، خوای گەورە لە تاوانەکانی ڕابردووی خۆش دەبێت.

هەروەها بوخاری لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((إِذَا قَالَ الْإِمَامُ: ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾(الفاتحة)، فَقُولُوا آمِينَ، فَمَنْ وَافَقَ قَوْلُهُ قَوْلَ الْمَلَائِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)).

واتە: ئەگەر پێشنوێژ گوتی: ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾(الفاتحة)، بڵێن: ئامین، کە مانای ئەوەیە: پەروەردگارا وەڵامی نزا و پاڕانەوەکانمان بدەرەوە، چونکە هەرکەسێك گوتنەکەی لەگەڵ گوتنی فریشتەکان تەبابێت خوا لە تاوانەکانی ڕابردووی خۆش دەبێت.

و بوخاری لە (الأدب المفرد) لە عائیشەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَا حَسَدَكُمُ الْيَهُودُ عَلَى شَيْءٍ مَا حَسَدُوكُمْ عَلَى السَّلَامِ وَالتَّأْمِينِ)).

واتە: جوولە ئێرەییان پێنەبردوون بۆ هیچ شتێك هێندەی ئەوەی ئێرەییتان پێدەبەن لەسەر سەلامکردن و ئامیکردن.

**(وَقِرَاءَةُ غَيرِ الفَاتِحَةِ مَعَهَا)** خوێندنی جگە لە سورەتی الفاتحە لە ڕکاتی یەکەم و دووەمدا سوننەتە، و هەندێك جار خوێندنی جگە لە الفاتحە لە ڕکاتی سێیەم و چوارەمیشدا سوننەتە، بوخار و مسلم لە ئەبوقەتادەوە ڕیوایەتیان

کردووه دەڵێت: ((أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ فِي الْأُولَيَيْنِ بِأُمِّ الْكِتَابِ وَسُورَتَيْنِ، وَفِي الرَّكْعَتَيْنِ الْأُخْرَيَيْنِ بِأُمِّ الْكِتَابِ، وَيُسْمِعُنَا الْآيَةَ، وَيُطَوِّلُ فِي الرَّكْعَةِ الْأُولَى مَا لَا يُطَوِّلُ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ، وَهَكَذَا فِي الْعَصْرِ، وَهَكَذَا فِي الصُّبْحِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی نیوەڕۆ لە دوو ڕکاتی یەکەمدا سورەتی الفاتحە و دوو سورەتی دەخوێند، و لە دوو ڕکاتەکەی کۆتایی تەنها سورەتی الفاتحەی دەخوێند، و هەندێك جار ئایەتی گوێبیست دەداین، و ڕکاتی یەکەمی درێژ دەکردەوە بەڵام لە ڕکاتی دووەمدا ئەوەندە درێژی نەدەکردەوە، هەروەها بەوشێوەشی دەکرد لە نوێژی عەسر و نوێژی بەیانیدا.

و بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((فِي كُلِّ صَلَاةٍ قِرَاءَةٌ فَمَا أَسْمَعَنَا النَّبِيُّ ﷺ، أَسْمَعْنَاكُمْ، وَمَا أَخْفَى مِنَّا، أَخْفَيْنَاهُ مِنْكُمْ، وَمَنْ قَرَأَ بِأُمِّ الْكِتَابِ فَقَدْ أَجْزَأَتْ عَنْهُ، وَمَنْ زَادَ فَهُوَ أَفْضَلُ)).

واتە: لە هەموو نوێژێکدا خوێندنی قورئان هەیە، ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەنگی بەرز خوێندنی ئێمەش بە دەنگی بەرز بۆمان خوێندن، و ئەوەی بە دەنگی نزم خوێندی ئێمەش بە دەنگی نزم بۆمان خوێندن، و هەرکەسێك تەنها سورەتی الفاتحە بخوێنێت بەسییەتی، و هەرکەسێك زیاتر بخوێنێت ئەوە فەزڵە.

شەوکانی دەڵێت: هیچ ناکۆکییەك نییە سوننەتە لە نوێژدا سورەتی تر لەگەڵ الفاتحەدا بخوێندرێت لە بەیانی و جومعە و دوو ڕکاتی سەرەتای هەموو نوێژێك[١].

---

(١). (نیل الأوطار)(٢/٢٤٨).

و مسلم لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە ڕیوایەتی کردووە: ((أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الظُّهْرِ، فِي الرَّكْعَتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ، فِي كُلِّ رَكْعَةٍ قَدْرَ ثَلَاثِينَ آيَةً، وَفِي الْأُخْرَيَيْنِ قَدْرَ خَمْسَ عَشْرَةَ آيَةً، أَوْ قَالَ: نِصْفَ ذَلِكَ، وَفِي الْعَصْرِ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ، فِي كُلِّ رَكْعَةٍ قَدْرَ قِرَاءَةِ خَمْسَ عَشْرَةَ آيَةً، وَفِي الْأُخْرَيَيْنِ قَدْرَ نِصْفِ ذَلِكَ)).

واتە: پێغەمبەری خوا لە نوێژی نیوەڕۆدا لە دوو ڕکاتی یەکەمدا لە هەر ڕکاتێکدا نزیکەی سی ئایەتی دەخوێند، و لە دوو ڕکاتی کۆتایی نزیکەی پازدە ئایەتی دەخوێند، یان گوتی: نیوەی ئەوەی دەخوێند، و لە نوێژی عەسردا لە دوو ڕکاتی یەکەمدا نزیکەی پازدە ئایەتی دەخوێند، و لە دوو ڕکاتی دووەمدا نزیکەی نیوەی ئەوەی دەخوێند.

و مالك لە (الموطأ) لە صونابحییەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە دەڵێت: (سَمِعْتُ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ رضي الله عنه قَرَأَ فِي الرَّكْعَةِ الثَّالِثَةِ مِنَ الْمَغْرِبِ بِأُمِّ الْقُرْآنِ وَهَذِهِ الْآيَةِ: ﴿رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا... ﴿٨﴾﴾(آل عیمران).

واتە: گوێم لێ بوو ئەبەبەکری صدیق رضي الله عنه لە ڕکاتی سێیەمی نوێژی مەغریب سورەتی الفاتحە و ئەم ئایەتی خوێند: ﴿رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا... ﴿٨﴾﴾(آل عیمران).

(**وَالتَّشَهُّدُ الأَوسَطُ**) پێشتر باسمان کرد نوسەر تەحیاتی ناوەڕاست بە سوننەت دەزانێ، بەڵام ئەوەی ئەرجە واجبە، ئەحمەد و نەسائی لە ئیبن مەسعودەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا محمد ﷺ دەفەرموێت: ((إِذَا قَعَدْتُمْ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ فَقُولُوا: التَّحِيَّاتُ لِلهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ السَّلَامُ...)).

واتە: ئەگەر لە هەموو دوو ڕکاتێکدا دانیشتن تەحیات بخوێنن و بڵێن: التحيات لله...

و ئەبوداود لە ڕیفاعەی کوڕی ڕافعەوە لە باسی ئەو کەسەی کەلە نوێژەکەیدا هەڵەی کرد ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((فَإِذَا جَلَسْتَ فِي وَسَطِ الصَّلَاةِ فَاطْمَئِنَّ وَافْتَرِشْ فَخِذَكَ الْيُسْرَى ثُمَّ تَشَهَّدْ)).

واتە: ئەگەر لە ناوەڕاستی نوێژدا دانیشتیت ئۆقرە بگرە و ئارام بگرە و پێی چەپ و ڕانت ڕابخە پاشان تەحیات و شایەتمان بخوێنە.

(**والاستِرَاحَةُ**) پشووی دانیشتن کاتێك لە ڕکایەتی یەکەم و ڕکاتی سێیەم تەواو دەبێت و لە سوژدە سەر بەرز دەکاتەوە، سوننەتە، بوخاری لە مالك کوڕی حوەیریسەوە ڕیوایەتی کردووە: ((أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي، فَإِذَا كَانَ فِي وِتْرٍ مِنْ صَلَاتِهِ لَمْ يَنْهَضْ حَتَّى يَسْتَوِيَ قَاعِدًا)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بینی نوێژی دەکرد، ئەگەر لە ڕکاتی تاکی نوێژەکەیدا بووایە هەڵنەدەستا هەتاکو ڕێك دانەیشتایە.

و ئەبوداود و ترمزی لە ئەبوحەمیدی ساعدییەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، باسی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات، دەڵێت: ((ثُمَّ ثَنَى رِجْلَهُ وَقَعَدَ وَاعْتَدَلَ حَتَّى يَرْجِعَ كُلُّ عَظْمٍ فِي مَوْضِعِهِ، ثُمَّ نَهَضَ)).

واتە: پاشان پێی درێژکرد و دانیشت و ڕێکبوویەوە هەتاکو هەموو ئێسقانێك گەڕایەوە شوێنی خۆی، پاشان هەستا.

و دانیشتن لەسەر پشتی پێکان لە نێوان سوژدەکان هەندێك جار سوونەتە، مسلم لە تاوسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((قُلْنَا لابْنِ عَبَّاسٍ فِي الْإِقْعَاءِ عَلَى الْقَدَمَيْنِ فَقَالَ: هِيَ السُّنَّةُ؛ فَقُلْنَا لَهُ: إِنَّا لَنَرَاهُ جَفَاءً بِالرَّجُلِ! فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: بَلْ هِيَ سُنَّةُ نَبِيِّكَ ﷺ)).

واتە: بە ئیبن عەباسمان گوت: دانیشتن لەسەر پشتی پێکان لە نێوان سوژدەکاندا، گوتی: لە سوننەتە؛ گوتمان ئێمە بە جەفای دەبینین کەسێك بەوشێوەیە دابنیشێت! ئیبن عەباس گوتی: بەڵکو ئەوە سوننەتی پێغەمبەرەکەتە ﷺ.

و لە کاتی خوێندنی تەحیاتدا جوڵاندنی پەنجەی شایەتومان سوننەتە، نەسائی لە وائلی کوڕی حوجرەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، باسی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات، دەڵێت: ((ثُمَّ قَبَضَ اثْنَتَيْنِ مِنْ أَصَابِعِهِ، وَحَلَّقَ حَلْقَةً، ثُمَّ رَفَعَ أُصْبُعَهُ، فَرَأَيْتُهُ يُحَرِّكُهَا يَدْعُو بِهَا)).

واتە: پاشان دوو لە پەنجەکانی کۆکردەوە و بازنەیەکی پێ دروستکرد، پاشان پەنجەی بەرزکردەوە، بینیم دەیجوڵاندن و دوعای پێدەکرد.

(**وَالأَذْكَارُ الوَارِدَةُ فِي كُلِّ رُكنٍ**) ئەوەی ئەرجەحە (الله أكبر)ەکانی گواستنەوە (تكبيرات الانتقال) واجبە، بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا قَالَ سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولوا: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ)).

واتە: ئیمام بۆ ئەوە دانراوە چاوی لێ بکرێت، ئەگەر (الله أكبر) خوێند، (الله أكبر) بخوێنن، و ئەگەر ڕکوعی برد ئێوەش ڕکوع ببەن، و ئەگەر گوتی: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، ئێوە بڵێن: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ).

و جمهوری زانایان (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ) بە سوننەت دەزانن، بەڵام نەسائی لە ڕیفاعەی کوڕی ڕافعەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، باسی ئەو کەسە دەکات بە هەڵە نوێژی کرد، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ثُمَّ يُكَبِّرَ وَيَرْكَعَ حَتَّى تَطْمَئِنَّ مَفَاصِلُهُ وَتَسْتَرْخِيَ، ثُمَّ يَقُولَ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ...)).

واتە: پاشان (الله أكبر) بخوێنێت و ڕکوع ببات هەتاکو هەموو جومگەکامی ئۆقرە دەگرن و ڕادەکشێن، پاشان بڵێت: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ.

و بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِذَا قَالَ الْإِمَامُ سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ فَقُولُوا: اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ، فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ قَوْلُهُ قَوْلَ الْمَلَائِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)).

واتە: ئەگەر ئیمام گوتی: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، بڵێن: (اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ)، چونکە هەرکەسێك نزا و پاڕانەوەکەی ڕێك بکەوێت لەگەڵ نزا و پاڕانەوەی فریشتە، خوای پەروەردگار لە تاوانی ڕابردووی خۆش دەبێت.

و زیکرەکانی ڕکوع و سوژدە جمهوری زانایان بە سوننەتی دەزانن، مسلم لە حوزەیفەی کوڕی یەمانەوە ڕیوایەتی کردووە باسی ئەوە دەکات شەوێك لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ کردووە دەڵێت: ((ثمَّ ركع فَجعل يَقُول: سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيم... ثُمَّ سَجَدَ فَقَالَ: سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى)).

واتە: پاشان ڕکوعی برد و دەیفەرموو: (سُبْحانَ رَبيِّ العَظِيمِ)، و پاشان سوژدەی برد و دەیفەرموو: (سُبْحانَ رَبيِّ الأعْلى).

و بوخاری و مسلم لە عائیشەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، يَتَأَوَّلُ الْقُرْآنَ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر لە ڕکوع و سوژدەیدا دەیفەرمووی: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي)، ئەوەی لە لێکدانەوەی قورئانەوە وەردەگرت.

و بوخاری لە ڕیفاعەی کوڕی ڕافعی زورەقییەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((كُنَّا يَوْمًا نُصَلِّي وَرَاءَ النَّبِيِّ ﷺ، فَلَمَّا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرَّكْعَةِ قَالَ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، قَالَ رَجُلٌ وَرَاءَهُ: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: مَنِ الْمُتَكَلِّمُ؟ قَالَ: أَنَا، قَالَ: رَأَيْتُ بِضْعَةً وَثَلَاثِينَ مَلَكًا يَبْتَدِرُونَهَا، أَيُّهُمْ يَكْتُبُهَا أَوَّلُ)).

واتە: ڕۆژێك لە پشتی پێغەمبەری خواوە ﷺ نوێژمان دەکرد، کاتێك سەری لە ڕکوع بەرزکردەوە و فەرمووی: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، پیاوێك لە پشتییەوە گوتی: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ)، کاتێك نوێژەکەی تەواوکرد فەرمووی: ئەوە کێ بوو قسەی کرد؟ پیاوەکە گوتی: من بووم، فەرمووی: سی و ئەوەندە فریشتەم بینی پەلەیان بوو کامیان لە پێش ئەوانی تر بینوسێت.

و ترمزی لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، وَارْحَمْنِي، وَاجْبُرْنِي، وَاهْدِنِي، وَارْزُقْنِي)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان هەردوو سوژدەکەدا دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، وَارْحَمْنِي، وَاجْبُرْنِي، وَاهْدِنِي، وَارْزُقْنِي).

و خوای پەروەردگار فەرمانی بە سەڵاواتدان کردووە لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ و دەفەرمویت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ٥٦﴾(الأحزاب).

واتە: بێگومان خوا و فریشتەکانی صەڵەوات دەدەن لەسەر پێغەمبەرەکەی، ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە صەڵەواتی لەسەر بدەن و سەلامی لێبکەن بە سەلامی ئیسلام.

ئەلبانی دەڵێت: وەك چۆن سەلامکردن لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو تەحیاتێکدا شەرعییە، بەوشێوەیەش صەڵەواتدان لەسەری شەرعییە دوای خوێندنی شایەتومان، لە تەحیاتی یەکەم و دووەمدا جیاوازی نییە، لەبەر گشتگیری بەڵگەکان و ڕەهاییان، لەوانە: ئەو ئایەتەی خوا دەفەرمویت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ٥٦﴾، ئیبن قەیم لە (جلاء الأفهام)(٢٤٩)دا دەڵێت: ئەمە بەڵگەیە لە هەرکوێ خوێندنی سەلام شەرعی بێت، صەڵەوات لەسەردانیشی شەرعییە، بۆیە کاتێك هاوەڵەکانی پرسیاریان لێکرد چۆن صەڵەواتی لەسەر بدەن و گوتیان: زانیمان چۆن سەلامت لێ بکەین، ئەی چۆن صەڵەواتت لەسەر بدەین؟ ئەمەش بەڵگەیە صەڵەوات و سەلام لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەوە گرێدراوە، و زانراوە ئەو کەسەی نوێژ دەکات سەلام لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات (واتە: لە تەحیاتی یەکەمدا)، لەبەر ئەوە شەرعییە بۆی صەڵەوات لەسەر پێغەمبەری خوا بدات ﷺ[1].

---

(١). (أصل صفة الصلاة)(٣/٩٠٤).

مسلم لە ئەبومەسعودی ئەنصارییەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((أَتَانَا رَسُولُ اللهِ ﷺ وَنَحْنُ فِي مَجْلِسِ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ، فَقَالَ لَهُ بَشِيرُ بْنُ سَعْدٍ: أَمَرَنَا اللهُ تَعَالَى أَنْ نُصَلِّيَ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ فَكَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ قَالَ: فَسَكَتَ رَسُولُ اللهِ ﷺ حَتَّى تَمَنَّيْنَا أَنَّهُ لَمْ يَسْأَلْهُ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: قُولُوا: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ فِي الْعَالَمِينَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان، ئێمە لە کۆڕی سەعدی کوڕی عوبادەدا دانیشتبووین، بەشیر کوڕی سەعد پێی گوت: خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردووین سەڵاواتت لەسەر بدەین ئەی پێغەمبەری خوا چۆن سەڵاواتت لەسەر بدەین؟ دەڵێت: پێغەمەری خوا ﷺ بێدەنگ بوو هەتا خۆزگەمان خواست پرسیاری لێ نەکردایە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بڵێن: ((اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ فِي الْعَالَمِينَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ)).

و ئەبوداود و ترمزی لە فەزاڵەی کوڕی عوبێدەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((سَمِعَ رسُولُ اللهِ ﷺ رَجُلًا يَدْعُو فِي صَلَاتِهِ لَمْ يُمَجِّدِ اللهَ تَعَالَى، وَلَمْ يُصَلِّ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ رسُولُ اللهِ ﷺ: عَجِلَ هَذَا، ثُمَّ دَعَاهُ فَقَالَ لَهُ أَوْ لِغَيْرِهِ: إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِتَحْمِيدِ رَبِّهِ سُبْحَانَهُ، وَالثَّنَاءِ عَلَيْهِ، ثُمَّ يُصَلِّي عَلَى النَّبِيِّ ﷺ ثُمَّ يَدْعُو بَعْدُ بِمَا شَاءَ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە پیاوێك بوو لە نوێژەكەیدا ستایش نەكرد و پەسنی خوای نەدا، و سەڵەواتی لە پێغەمبەرەكەی ﷺ نەدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەمە پەلەی كرد، پاشان بەو كەسە یان كەسێكی تری فەرموو: ئەگەر كەسێك لە ئێوە نوێژی كرد با سەرەتا ستایشی خوای پەروەردگار بكات و پەسنی بدات، پاشان سەڵەوات لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ بدات، پاشان دوای بپارێتەوە بەوەی دەیەوێت.

(**والاستِكثَارُ مِن الدُّعَاءِ بِخَيْرَيِ الدُّنيَا وَالآخِرَةِ، بِمَا وَرَدَ وَبِمَا لَم يَرِد**) دوو شوێن لە نوێژدا زیاتر شوێنی دوعاكردنە، كاتی سوژدەبردن و دوای كۆتایی هاتنی تەحیات، مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتی كردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الْعَبْدُ مِنْ رَبِّهِ، وَهُوَ سَاجِدٌ، فَأَكْثِرُوا الدُّعَاءَ)).

واتە: نزیكترین كاتی بەندەیە لە پەروەردگارییەوە ئەوكاتەیە لە سوژدەدایە، بۆیە زۆر لە سوژدەدا دوعا بكەن.

و بوخاری و مسلم لە ئیبن مەسعودەوە ڕیوایەتیان كردووە باسی ئەوە دەكات پێغەمبەری خوا ﷺ فێری تەحیاتی كردوون، و دەفەرموێت: ((ثُمَّ يَتَخَيَّرُ مِنَ الدُّعَاءِ أَعْجَبَهُ إِلَيْهِ فَيَدْعُو)).

واتە: پاشان دوای خوێندنی تەحیات ئەو دوعایانە هەڵدەبژێرێت كە پێی خۆشە پێی بپارێتەوە.

و مسلم لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی كردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَلَا وَإِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَقْرَأَ الْقُرْآنَ رَاكِعًا أَوْ سَاجِدًا، فَأَمَّا الرُّكُوعُ فَعَظِّمُوا فِيهِ الرَّبَّ عزوجل، وَأَمَّا السُّجُودُ فَاجْتَهِدُوا فِي الدُّعَاءِ فَقَمِنٌ أَنْ يُسْتَجَابَ لَكُمْ)).

واتە: من نەهیم لێکراوە قورئان بخوێنم لە ڕکوع و لە سوژدەدا، لە ڕکوعدا پەروەردگار گەورە و مەزن ڕابگرن، و لەسوژدەدا هەوڵبدەن دوعای تێدا بکەن، چونکە دوعاکردن لە سوژدەدا شایانە وەڵام بدرێتەوە.

و پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردووە بە پەناگرتن بە خوا لە چوار شت دوای کۆتایی خوێندنی تەحیات، مسلم و ئیبن ماجە لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان و و ئەمە لە فزی ئیبن ماجەیە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِذَا فَرَغَ أَحَدُكُمْ مِنَ التَّشَهُّدِ الْأَخِيرِ، فَلْيَتَعَوَّذْ بِاللهِ مِنْ أَرْبَعٍ: مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَمِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ)).

واتە: ئەگەر کەسێکتان لە خوێندنی تەحیاتی کۆتایی بوونەوە با پەنا بە خوا بگرێت لە چوار شت: لە سزای دۆزەخ، و لە سزای گۆڕ، و فیتنەی ژیان و مردن، و فیتنەی مەسیحی دەجال.

و بوخاری و مسلم لە ئەبوبەکری صدیقەوە ڕیوایەتیان کردووە: ((أَنَّهُ قَالَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ: عَلِّمْنِي دُعَاءً أَدْعُو بِهِ فِي صَلَاتِي، قَالَ: قُلْ: اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَثِيرًا، وَلَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ، وَارْحَمْنِي، إِنَّك أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ)).

واتە: بە پێغەمبەری خوای ﷺ فەرموو: دوعایەکم فێر بکە کە نوێژەکەمدا پێی بپاڕێمەوە، فەرمووی: بڵێ: ((اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَثِيرًا، وَلَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ، وَارْحَمْنِي، إِنَّك أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ)).

## فصل في مبطلاتها

**وَتَبطُلُ الصَّلَاةُ: بِالكَلَامِ، وَبِالاشتِغَالِ بِمَا لَيسَ مِنهَا، وَبِتَركِ شَرطٍ أَو رُكنٍ عَمدًا.**

## فەسڵی پووچەڵکەرەوەکانی نوێژ

**و نوێژ پووچەڵ دەبێتەوە: بە قسەکردن، و بە خەریکبوون بە جگە لەوەی لە نوێژە، و بە ئەنقەست وازهێنان لە مەرجێك یان ڕوکنێک.**

(**وَتَبطُلُ الصَّلَاةُ: بِالكَلَامِ**) مەبەست لەو قسەکردنەیە کە پەیوەندی بە نوێژەوە نییە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ٢٣٨﴾(البقرة).

واتە: هەستن و سەرکز و ملکەچی فەرمانی خوابن.

بوخاری و مسلم لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((كُنَّا نَتَكَلَّمُ فِي الصَّلَاةِ، يُكَلِّمُ أَحَدُنَا أَخَاهُ فِي حَاجَتِهِ، حَتَّى نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ٢٣٨﴾، فَأُمِرْنَا بِالسُّكُوتِ))؛ وَفِي رِوَايَةِ مُسْلِمٍ: ((فَأُمِرْنَا بِالسُّكُوتِ وَنُهِينَا عَنِ الْكَلَامِ)).

واتە: ئێمە قسەمان دەکرد لە نوێژدا، کەسێك لەگەڵ برادەرەکەی قسەی دەکرد کە لە تەنیشتیدا بوو لە نوێژدا، هەتاکو ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ٢٣٨﴾، فەرمانمان پێکرا بێدەنگ بین؛ لە ڕیوایەتی مسلم دا دەڵێت: فەرمانمان پێکرا بێدەنگ بین و یاساغیمان لێکرا قسە بکەین لە نوێژدا.

و مسلم لە موعاوییەی کوڕی حەکەمەوە ڕیوایەتی کردووە و لە نوێژدا قسەی کردووە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووە: ((إِنَّ هَذِهِ الصَّلَاةَ لَا يَصْلُحُ فِيهَا شَيْءٌ مِنْ كَلَامِ النَّاسِ، إِنَّمَا هُوَ التَّسْبِيحُ وَالتَّكْبِيرُ وَقِرَاءَةُ الْقُرْآنِ)).

واتە: بێگومان نوێژ ناشێت هیچ قسەی خەڵکی تێدا بکرێت، بەڵکو تەنها تەسبیحات و تەکبیر و قورئان خوێندنی تێدا دەکرێت.

و بوخاری و مسلم لە ئیبن مەسعودەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((كُنَّا نُسَلِّمُ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ وَهُوَ فِي الصَّلاَةِ فَيَرُدُّ عَلَيْنَا، فَلَمَّا رَجَعْنَا مِنْ عِنْدِ النَّجَاشِيِّ سَلَّمْنَا عَلَيْهِ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْنَا؛ فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، كُنَّا نُسَلِّمُ عَلَيْكَ فِي الصَّلاَةِ فَتَرُدُّ عَلَيْنَا؟! فَقَالَ: إِنَّ فِي الصَّلاَةِ شُغْلًا))؛ وَفِي رِوَايَةٍ لِلنَّسَائِيِّ: ((إِنَّ اللهَ عزوجل يُحْدِثُ مِنْ أَمْرِهِ مَا يَشَاءُ، وَإِنَّهُ قَدْ أَحْدَثَ مِنْ أَمْرِهِ أَنْ لَا يُتَكَلَّمَ فِي الصَّلَاةِ)).

واتە: ئێمە سەلامان لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد لە کاتێکدا نوێژی دەکرد، کاتێك لە کۆچی حەبەشە لای نەجاشی گەڕاینەوە سەلامان لێکرد وەڵامی نەداینەوە، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە لە نوێژدا سەلامان لێ دەکریت وەڵامت دەداینەوە؟! فەرمووی: بەڕاستی لە نوێژدا بەندە خەریك و سەرقاڵە بە زیکر و نزا و پاڕانەوە و خوێندنی قورئان خوێندن؛ لە ڕیوایەتی نەسائیدا دەفەرموێت: بێگومان خوای باڵادەست چی بوێت لە فەرمانی خۆی دایدەهێنێت و نوێی دەکاتەوە، بێگومان ئەوەی لە فەرمانیدا نوێیە ئەوەیە کە بە هیچ شێوەیەك قسە لە نوێژدا نەکرێت.

و زۆرێك لە زانایان ئیجماعیان نەقڵکردووە لەسەر پووچەڵبوونەوەی نوێژی ئەو کەسەی بە ئەنەقەست قسەیەك دەکات پەیوەندنی بە نوێژەکەوە نەبێت، ئیبن تەیمییە دەڵێت: بێگومان بە دەق و ئیجماع جێگیربووە کەسێك لە نوێژدا قسە

بکات بە قسەی مرۆڤەکان بە ئەنقەست بۆ جگە لە بەرژەوەندنی نوێژەکە و بزانێت قسەکردن حەرامە، نوێژەکەی بە ئیجماع بەتاڵ دەبێتەوە[1].

(**وَبِالاشتِغَالِ بِمَا لَيسَ مِنهَا**) ئەو خەریکبوونە ئەگەر کردار بێت یان گوفتار، زانایان باسی ئەوەیان کردووە، ئەو خەریکبوونە وابەستەیە بەوەی نوێژکەرەکە لە شێوەی نوێژەکەی دەربچێت، وەك ئەوەی خەریك بێت بە دارتاشییەوە، یان بەرگدوورییەوە، یان ڕۆیشتنی زۆر یان لاکردنەوەی زۆر، چونکە ئەو شێوەیەی نوێژ ڕیوایەتکراوە واجبە ڕەچاو بکرێت، بوخاری لە مالکی کوڕی حوەریسەوە ڕیوایەتی کردووە کە لەگەڵ کۆمەڵە گەنجێکدا هاتوون بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەڕانەوەیاندا پێی فەرموون: ((صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي)).

واتە: بەوشێوەیە نوێژ بکەن کە منتان بینی نوێژم دەکرد.

ئەگەرنا بە صەحیحی ڕیوایەتکراوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ئومامەی کچەزای لە نوێژدا لە ئامێزیدا هەڵگرتووە، و لەسەر مینبەرەکەوە نوێژی کردووە و پاشان هاتووەتە خوارەوە سوژدەی بردووە، و پێڵاوەکانی لە نوێژدا لەپێی داکەندووە، و لە نوێژدا بەڵغەمی کردووەتە سەرزەوی پاشان بە نەعلەکەی پێی چەپی سڕیویەتی.

و ئەبوداود لە عائیشەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ((اسْتَفْتَحْتُ الْبَابَ وَرَسُولُ اللهِ ﷺ يُصَلِّي تَطَوُّعًا، وَالْبَابُ فِي الْقِبْلَةِ، فَمَشَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ يَمِينِهِ أَوْ عَنْ يَسَارِهِ حَتَّى فَتَحَ الْبَابَ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى الصَّلَاةِ)).

---

(١). (مجموع الفتاوى)(٩٣/١٢).

واتە: لە دەرگامدا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی سوننەتی دەکرد، و دەرگاکە لە قیبلەدا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ بە لای ڕاستیدا یان بە لای چەپیدا ڕۆیشت هەتاکو دەرگاکەی کردووە، پاشان گەڕایەوە بۆ نوێژەکەی.

و مسلم لە عبداللەی کوڕی شیخێرەوە ڕیوایەتی کردووە: ((أَنَّهُ صَلَّى مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: فَتَنَخَّعَ فَدَلَكَهَا بِنَعْلِهِ الْيُسْرَى)).

واتە: نوێژی لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ نوێژی کردووە، دەڵێت: بەڵغەمی فڕێدا و بە نەعلەکەی پێی چەپی سڕیی.

و ئیبن عبدالبر دەڵێت: زانایان کۆدەنگن دروست نییە بۆ ئەو کەسەی نوێژ دەکات جووڵە بکات تەنها جووڵەیەکی کەم نەبێت، کە نوێژکەر دەرنەکات لە کردەوەی نوێژەکەی بۆ کردەوەی تر، و پێیەوە سەرقاڵ نەبێت، وەك خوراندنی کەمی لەش و گرتن و لادانی مێشوولە و کوشتنی دووپشك بە لێدانێکی ئاسان[1].

و ئیبن حەزم دەڵێت: زانایان کۆدەنگن کە خواردن و پێکەنینی قاقا و کردەوەی زۆر کە فەرمانی پێنەکرابێت، ئەگەر لە نوێژدا ئەنجام بدرێن نوێژەکەیان بە ئیجماع پووچەڵ دەبێتەوە[2].

(**وَبِتَرْكِ شَرطٍ أَو رُكنٍ عَمدًا**) ئەگەر کەسێك مەرجێك لە مەرجەکانی نوێژ وازلێ بهێنرێت نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، بۆنموونە کەسێك دەستنوێژی نەبێت

---

(١). (الاستذكار)(٢/٢٧٤).

(٢). (مراتب الإجماع)(١/٢٧).

نوێژەکەی دروست نییە، هەروەها ئەگەر ڕوکنێك لە ڕوکنەکان وازلێ بهێنێت بۆ نموونە کەسێك سورەتی الفاتحە نەخوێنێت.

مەرج ئەوەیە بە بەڵگە جێگیر دەبێت ئەگەر ئەو مەرجە نەبێت کردەوە بەتاڵ دەبێتەوە، بۆ نموونە لە بەڵگەی شەرعیدا هاتبێت: هەرکەسێك فلان کردەوە ئەنجام نەدات نوێژی بۆ نییە، یان بە ڕاشکاوی هاتبێت کردەوەکەی صەحیح نییە، یان قەبوڵ نییە و پاداشتی دەست ناکەوێت، یان جێگیر بووبێت نەهیکراوە لە کردەوەیەك بەبێ بەجێهێنانی مەرجەکەی، چونکە نەهی بەڵگەیە لەسەر هەڵوەشاندنەوە کە هاومانای پووچەڵە، بەڵام شتێك واجب بێت بە تەنها داواکردنی شەرع بۆ ئەنجامدانی پێویست دەبێت، و تەنها داواکردن زیاتر لەوەی واجبە پێویست ناکات[1].

(١). بڕوانە: (الدراري المضية)(١/٩٣).

## فصل

**وَلا تَجِبُ عَلَى غَيرِ مُكَلَّفٍ، وَتَسقُطُ عَلَى: مَن عَجَزَ عَنِ الإِشَارَةِ، أَو أُغمِيَ عَلَيهِ حَتَّى خَرَجَ وَقتُهَا؛ وَيُصَلِّي المَرِيضُ: قَائِمًا، ثُمَّ قَاعِدًا، ثُمَّ عَلَى جَنْبٍ.**

## فەسڵێک

**و نوێژ لەسەر کەسێك موکەلەف نەبێت واجب نییە، و دەکەوێت لەسەر: ئەو کەسەی ناتوانێت ئاماژە بکات، یان لەهۆش بچێت هەتاکو کاتی نوێژەکە تەواو دەبێت؛ و نەخۆش بەپێوە نوێژ دەکات، پاشان بە دانیشتنەوە، پاشان لەسەر لاتەنیشت.**

(**وَلا تَجِبُ عَلَى غَيرِ مُكَلَّفٍ**) نوێژ لەسەر کەسێکی موکەلەف نەبێت واجب نییە، و بەشێوەیەکی گشتی مەرجەکانی تەکلیف عەقڵ و باڵغبوون و موسڵمان بوونە، ترمزی لە عەلییەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَشِبَّ، وَعَنِ الْمَعْتُوهِ حَتَّى يَعْقِلَ)).

واتە: قەڵەم لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە: ئەو کەسەی خەوتووە هەتاکو بەخەبەر دەبێتەوە، و منداڵ هەتاکو باڵغ دەبێت، و شێت هەتاکو عاقڵ دەبێت.

بەڵام وەك زانراوە منداڵ فەرمانکراوە لە حەوت ساڵییەوە نوێژی پێ بکرێت و لە دە ساڵیدا لێی بدرێت لەسەر نەکردنی، واتە: ئەگەر منداڵ پێش تەمەنی باڵغبوون نوێژ بکات پاداشتی دەست دەکەوێت و لێی قەبوڵ دەکرێت، بەڵام واجب نییە لەسەری.

(**وَتَسقُطُ عَلَى: مَن عَجَزَ عَنِ الإِشَارَةِ**) نوسەر بۆچوونی وایە نوێژ لەسەر کەسێك دەکەوێت کە نەتوانێت بە ئاماژە نوێژ بکات، بەڵام هەندێك لە زانایان

دەڵێن: ئەگەر نەتوانێت ئاماژە بكات و بتوانێت زیكرەكانی بخوێنێت پێویستە لەسەر نوێژ بكات، چونكە نوێژ پێكهاتووە لە كردار و گوفتار بە نییەتەوە، ئەگەر نەیتوانی كردارەكان بەجێ بهێنێت و بتوانێت گوفتارەكانی بەجێ بهێنێت دەبێت نوێژ بكات، و ئەگەر نەیتوانی كردار و گوفتارەكانیشی بەجێ بهێنێت وەك كەسێك تووشی ئیفلیجی جەستە و زمانی بوو بێت، بە دڵی نوێژ دەكات، چونكە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ ١٦﴾(التغابن).

واتە: پارێزكاربن و لە خوا بترسن بە گوێرەی تواناتان[1].

(**أَو أُغمِيَ عَلَيهِ حَتَّى خَرَجَ وَقتُهَا**) زانایان ناكۆكن ئایا كەسێك لە هۆش بچێت هەتاكو كاتی نوێژەكەی لە دەست دەچێت ئەو نوێژەی لەسەر پێویست دەبێت، هەندێكیان دەڵێن: ئەگەر ماوەكەی كەم بێت پێویستە نوێژەكانی بكاتەوە، و هەندێكیان دەڵێن: لەسەری پێویست نابێت، ئەگەر كەسێك پێش نوێژی مەغریب لە هۆش بچێت و پێش كۆتایی هاتنی نوێژی عیشا بەهۆش بێتەوە دەتوانێت نوێژی مەغریب و عیشا پێكەوە كۆ بكاتەوە لەبەر ئەوەی كاتی ناچار ئەو دوو نوێژە یەك كاتە، هەروەها بۆ نوێژی نیوەڕۆ و عەسریش، ئیبن عبدالبر دەڵێت: ئەوەی دروستترین بۆچوونە لەم بابەتەدا كەسێك لەهۆشچووبێت و بەهۆش بێتەوە قەزای لەسەر نییە، ئەوە بۆچوونی ئیبن شیهاب و حەسەن و ئیبن سیرین و ڕەبیعە و مالك و شافعی ئەبوسەورە و مەزهەبی عبداللەی كوڕی عومەرە، و لەهۆشچووە هیچ نوێژێكی قەزا نەكردووەتەوە لەوەی لە دەستی چووە، و ئەمە

---

(١). بڕوانە: (الشرح الممتع)(٣٣٢/٤).

قیاسە لای منە و خوا زاناترە، چونکە نوێژ لە کاتی خۆیدا واجبە ئەگەر کاتەکەی بەسەرچوو واجب نابێت بە بەڵگەیەك نەبێت ناکۆکی نەبێتە لەبارەیەوە، و هەرکەسێك فریای ئەوە نەکەوێت ڕکاتێك نوێژ بکات و ئەوەی لە دەست بچێت بە قەدەری خوا، قەزای لەسەر نییە[1].

بەڵام ئەگەر کەسێك بە ویستی و هەڵبژاردەی خۆی بێهۆش ببێت زۆرێك لە زانایان بۆچوونیان وایە نوێژەکانی قەزا دەکاتەوە، لیژنەی هەمیشەی فەتوا دەڵێن: کەسێك لەهۆشچوو بێت بەهۆی بەنجەوە بۆ نموونە بۆ نەشتەگەری و هاوشێوەی حوکمی ئەو کەسەی هەیە کە لەهۆشچووە لەبەر هۆیەك لە جەستەیدا، ئەو کاتە قەزای نوێژی لەسەر ناکەوێت ئەگەر بەهۆش هاتەوە وەك کەسێکی خەتووە، ئەگەر لە کاتی نوێژ بەخەبەر بێت، یان دوای دەرچوونی کاتەکەی بێت[2].

و کەسی سەرخۆشیش هەندێك لە زانایان ئیجماعیان نەقڵکردووە کە کاتێك بەهۆش دێتەوە دەبێتە نوێژەکانی قەزا بکاتەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقْرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُواْ مَا تَقُولُونَ ﴿٤٣﴾﴾(النساء).

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە توخن و نزیکی نوێژ مەکەونەوە لە کاتێکدا کە مەستن و سەرخۆشن هەتاکو بزانن چی دەڵێن.

---

(١). (التمهيد)(٣/٢٩٠).

(٢). (فتاوى اللجنة الدائمة-١)(٨/٧٧).

ئیبن مونزر دەڵێت: زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کەسی سەرخۆش پێویستە نوێژ قەزا بکاتەوە[1].

(**وَيُصَلِّي المَرِيضُ: قَائِمًا، ثُمَّ قَاعِدًا، ثُمَّ عَلَى جَنْبٍ**) موسڵمان فەرمانی پێکراوە نوێژەکانی بەوشێوەیە بەجێ بهێنێت کە فەرمانی پێکراوە، بەڵام ئەگەر نەیتوانی هەر مەرجێك یان ڕکونێکی نوێژەکەی بەجێ بهێنێت لەسەری دەکەوێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ ١٦﴾(التَّغَابُن).

واتە: پارێزکاربن و لە خوا بترسن بە گوێرەی تواناتان.

و بوخاری لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((كَانَتْ بِي بَوَاسِيرُ، فَسَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الصَّلَاةِ، فَقَالَ: صَلِّ قَائِمًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَقَاعِدًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَعَلى جَنْبٍ)).

واتە: مایەسیریم هەبوو، پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد چۆن نوێژ بکەم؟ فەرمووی: بەپێوە نوێژ بکە، ئەگەر نەتوانی بە دانیشتنەوە نوێژ بکە، ئەگەر نەتوانی لەسەرلا نوێژ بکە.

بەڵام بۆ نوێژی سوننەت دەتوانێت بە دانیشتنەوە نوێژ بکات و نیوەی پاداشتی ئەو کەسەی دەست دەکەوێت کە بەپێوە نوێژ دەکات بوخاری لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنْ صَلَاةِ الرَّجُلِ قَاعِدًا، فَقَالَ: إِنْ صَلَّى قَائِمًا فَهُوَ أَفْضَلُ، وَمَنْ صَلَّى قَاعِدًا فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِ الْقَائِمِ، وَمَنْ صَلَّى نَائِمًا فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِ الْقَاعِدِ)).

---

(١). (الإجماع)(٤٢).

واتە: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد لە نوێژی کەسێك بە دانیشتنەوە، فەرمووی: ئەگەر بەپێوە نوێژ بکات باشترە بۆی، و هەرکەسێك بەدانیشتنەوە نوێژ بکات نیوەی پاداشتی ئەو کەسەی بۆ هەیە کە بەپێوە نوێژ دەکات، و هەرکەسێك بە ڕاکشانەوە نوێژ بکات نیوەی پاداشتی ئەو کەسەی بۆ هەیە کە بەدانیشتنەوە نوێژ دەکات.

کۆمەڵە کردار و ڕەفتارێکی تر هەیە کەلە فەرموودە صەحیحەکاندا هاتووە تێیاندا پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی لە کۆمەڵە کردار و ڕەفتارێك کردووە لە نوێژدا بەڵام نوسەر لەبەر درێژ نەبوونەوە ئاماژەی پێنەکردووە، بۆ نموونە: ئەبوداود لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ((أنَّ رسولَ اللهِ ﷺ نَهى عنِ السَّدلِ في الصَّلاةِ، وأن يغطِّيَ الرَّجلُ فاهُ)).

واتە: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ نەهیکردووە پۆشاکێك لەبەر بکرێت لە نوێژدا و بەخۆیەوە نەئاڵێنێت و ترسی کەوتن و دەرکەوتنی عەرەتی هەبێت، یان نەهیکردووە لە دەست نەگرتن یان درێژی پۆشاك بەشێوەیەك بچێتە خواری قولە پێکان، و نەهیکردووە پیاو لە نوێژدا سەر دەمی داپۆشێت.

## بَابُ صَلاةِ التَّطَوُّعِ

**وَهِيَ: أَربَعٌ قَبلَ الظُّهرِ، وَأَربَعٌ بَعدَهُ، وَأَربَعٌ قَبلَ العَصرِ، وَرَكعَتَانِ بَعدَ المَغرِبِ، وَرَكعَتَانِ بَعدَ العِشَاءِ، وَرَكعَتَانِ قَبلَ صَلاةِ الفَجرِ، وَصَلاةُ الضُّحَى، وَصَلاةُ اللَّيلِ وَأَكثَرُهَا ثَلاثَ عَشرَةَ رَكعَةٍ؛ يُوتِرُ فِي آخِرِهَا، وَتَحِيَّةُ المَسجِدِ، وَالاستِخَارَةُ، وَرَكعَتَانِ بَينَ كُلِّ أَذَانٍ وَإِقَامَةٍ.**

## بابەتی نوێژی سوننەت

**بریتییە لە: چوار ڕکات پێش نیوەڕۆ، و چوار ڕکات دوای نیوەڕۆ، و چوار ڕکات پێش عەسر، و دوو ڕکات دوای مەغریب، و دوو ڕکات دوای عیشا، و دوو ڕکات پێش نوێژی بەیانی، و نوێژی چێشتەنگاو، و شەونوێژ، و لای زۆری سیازدە ڕکاتە؛ کۆتاییەکەی بە تاك دەکات، و نوێژی سڵاوی مزگەوت (تحية المسجد)، و نوێژی ئیستخارە، و دوو ڕکات لە نێوان هەموو بانگ و قامەتێك.**

نوێژی سوننەت بەشێوەیەکی گشتی دوو جۆرە، سوننەتی ڕەها (تطوع مطلق)، و سوننەتی وابەستە (تطوع مقيد)، سوننەتی ڕەها هەموو نوێژێکە بۆنەیەکی تایبەتی نەبێت، و سوننەتی وابەستە هەموو نوێژێکی سوننەتە بۆنەیەکی دیاریکراوی هەبێت.

(**وَهِيَ: أَربَعٌ قَبلَ الظُّهرِ**) ئەو نوێژە سوننەتانەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام بووە لەسەری دوازدە ڕکاتە، مسلم لە ئوم حەبیبەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((مَنْ صَلَّى اثْنَتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً فِي يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ بُنِيَ لَهُ بِهِنَّ بَيْتٌ فِي الْجَنَّةِ؛ قَالَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ: فَمَا تَرَكْتُهُنَّ مُنْذُ سَمِعْتُهُنَّ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ)).

واتە: هەرکەسێك دوازدە ڕکات نوێژ بکات لە شەو و ڕۆژێکدا بەهۆی ئەو نوێژانەوە ماڵێکی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەکرێت؛ ئوم حەبیبە دەڵێت: لەو کاتەوە لە پێغەمبەری خوام ﷺ ئەو نوێژانەم واز لێ نەهێناوە.

و ترمزی لە عائیشەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ ثَابَرَ عَلَى ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً مِنَ السُّنَّةِ بَنَى اللهُ لَهُ بَيْتًا فِي الجَنَّةِ: أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَهَا، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ المَغْرِبِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ العِشَاءِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الفَجْرِ)).

واتە: هەرکەسێك بەردەوام بێت لەسەر ئەنجامدانی دوازدە ڕکاتی سوننەت، خوای پەروەردگار خانوویەکی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەکات، چوار ڕکات پێش نیوەڕۆ، و دوو ڕکات دوای نیوەڕۆ، و دوو ڕکات دوای مەغریب، و دوو ڕکات دوای عیشا، و دوو ڕکات پێش نوێژی بەیانی.

و بوخاری و مسلم لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((حَفِظْتُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ عَشْرَ رَكَعَاتٍ: رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَهَا، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ فِي بَيْتِهِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعِشَاءِ فِي بَيْتِهِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلَاةِ الصُّبْحِ)).

واتە: دە ڕکات نوێژ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فێربووم؛ دوو ڕکات پێش نیوەڕۆ، و دوو ڕکات دوای نوێژی نیوەڕۆ، و دوو ڕکات دوای نوێژی مەغریب لە ماڵی خۆی، و دوو ڕکات دوای نوێژی عیشا لە ماڵی خۆی، و دوو ڕکات پێش نوێژی بەیانی.

و بوخاری لە عائیشەوە ڕیوایەتی کردووە: ((أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ لَا يَدَعُ أَرْبَعًا قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الغَدَاةِ)).

واتە: بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز وازی نەدەهێنا لە چوار ڕکات پێش نیوەڕۆ، و دوو ڕکات پێش بەیانی.

ئەم چوار ڕکاتە لەبەر عوزر ئەگەر لە دەست بچێت قەزا دەکرێتەوە، ترمزی لە عائیشەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە: ((أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا لَمْ يُصَلِّ أَرْبَعًا قَبْلَ الظُّهْرِ صَلَّاهُنَّ بَعْدَهَا)).

واتە: بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر چوار ڕکاتی پێش نوێژی نیوەڕۆی نەکردایە دوای نیوەڕۆ دەیکردن.

(**وَأَربَعٌ بَعدَهُ**) ئەحمەد و خاوەن سونەنەکان لە ئوم حەبیبەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((مَنْ حَافَظَ عَلَى أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ قَبْلَ الظُّهْرِ وَأَرْبَعٍ بَعْدَهَا حَرَّمَهُ اللهُ عَلَى النَّارِ)).

واتە: هەرکەسێك پارێزگار لە ئەنجامدانی چوار ڕکات پێش نیوەڕۆ و چوار ڕکات دوای نیوەڕۆ بکات، خوای پەروەردگار سزادان و سوتاندانی بە ئاگری دۆزەخ حەرام کردووە.

و نەسائی لە ئوم حەبیبەی هاوسەری پێغەمبەری خواوە ﷺ ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((مَنْ رَكَعَ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ قَبْلَ الظُّهْرِ وَأَرْبَعًا بَعْدَهَا، حَرَّمَ اللهُ عزوجل لَحْمَهُ عَلَى النَّارِ؛ فَمَا تَرَكْتُهُنَّ مُنْذُ سَمِعْتُهُنَّ)).

واتە: هەرکەسێك چوار ڕکات پێش نیوەڕۆ و چوار ڕکات دوای نیوەڕۆ بکات، خوای باڵادەست سوتانی گۆشتی لەشی لەسەر ئاگر حەرام دەکات؛ لەو کاتەوە بیستوومە وازم لێ نەهێناوە.

و ئەگەر کەسێك لەبەر عوزرێك سوننەتی دوای نوێژی نیوەڕۆی لە دەست بچێت دەتوانێت دوای نوێژی عەسر قەزای بکاتەوە، بوخاری و مسلم لە ئوم سەلەمەوە ڕیوایەتیان کردووە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردووە کاتێك دوو ڕکات نوێژی لە دوای عەسرەوە کردووە، فەرموویەتی: ((يَا بِنْتَ أَبِي أُمَيَّةَ، سَأَلْتِ عَنِ الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعَصْرِ، إِنَّهُ أَتَانِي نَاسٌ مِنْ عَبْدِ الْقَيْسِ بِالْإِسْلَامِ مِنْ قَوْمِهِمْ فَشَغَلُونِي عَنِ الرَّكْعَتَيْنِ اللَّتَيْنِ بَعْدَ الظُّهْرِ فَهُمَا هَاتَانِ)).

واتە: ئەی کچی ئەبوئومەیە، پرسیاری ئەو دوو ڕکاتەی دوای نوێژی عەسرت کرد، کەسانێك لە عبدالقیس لای هۆزەکەیانەوە هاتن بۆ لام خەریکیان کردم نەمتوانی ئەو دوو ڕکاتە لە دوای نوێژی نیوەڕۆوە بکەم، ئەمە ئەو دوو ڕکاتەیە.

نوسەر ئاماژەی بۆ نوێژی جومعە نەکردووە لە باسی نوێژە سوننەتەکاندا، لە پێش نوێژدا هیچ بەڵگەیەکی صەحیح نەهاتووە بەڵگە بێت لەسەر نوێژێکی تایبەت و وابەستە، بەڵام بە ڕهایی سوننەتە موسڵمان کاتێك دەچێت بۆ مزگەوت نوێژ بکات هەتاکو ئیمام دەچێتە سەرمینبەر، بوخاری لە سەلمانی فارسییەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَتَطَهَّرَ بِمَا اسْتَطَاعَ مِنْ طُهْرٍ، ثُمَّ ادَّهَنَ أَوْ مَسَّ مِنْ طِيبٍ، ثُمَّ رَاحَ فَلَمْ يُفَرِّقْ

بَيْنَ اثْنَيْنِ، فَصَلَّى مَا كُتِبَ لَهُ، ثُمَّ إِذَا خَرَجَ الْإِمَامُ أَنْصَتَ، غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الْأُخْرَى)).

واتە: هەرکەسێك ڕۆژی هەینی خۆی بشوات، و چەند دەتوانێت خۆی پاکوخاوێن بکاتەوە، پاشان سەر و ڕیشی چەور بکات یان خۆی بۆنخۆش بکات، پاشان بچێت بۆ نوێژ و دوو کەس کە پێوە دانیشتبن لە یەکیان جیانەکاتەوە و لە نێوانیاندا دانەنیشێت، و نوێژ بکات ئەوەند بۆی نوسراوە، پاشان ئەگەر ئیمام هات بۆ گوتار خوێندن بێدەنگ بێت، خوا لە تاوانەکانی نێوان ئەم هەینییە و هەینی ئایندەی خۆش دەبێت.

و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنِ اغْتَسَلَ ثُمَّ أَتَى الْجُمُعَةَ، فَصَلَّى مَا قُدِّرَ لَهُ، ثُمَّ أَنْصَتَ حَتَّى يَفْرُغَ مِنْ خُطْبَتِهِ، ثُمَّ يُصَلِّي مَعَهُ، غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الْأُخْرَى، وَفَضْلُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ)).

واتە: هەرکەسێك خۆی بشوات پاشان بچێت بۆ نوێژی جومعە، و نوێژ بکات ئەوەندەی بۆی نوسراوە، پاشان بێدەنگ بێت هەتاکو ئیمام گوتارەکەی تەواو دەکات، پاشان نوێژی لەگەڵدا بکات، خوا لە نێوان ئەم جومعەیە و جومعەی ئایندە لێی خۆش دەبێت، و فەزڵی سێ ڕۆژیش.

و ئەو فەرموودەیەی بوخاری و مسلم لە عبداللەی کوڕی موغەفەلەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلَاةٌ، بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلَاةٌ، ثُمَّ قَالَ فِي الثَّالِثَةِ: لِمَنْ شَاءَ)).

واتە: لە نێوان هەموو بانگ و قامەتێکدا نوێژ هەیە، لە نێوان هەموو بانگ و قامەتێکدا نوێژ هەیە، پاشان لە جاری سێیەمدا فەرمووی: بۆ هەرکەسێك بیەوێت.

بەڵگە نییە لەسەر نوێژی سوننەتی تایبەت یان وابەستە بە نوێژی جومعەوە، چونکە بوخاری لە سائبی کوڕی زەیدەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((إِنَّ الْأَذَانَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، كَانَ أَوَّلُهُ حِينَ يَجْلِسُ الْإِمَامُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ عَلَى الْمِنْبَرِ، فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ رضي الله عنهما...)).

واتە: بانگدان لە ڕۆژی جومعە سەرەتاکەی ئەو کاتە بوو کە ئیمام لەسەر مینبەر دادەنیشت، لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکر و عومەر رضي الله عنهما.

ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەوەی تێدایە ئیمام لە مزگەوت ئامادەبووە پاشان بانگدراوە و دوای بانگەکە هەستاوە دەستی بە گوتاردان کردووە، و هیچ نوێژێك لە نێوانەدا نەکراوە.

بەڵام دوای نوێژ جومعە، بوخاری و مسلم لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الجُمُعَةِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ المَغْرِبِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ العِشَاءِ)).

واتە: دوو ڕکات نوێژم کرد پێش نیوەڕۆ لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ، و دوو ڕکات دوای نیوەڕۆ، و دوو ڕکات دوای جومعە، و دوو ڕکات دوای مەغریب، و دوو ڕکات دوای عیشا.

و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمُ الْجُمُعَةَ فَلْيُصَلِّ بَعْدَهَا أَرْبَعًا)).

واتە: هەرکەسێك لە ئێوە نوێژی جومعەی کرد با دوای نوێژی جومعە چوار ڕکات نوێژ بکات.

**(وَأَربَعٌ قَبلَ العَصرِ)** ئەحمەد و ئەبوداود و ترمزی لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((رَحِمَ اللهُ امْرَأً صَلَّى قَبْلَ العَصْرِ أَرْبَعًا)).

واتە: ڕەحمەتی خوا لەو کەسە بێت پێش نوێژی عەسر چوار ڕکات نوێژ دەکات.

و چەند فەرموودەیەك هاتووە ئەوەیان تێدا سەلماوە کە پێغەمبەری خوا دوای عەسر دوو ڕکات نوێژی کردووە، بوخاری و مسلم لە عائیشەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((مَا تَرَكَ رَسُولُ اللهِ ﷺ رَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعَصْرِ عِنْدِي قَطُّ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز وازی لەو دوو ڕکات نوێژە نەدەهێنا لە دوای عەسرەوە لای من.

و بوخاری و مسلم لە عائیشەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((رَكْعَتَانِ لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَدَعُهُمَا سِرًّا وَلَا عَلَانِيَةً، رَكْعَتَانِ قَبْلَ صَلَاةِ الصُّبْحِ، وَرَكْعَتَانِ بَعْدَ الْعَصْرِ)).

واتە: دوو ڕکات پێغەمبەری خوا ﷺ وازی لێ نەدەهێنا نەبە پەنهان و نەبە ئاشکرا، دوو رکات پێش نوێژی بەیانی، و دوو ڕکات دوای عەسر.

و ئەو فەرموودەیە بوخاری لە موعاوییەوە ڕیوایەتی کردووە و دەڵێت: ((إِنَّكُمْ لَتُصَلُّونَ صَلَاةً، لَقَدْ صَحِبْنَا رَسُولَ اللهِ ﷺ فَمَا رَأَيْنَاهُ يُصَلِّيهَا، وَلَقَدْ نَهَى عَنْهُمَا))؛ يَعْنِي: الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعَصْرِ.

واتە: بەڕاستی ئێوە نوێژێك دەكەن، ئێمە هاوەڵی پێغەمبەری خوامان ﷺ كردووە نەمانبینی ئەو دوو ڕكات نوێژە بكات، و بێگومان نەهی لێكردووە؛ واتە: دوو ڕكاتەكەی دوای عەسر.

هەندێك زانایان دەڵێن: ڕێسایەكی فقهی هەیە دەڵێت: (مَنْ عَلِمَ حُجَّةٌ عَلَى مَنْ لَمْ يَعْلَمْ)، واتە: هەركەسێك شتێك بزانێت حوجە و بەڵگەیە بەسەر ئەو كەسەوە كە نەیزانێت، كەواتە عائیشەی دایكی باوەڕداران ئەوەی زانیوە و موعاوییە نەیزانیوە.

و ئەوەی دەڵێت: ((وَلَقَدْ نَهَى عَنْهُمَا)) كە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهیكردووە، بۆ ڕێگاگرتن بووە لەوەی خەڵك ئەو دوو ڕكات نوێژە دوابخەن هەتاكو نزیكی زەردبوونی خۆر كە نەهیكراوە نوێژی تێدا بكرێت، ئەبوداود و ئیبن حبان لە عەلییەوە ڕیوایەتیان كردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((لَا تُصَلُّوا بَعْدَ الْعَصْرِ، إِلَّا أَنْ تُصَلُّوا وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ)).

واتە: نوێژ مەكەن دوای عەسر، مەگەر نوێژ بكەن لە كاتێكدا كە خۆر بەرزە و زەرد نەبووە.

و ئیسحاقی كوڕی ڕاهوییە لە شورەیحەوە ڕیوایەتی كردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((سَأَلْتُ عَائِشَةَ عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ كَيْفَ كَانَ يُصَلِّي؟ فَقَالَتْ: كَانَ يُصَلِّي الْهَجِيرَ ثُمَّ يُصَلِّي بَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ يُصَلِّي الْعَصْرَ ثُمَّ يُصَلِّي بَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ، قُلْتُ: فَقَدْ كَانَ عُمَرُ يَضْرِبُ عَلَيْهِمَا وَيَنْهَى عَنْهُمَا، فَقَالَتْ: كَانَ عُمَرُ رضي الله عنه يُصَلِّيهِمَا وَقَدْ عَلِمَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّيهِمَا، وَلَكِنَّ قَوْمَكَ أَهْلَ

اليَمَن قَوْمٌ طَغَامٌ يُصَلُّونَ الظُّهْرَ ثُمَّ يُصَلُّون مَا بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، وَيُصَلُّونَ الْعَصْرَ ثُمَّ يُصَلُّونَ مَا بَيْنَ الْعَصْرِ وَالْمَغْرِبِ، فَضَرَبَهُمْ عُمَرُ وَقَدْ أَحْسَنَ)).

واته: پرسیام کرد لە عائیشە دەبارەی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن نوێژ دەکرد؟ گوتی: نوێژی نیوەڕۆی دەکرد پاشان دوای ئەوە دوو ڕکات نوێژی دەکرد، پاشان نوێژی عەسر دەکرد پاشان دوای ئەوە دوو ڕکات نوێژی دەکرد، گوتم: بێگومان عمر لەو کەسەی دەدا کە ئەو دوو ڕکات نوێژەی دەکرد و نەهی لێ دەکرد،گوتی: عمر رضي الله عنه ئەو دوو ڕکات نوێژەی دەکرد، و دەیزانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو دوو ڕکات نوێژەی دەکرد، بەڵام قەومەکەی تۆ خەڵکی یەمەن خەڵکێکی خراپن، نوێژی نیوەرۆ دەکەن پاشان لە نێوان نیوەرۆ و عەسردا نوێژ دەکەن، و نوێژی عەسر دەکەن پاشان لە نێوان عەسر و مەغریبدا نوێژ دەکەن، عومەر لەسەر ئەوە لێیدان و کارێکی باشی کرد کە لەسەر ئەوەی لێیدان.

(**وَرَكعَتَانِ بَعدَ المَغرِبِ**) لە فەرموودەکەی عائیشە پێشتر باسکرا تێیدا هاتبوو: ((مَنْ ثَابَرَ عَلَى ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً مِنَ السُّنَّةِ... وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ))؛ هەروەها فەرموودەکەی ئیبن عومەر کە تێیدا هاتبوو: ((حَفِظْتُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ عَشْرَ رَكَعَاتٍ؛... وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ فِي بَيْتِهِ)).

و جەختکراوەتەوە لە ئەنجامدانی ئەم دوو ڕکاتە لەماڵەوە وەك هەموو سوننەکانی تر، ترمزی و نەسائی و ئیبن ماجە لە کە کەعبی کوڕی عوجرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ فِي مَسْجِدِ بَنِي عَبْدِ الْأَشْهَلِ الْمَغْرِبَ، فَقَامَ نَاسٌ يَتَنَفَّلُونَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: عَلَيْكُمْ بِهَذِهِ الصَّلَاةِ فِي الْبُيُوتِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی مەغریبی لە مزگەوتی بەنوعبدالأشهەل کرد، دوای ئەوە خەڵك هەستان نوێژی سوننەتیان کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەم سوننەتە لەماڵەوە بکەن.

و دروستە دوای مەغریب نوێژ لە مزگەوت بکرێت و زیاتر لەو دوو ڕکاتەش نوێژ بکرێت، ترمزی لە حوزەیفەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە: ((أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى المَغْرِبَ فَمَا زَالَ يُصَلِّي فِي المَسْجِدِ حَتَّى صَلَّى العِشَاءَ الآخِرَةَ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی مەغریبی، بەردەوام نوێژی دەکرد لە مزگەوتدا هەتاکو نوێژی عیشای کرد.

ترمزی دوای فەرموودەکە دەڵێت: (فَفِي هَذَا الْحَدِيثِ دِلَالَةٌ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ المَغْرِبِ فِي المَسْجِدِ)[1].

واتە: ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەوەی تێدایە پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات نوێژی دوای مەغریبی لە مزگەوتدا کردووە.

و نەسائی لە (السنن الكبرى) لە حوزەیفەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَصَلَّيْتُ مَعَهُ الْمَغْرِبَ فَصَلَّى إِلَى الْعِشَاءِ)).

واتە: هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، نوێژی مەغریبم لەگەڵدا کرد، هەتاکو نوێژی عیشا نوێژی کرد.

---

(١). (سنن الترمذي)(٢/٥٠٠).

بەڵام ئەو فەرموودەیەی ترمزی لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ صَلَّى بَعْدَ المَغْرِبِ سِتَّ رَكَعَاتٍ لَمْ يَتَكَلَّمْ فِيمَا بَيْنَهُنَّ بِسُوءٍ عُدِلْنَ لَهُ بِعِبَادَةِ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ سَنَةً))؛ ئەلبانی لە (سنن الترمذي)دا بە (ضعيف جدا)ی داناوە.

و ئەو فەرموودەیەی ئیبن ئەبوشەیبە و عبدالرزاق لە مەکحولەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ صَلَّى بَعْدَ الْمَغْرِبِ قَبْلَ أَنْ يَتَكَلَّمَ رَكْعَتَيْنِ وَفِي رِوَايَةٍ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ رُفِعَتْ صَلَاتُهُ فِي عِلِّيِّينَ))؛ ئەلبانی لە (ضعيف الترغيب والترهيب)دا بە زەعیفی داناوە.

و سوننەتە هەندێك جار دوو ڕکات نوێژ پێش مەغریب بکرێت، بوخاری لە عبداللەی کوڕی موغەفەلەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((صَلُّوا قَبْلَ الْمَغْرِبِ، صَلُّوا قَبْلَ الْمَغْرِبِ، ثُمَّ قَالَ فِي الثَّالِثَةِ: لِمَنْ شَاءَ، كَرَاهِيَةَ أَنْ يَتَّخِذَهَا النَّاسُ سُنَّةً)).

واتە: پێش مەغریب نوێژ بکەن، پێش مەغریب نوێژ بکەن، لە جاری سێیەمدا فەرمووی: بۆ هەرکەسێك ویستی، لە ترسی ئەوەی خەڵك وەك سوننەتێکی جەخت لێکراو بەردەوام ئەنجامی بدەن.

و لەبەر کەمی کات هاوەڵان ئەو دوو ڕکات نوێژەیان لە مزگەوت کردووە، بوخاری لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((كَانَ الْمُؤَذِّنُ إِذَا أَذَّنَ، قَامَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ يَبْتَدِرُونَ السَّوَارِيَ، حَتَّى يَخْرُجَ النَّبِيُّ ﷺ وَهُمْ كَذَلِكَ، يُصَلُّونَ الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْمَغْرِبِ، وَلَمْ يَكُنْ بَيْنَ الْأَذَانِ وَالْإِقَامَةِ شَيْءٌ)).

واتە: ئەگەر بانگدەر بدایەت، کەسانێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ خێرا دەچوونە پشتی پایەکان، هەتاکو پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵ دەردەچوو بۆ نوێژ، پێش مەغریب دوو ڕکات نوێژیان دەکرد، و لە نێوان بانگدان و قامەتکردندا کاتێکی کەم بوو.

و مسلم لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((كُنَّا بِالْمَدِينَةِ، فَإِذَا أَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ لِصَلَاةِ الْمَغْرِبِ ابْتَدَرُوا السَّوَارِيَ فَيَرْكَعُونَ رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، حَتَّى إِنَّ الرَّجُلَ الْغَرِيبَ لَيَدْخُلُ الْمَسْجِدَ فَيَحْسِبُ أَنَّ الصَّلَاةَ قَدْ صُلِّيَتْ مِنْ كَثْرَةِ مَنْ يُصَلِّيهِمَا)).

واتە: ئێمە لە مەدینە بووین ئەگەر بانگدەر بانگی بدایەت بۆ نوێژی مەغریب، خێرا دەچوونە پشتی پایەکان دوو ڕکات نوێژیان دەکرد، هەتاکو ئەگەر کەسێکی نامۆ بهاتایەتە نێو مزگەوتەوە وایدەزانی نوێژی مەغریب تەوابووە لەبەر زۆری ئەو کەسانەی کە ئەو دوو ڕکاتە نوێژەیان دەکرد.

(**وَرَكعَتَانِ بَعدَ العِشَاءِ**) لە فەرموودەکەی عائیشە پێشتر باسکرا تێیدا هاتبوو: ((مَنْ ثَابَرَ عَلَى ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً مِنَ السُّنَّةِ... ورَكْعَتَيْنِ بَعْدَ العِشَاءِ))؛ هەروەها فەرموودەکەی ئیبن عومەر کە تێیدا هاتبوو: ((حَفِظْتُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ عَشرَ رَكَعَاتٍ؛... ورَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعِشَاءِ فِي بَيْتِهِ)).

هەندێك ئەسەر هاتووە هانی موسڵمانان دەدات چوار ڕکات دوای نوێژی عیشا بکرێت، محمدی کوڕی نەصری مەروەزی لە عبداللەی کوڕی عەمرەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: (مَنْ صَلَّى بَعْدَ الْعِشَاءِ الْآخِرَةِ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ كُنَّ كَعِدْلِهِنَّ مِنْ لَيْلَةِ الْقَدْرِ).

واتە: هەرکەسێك چوار ڕكات نوێژ دوای نوێژی عیشا بكات، هاوتای ئەوەیە چوار ڕكات نوێژی لە شەوانی قەدردا كردبێت[1].

و ئیبن ئەبوشەیبە لە ئیبن مەسعودەوە ڕیوایەتی كردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: (مَنْ صَلَّى أَرْبَعًا بَعْدَ الْعِشَاءِ لَا يَفْصِلُ بَيْنَهُنَّ بِتَسْلِيمٍ، عَدَلْنَ بِمِثْلِهِنَّ مِنْ لَيْلَةِ الْقَدْرِ).

واتە: هەرکەسێك چوار ڕكات نوێژ دوای عیشا بكات و لە نێوانیاندا سەلام نەداتەوە، هاوتای چوار ڕكات نوێژن كەلە شەوی قەدردا ئەنجامدرا بێت.

(**وَرَكعَتَانِ قَبلَ صَلاةِ الفَجرِ**) ئەم دوو ڕكات نوێژە پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر گرنكی پێداوە، بەجۆرێك نەلە سەفەر و نەلە شاریشدا وازی لێ نەهێناوە،

---

(١). دوای ڕیوایەتكردنی ئەو ئەسەرە محمدی كوڕی نەصر دەڵێت: (وَعَنْ عَلْقَمَةَ وَالْأَسْوَدِ وَمُجَاهِدٍ وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْأَسْوَدِ: (مَنْ صَلَّى أَرْبَعًا بَعْدَ الْعِشَاءِ كُنَّ كَمِثْلِهِنَّ مِنْ لَيْلَةِ الْقَدْرِ أَوْ يَعْدِلْنَ بِمِثْلِهِنَّ مِنْ لَيْلَةِ الْقَدْرِ أَوْ كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِهِنَّ لَيْلَةَ الْقَدْرِ)؛ وَعَنِ الْقَاسِمِ بْنِ أَبِي أَيُّوبَ: (كَانَ سَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ يُصَلِّي بَعْدَ الْعِشَاءِ الْآخِرَةِ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ فَأُكَلِّمُهُ فَمَا يُرَاجِعُنِي الْكَلَامَ)؛ وَعَنْ كَعْبٍ: (مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ ثُمَّ صَلَّى الْعِشَاءَ، وَصَلَّى بَعْدَهَا أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ يُحْسِنُ رُكُوعَهُنَّ وَسُجُودَهُنَّ، وَيَعْلَمُ مَا يَقْتَرِئُ فِيهِنَّ كُنَّ لَهُ بِمَنْزِلَةِ لَيْلَةِ الْقَدْرِ)(مختصر قيام الليل وقيام رمضان وكتاب الوتر)(٩٢).

ئەلبانی لەسەر ئەسەرەكەی عبداللەی كوڕی عەمر كە مەروەزی ڕیوایەتی كردووە، دەڵێت: ئیبن ئەبوشەیبە هاوشێوەی ئەوەی لە عائیشە و ئیبن مەسعود و كەعبەی كوڕی ماتع و موجاهید و عبدالرحمانی كوڕی ئەسودەوە بە مەوقوفی ڕیوایەتی كردووە، و هەموو سەنەدەكانی صەحیحە، جگە لە ئەسەرەكەی كەعب؛ ئەم ئەسەرانە ئەگەرچی مەقوفون بەڵام حوكمی مەرفوعیان هەیە، چونكە بە ڕەئی ناگوترێن.(سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة وأثرها السيئ في الأمة)(١٠٣/١١).

بوخاری و مسلم لە عائیشەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((لَمْ يَكُنِ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى شَيْءٍ مِنَ النَّوَافِلِ أَشَدَّ تَعَاهُدًا مِنْهُ عَلَى رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بەهیچ نوێژێکی سوننەتەوە توند پابەند نەبوو و ڕەچاوی نەدەکرد وەك دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی.

و مسلم لە حەفصەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ لَا يُصَلِّي إِلَّا رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ئەگەر سپێدە دەربچووایە تەنها دوو ڕکات نوێژی کورتی دەکرد.

و بوخاری لە عائیشەوە ڕیوایەتی کردووە: ((أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ لَا يَدَعُ أَرْبَعًا قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الغَدَاةِ)).

واتە: بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز وازی نەدەهێنا لە چوار ڕکات پێش نیوەڕۆ، و دوو ڕکات پێش بەیانی.

و مسلم عائیشەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((رَكْعَتَا الْفَجْرِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا)).

واتە: دوو ڕکاتە سوننەتەکەی نوێژی بەیانی باشترە لە دونیا و هەموو ئەوەتێدایە و لەسەریەتی.

(**وَصَلاةُ الضُّحَى**) نوێژی چێشتەنگاو سوننەتە، و کاتەکەی لە بەرزبوونەوەی خۆرەوە بە ئەندازەی ڕمێك دەستپێدەکات هەتاکو خۆر دەگاتە ناوەڕاستی ئاسمان کە ماوەیەکی کەمە پێش کاتی نوێژی نیوەڕۆ، تەبەرانی لە عبداللەی کوڕی

غابرەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە (حسن لغیرە) داناوە، دەڵێت: ئەبوئومامە و عوتبەی کوڕی عەبد بۆیان باسکردووە دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((مَنْ صَلَّى صَلاَةَ الصُّبْحِ فِي جَمَاعَةٍ ثُمَّ ثَبَتَ حَتَّى يُسَبِّحَ لِلَّهِ سُبْحَةَ الضُّحَى؛ كَانَ لَهُ كَأَجْرِ حَاجٍّ وَمُعْتَمِرٍ، تَامًّا لَهُ حَجَّهُ وَعُمْرَتَهُ)).

واتە: هەرکەسێك نوێژی بەیانی بە کۆمەڵ بکات، پاشان لە مزگەوت بمێنێتەوە هەتاکو نوێژ چێشتەنگاو دەکات؛ پاداشتی حاجی و عومەرەکارێکی بۆ هەیە بە تەواوی.

و ترمزی لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ صَلَّى الغَدَاةَ فِي جَمَاعَةٍ ثُمَّ قَعَدَ يَذْكُرُ اللهَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، كَانَتْ لَهُ كَأَجْرِ حَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ تَامَّةٍ تَامَّةٍ تَامَّةٍ)).

واتە: هەرکەسێك نوێژی بەیانی بە کۆمەڵ بکات پاشان دابنیشێت زیکری خوا بکات هەتاکو خۆر هەڵدێت، پاشان دوو ڕکات نوێژ بکات، پاداشتی حەج و عومەرەیەکی تەواو تەواو تەواوی بۆ هەیە.

و مسلم لە ئەبوزەڕەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((يُصْبِحُ عَلَى كُلِّ سُلاَمَى مِنْ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ... وَيُجْزِئُ مِنْ ذَلِكَ رَكْعَتَانِ يَرْكَعُهُمَا مِنَ الضُّحَى)).

واتە: هەموو ڕۆژێك چاکەیەك لەسەر هەموو جومگەکانی هەرکەسێکتان پێویستە... و دوو ڕکات نوێژ چێشتەنگاو هەموو ئەو چاکانەی بۆ دەستەبەر دەکات.

و مسلم لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((خَرَجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَى أَهْلِ قُبَاءَ وَهُمْ يُصَلُّونَ فَقَالَ: صَلاَةُ الْأَوَّابِينَ إِذَا رَمِضَتِ الْفِصَالُ))؛ فِي رِوَايَةِ أَبِي عَوَانَةَ: ((دَخَلَ نَبِيُّ اللهِ ﷺ مَسْجِدَ قُبَاء بَعْدَمَا أَشْرَقَتِ الشَّمْسُ، فرآهم يَصلُونَ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت بۆ لای خەڵکی قوبا دوای ئەوەی خۆرهەڵاتبوو، بینی نوێژی چێشتەنگاو دەکەن، فەرموو: نوێژی تەوبەکاران ئەو کاتەیە کە بێچوو حوشترەکان هەست بە گەرمی بکەن و پێیان گەرم ببێت.

لای کەمی نوێژی چێشتەنگاو دوو ڕکاتە و زانایان ناکۆکن بۆ لای ژووری، جمهوری زانایان بۆچوونیان وایە هەشت ڕکاتە، مسلم لە ئوم هانیئەوە ڕیوایەتی کردووە لە فەتحی مەککەدا پێغەمبەری خوا ﷺ: ((صَلَّى ثَمَانَ رَكَعَاتٍ سُبْحَةَ الضُّحَى)).

واتە: هەشت ڕکات نوێژی سوننەتی چێشتەنگاوی کردووە.

و هەندێك دەڵێن: دوازدە ڕکاتە، تەبەرانی لە ئەبودەردائەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ صَلَّى الضُّحَى رَكْعَتَيْنِ لَمْ يُكْتَبْ مِنَ الْغَافِلِينَ، وَمَنْ صَلَّى أَرْبَعاً كُتِبَ مِنَ الْعَابِدِينَ، وَمَنْ صَلَّى سِتاً كُفِيَ ذَلِكَ الْيَوم، وَمَنْ صَلَّى ثَمَانِياً كَتَبَهُ اللهُ مِنَ القَانِتِينَ، وَمَنْ ثِنْتَي عَشْرَةَ رَكْعَةً بَنَى اللهُ بَيْتاً فِي الَجَنَّةِ))[1].

---

(١). مال الألباني إلى تحسينه في حديث رقم: (٦٤٣٥) في: (سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة وأثرها السيئ في الأمة)(٩٧٥/١٣).

واتە: هەركەسێك دوو ڕكات چێشتەنگاو بكات لە بێئاگاكان نانوسرێت، و هەركەسێك چوار ڕكات بكات لە پەرستشكارەكان دەنوسرێت، و هەركەسێك شەش ڕكات بكات ئەو ڕۆژە بەسییەتی، و هەركەسێك هەشت ڕكات بكات لەو كەسانە دەنوسرێت كە بەردەوامن لەسەر پەرستش و گوێڕایەڵی خوا، و هەركەسێك دوازدە ڕكات بكات خوا خانوویەكی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەكات.

و هەندێك پێیان وایە لای ژووی دیاری نەكراوە بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیە مسلم لە موعازەوە ڕیوایەتی كردووە: ((أَنَّهَا سَأَلَتْ عَائِشَةَ ﵂ كَمْ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُصَلِّي صَلاَةَ الضُّحَى؟ قَالَتْ: أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ، وَيَزِيدُ مَا شَاءَ)).

واتە: پرسیار كردووە لە عائیشە ﵂ كردووە پێغەمبەری خوا ﷺ چەند ڕكات نوێژی چێشتەنگاوی دەكرد؟ گوتی: چوار ڕكاتی دەكرد، و چەندنی تری بویستایە زیادی دەكرد.

و ڕۆیشتن بۆ مزگەوت بۆ ئەنجامدانی نوێژی چێشتەنگاو پاداشتێكی زۆری هەیە، ئەبوداود لە ئەبوئومامەوە ڕیوایەتی كردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ خَرَجَ مِنْ بَيْتِهِ مُتَطَهِّرًا إِلَى صَلاَةٍ مَكْتُوبَةٍ فَأَجْرُهُ كَأَجْرِ الْحَاجِّ الْمُحْرِمِ، وَمَنْ خَرَجَ إِلَى تَسْبِيحِ الضُّحَى لاَ يَنْصِبُهُ إِلَّا إِيَّاهُ فَأَجْرُهُ كَأَجْرِ الْمُعْتَمِرِ)).

واتە: هەركەسێك بە دەستنوێژەوە لە ماڵ دەربچێت بۆ بەجێهێنانی نوێژی فەرز پاداشتی وەك حاجییەكە لە ئیحرامدا بێت، و هەركەسێك لە ماڵ دەربچێت بۆ

بەجێهێنانی سوننەتی چێشتەنگاو و تەنها ئەوە پاڵنەری بێت پاداشتی وەك پاداشتی عومرەکارێکە.

و سوننەتە ئەم زیکرە دوای نوێژ چێشتەنگاو بخوێندرێت، بوخاری لە (الأدب المفرد) لە عائیشەوە ڕیوایەتی کردووە وئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((صَلّى رَسُولُ الله ﷺ الضُّحى، ثُمَّ قالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، وتُبْ عَلَيَّ، إنَّكَ أنْتَ التَّوّابُ الرَّحِيمُ، حَتّى قالَها مِائَةَ مَرَّةٍ)).

واتە: پێغەمبەری خودا ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی کرد، پاشان فەرمووی: ((اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، وتُبْ عَلَيَّ، إنَّكَ أنْتَ التَّوّابُ الرَّحِيمُ)) هەتاکو سەد جار خوێندنی.

(**وَصَلاةُ اللَّيلِ وَأَكثَرُهَا ثَلاثَ عَشرَةَ رَكعَةٍ؛ يُوتِرُ فِي آخِرِهَا**) سوننەتێکی جەخت لێکراوەیە ئەحمەد و تەبەرانی لە ئەبوبەصرەی غیفارییەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إنَّ اللهَ زادَكُم صلاةً، وهي الوِترُ، فصلُّوها بينَ صلاةِ العشاءِ إلى صلاةِ الفجرِ)).

واتە: بەڕاستی خوای پەروەردگار نوێژێکی بۆ زیادکردوون کە نوێژی ویترە، لە نیوان نوێژی عیشا و بەیانیدا بەجێی بهێنن.

کاتی شەونوێژ لە دوای عیشاوە دەست پێدەکات هەتاکو پێش دەرکەوتنی سپێدەی ڕاستەقینە، ئەگەر کەسێك بزانێت لە شەودا لە خەو هەڵناسێت دەتوانێت دوای نوێژی عیشا شەونوێژ بکات، بەڵام ئەگەر بتوانێت لە شەو هەڵبسێت شەونوێژ بکات باشترە، مسلم لە جابرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری

خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ خَافَ أَنْ لَا يَقُومَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ فَلْيُوتِرْ أَوَّلَه، وَمَنْ طَمِعَ أَنْ يَقُومَ آخِرَهُ فَلْيُوتِرْ آخِرَ اللَّيْلِ، فَإِنَّ صَلاَةَ آخِرِ اللَّيْلِ مَشْهُودَةٌ، وَذَلِكَ أَفْضَلُ)).

واتە: هەرکەسێك ترسا کۆتایی شەو هەڵنەسێت سەرەتای شەو نوێژی ویترەکەی بکات، و هەرکەرسێك تەماحی هەبوو کۆتاییەکەی هەڵبسێت کۆتایی شەو ویترەکەی بکات، چونکە بەڕاستی نوێژی کۆتایی شەو فریشتەکان ئامادەیی دەبن، و ئەوە باشترە.

و شەو نوێژ بە چەند شێوەیەکی جیاواز دەکرێت کە بە درێژی لە فەرموودە صەحیحەکاندا هاتووە و باشترین نوێژە دوای نوێژە فەرزەکان، مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ الصِّيامِ بَعْدَ رَمَضانَ، شَهْرُ اللهِ الْمُحَرَّمُ، وأَفْضَلُ الصَّلاةِ بَعْدَ الفَرِيضَةِ، صَلاةُ اللَّيْلِ)).

واتە: باشترین ڕۆژوو دوای ڕۆژووی ڕەمەزان، ڕۆژووی مانگی موحەڕەمە، و باشترین نوێژ دوای نوێژی فەرز شەونوێژە.

ئیبن ڕەجەبی حەنبەلی دەڵێت: مەبەست ئەوەیە شەونوێژ لە هەموو نوێژە سوننەتە ڕەهاکان باشترە، نەوەك سوننەتە جەخت لێکراوەکان لای جمهوری زانایان، بە پێچەوانەی هەندێك لە شافعی مەزهەبەکانەوە[1].

( (١)). بڕوانە: (لطائف المعارف)(١٢٨).

زۆرترینی سیازدە ڕکاتە، بوخاری لە عائیشەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُصَلِّي بِاللَّيْلِ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، ثُمَّ يُصَلِّي إِذَا سَمِعَ النِّدَاءَ بِالصُّبْحِ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ شەو سیازدە ڕکات نوێژی دەکرد، پاشان دوای ئەوەی بانگی بەیانی ببیستایە دوو ڕکات نوێژی کورتی دەکرد.

و بوخاري و مسلم لە عائیشەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((مَا كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَزِيدُ فِي رَمَضَانَ وَلَا فِي غَيْرِهِ عَلَى إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕەمەزان و جگە لە ڕەمەزانیش زیاتر لە یازدە ڕکاتی نەکردووە.

ئەو دوو ڕکاتەی کە جیاوازە لە دوو فەرموودەیە زانایان چەند بۆچوونێکیان هەیە لەبارەیەوە، لەوانەیە نزیکترینیان ئەوەبێت کە دەڵێت: ئەو دوو ڕکاتە دوو ڕکاتەکەی دوای نوێژی عیشایە، یان دوو ڕکات نوێژی کورتە شەونوێژی پێ دەست پێدەکرێت.

و کۆتایی شەونوێژەکەش بە ویتر کۆتای پێدەهێنێت، بوخاري و مسلم لە ئیبن عومەرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویت: ((اجْعَلُوا آخِرَ صَلَاتِكُمْ بِاللَّيْلِ وِتْرًا)).

واتە: نوێژەکەتان بە شەو بە ویتر کۆتایی پێ بهێنن.

و نابێت دوو ویتر لە شەوێکدا بکرێت، خاوەن سونەنەکان جگە لە ئیبن ماجە لە تەڵقی کوڕی عەلییەوە ڕوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویت: ((لَا وِتْرَانِ فِي لَيْلَةٍ)).

واتە: دوو نوێژی ویتر لە شەوێکدا نییە.

ترمزی لە دوای ڕیوایەتکردنی ئەو فەرموودەیە دەڵێت: زانایان ناکۆکن دەربارەی کەسێك سەرەتای شەو شەونوێژ بکات پاشان کۆتایی شەو هەڵبسێت، هەندێکیان لە زانانی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ و دوای ئەوانیش وادەبینن ویترەکەی هەڵبوەشێنێتەوە، و دەڵێن: ڕکاتێکی تری بۆ زیاد دەکات و چەندی تری بوێت نوێژ دەکات، پاشان لە کۆتایی نوێژەکەیدا نوێژی ویتر دەکات، چونکە دوو نوێژی ویتر لە شەوێکدا ناکرێت و ئەوە بۆچوونی ئیسحاقە؛ و هەندێك لە زانایانی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ و جگە لەوانیش دەڵێن: ئەگەر کەسێك سەرەتای شەو نوێژی ویتری کرد پاشان خەوت پاشان لە کۆتایی شەودا لە خەو هەڵبسێت چەندی بوێت نوێژ دەکات، و نوێژی ویترەکەی هەڵناوەشێنێتەوە، و ویترەکەی بەوشێوەیە دەهێڵێتەوە، و ئەوە بۆچوونی سوفیانی سەوری و مالکی کوڕی ئەنەس و ئیبن موبارەکە و ئەحمەدە، و ئەمە صەحیحترە، چونکە لە زیاتر لە ڕوویەکەوە ڕیوایەتکراوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ویتر نوێژی کردووە[(١)].

و ئەبوداود و نەسائی ئیبن حبان ئەو فەرموودەیان بەم شێوەیە لە قەیسی کوڕی تەڵقەوە ڕیوایەتکردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((زَارَنَا طَلْقُ بْنُ عَلِيٍّ فِي يَوْمٍ مِنْ رَمَضَانَ، وَأَمْسَى عِنْدَنَا، وَأَفْطَرَ، ثُمَّ قَامَ بِنَا اللَّيْلَةَ، وَأَوْتَرَ بِنَا، ثُمَّ انْحَدَرَ إِلَى مَسْجِدِهِ، فَصَلَّى بِأَصْحَابِهِ، حَتَّى إِذَا بَقِيَ الْوِتْرُ قَدَّمَ رَجُلًا، فَقَالَ: أَوْتِرْ بِأَصْحَابِكَ، فَإِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: لَا وِتْرَانِ فِي لَيْلَةٍ)).

(١). (سنن الترمذي)(٤٨٢/١).

واتە: تەڵقی کوڕی عەلی ڕۆژێکی ڕەمەزان سەردانی کردین، و شەو لامان مایەوە، و ڕۆژووەکەی شکاند، پاشان شەونوێژی بۆ کردین و نوێژی ویتری بۆ کردین، پاشان دابەزی بۆ مزگەوت و نوێژ بۆ هاوەڵانی کرد، هەتاکو ویترەکەی مایەوە پیاوێکی پێش خست، و گوتی: نوێژی ویتر بە هاوەڵەکانت بکە، چونکە من لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە دەیفەرموو: دوو نوێژی ویتر لە شەوێکدا نییە.

ئەم ئەسەرە بەڵگەیە کە ئەو هاوەڵە بەڕێزە شەونوێژ و ویتر کردووە پاشان نوێژی کردووە دوای ویترەکەی و ویترەکەی دووبارە نەکردەوە و هەڵینەوەشاندووەتەوە.

و ئەگەر کەسێك نوێژی ویتری لە بیربچێت یان خەوی لێ بکەوێت دەتوانێت لە ڕۆژدا قەزای بکاتەوە، ئەبوداود لە ئەبوسەعیدەوە ڕیوایەتی کردووە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ نَامَ عَنْ وِتْرِهِ أَوْ نَسِيَهُ فَلْيُصَلِّهِ إِذَا ذَكَرَهُ)).

واتە: هەرکەسێك بخەوێت نوێژی ویترەکەی نەکات یان لە بیری نەچێت با نوێژەکەی بکات ئەگەر بیری کەوتەوە.

و ئەگەر کەسێك خەوی لێ بکەوێت یان نەخۆش بێت و شەونوێژ یان هەندێك لە شەونوێژەکەی نەکات دەتوانێت هەتاکو پێش نیوەڕۆ نوێژەکەی بکات، مسلم لە عائیشەوە ڕیوایەتی کردووە: ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ إِذَا فَاتَتْهُ الصَّلَاةُ مِنَ اللَّيْلِ مِنْ وَجَعٍ أَوْ غَيْرِهِ صَلَّى مِنَ النَّهَارِ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر شەونوێژی لە شەودا لە دەست بچووایە لەبەر ئێش و ئازارێك یان هۆکاری تر، لە ڕۆژدا دوازدە ڕکات نوێژی دەکرد.

و مسلم لە عومەرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ نَامَ عَنْ حِزْبِهِ أَوْ عَنْ شَيْءٍ مِنْهُ، فَقَرَأَهُ فِيمَا بَيْنَ صَلَاةِ الْفَجْرِ وَصَلَاةِ الظُّهْرِ، كُتِبَ لَهُ كَأَنَّمَا قَرَأَهُ مِنَ اللَّيْلِ)).

واتە: هەرکەسێك خەوی لێ بکەوێت شەونوێژەکەی یان هەندێکی نەکات، لە نێوان نوێژی بەیانی و نوێژی نیوەڕۆدا نوێژەکەی بکات بۆی دەنوسرێت وەك ئەوەی لە شەودا نوێژەکەی کردبێت.

(**وَتَحِيَّةُ المَسجِدِ**) نوێژ سڵاوی مزگەوت نوسەر لە ڕیزی نوێژە سوننەتەکاندا هێناویەتی، بەڵام دەڵێت: زاهیرییەکان بە واجبی دەزانن و ئەوە بۆچوونێکی دوور نییە[1]؛ و بوخاری و مسلم لە ئەبوقەتادەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمْ الْمَسْجِدَ فَلَا يَجْلِسْ حَتَّى يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ)).

واتە: ئەگەر کەسێك لە ئێوە چووە مزگەوتەوە دانەنیشێت هەتاکو دوو ڕکات نوێژ دەکات.

نەوەوی دەڵێت: ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەوەی تێدایە نوێژی سڵاوی مزگەوت سوننەتە بە دوو ڕکات، و ئەمە سوننەتە بە کۆڕای موسڵمانانان، و قازی عیاز باسی ئەوەی کردووە لە داود و هاوەڵەنییەوە بە واجیان زانیوە، بەڕاشکاوی کەراهەتی ئەوەی تێدایە کەسێك لە مزگەوتدا دابنیشێت بەبێ ئەوەی نوێژ بکات[2].

---

(١). (الدراري المضية)(١/٩٧).

(٢). (المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج)(٥/٢٢٦).

و مسلم لە جابری کوڕی عبداللەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((جَاءَ سُلَيْكٌ الْغَطَفَانِيُّ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَرَسُولُ اللهِ ﷺ يَخْطُبُ، فَجَلَسَ، فَقَالَ لَهُ: يَا سُلَيْكُ قُمْ فَارْكَعْ رَكْعَتَيْنِ، وَتَجَوَّزْ فِيهِمَا؛ ثُمَّ قَالَ: إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ، فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ، وَلْيَتَجَوَّزْ فِيهِمَا)).

واتە: سولەیکی غەتەفانی ڕۆژی جومعە هات بۆ مزگەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ گوتاری دەخوێند، دانیشت، پێی فەرموو: ئەی سولەیك هەستە دوو ڕکات نوێژ بکە، و پەلە بکە لە نوێژەکەتدا؛ پاشان فەرمووی: ئەگەر کەسێك لە ئێوە هات بۆ مزگەوت لە ڕۆژی جومعەدا، و ئیمام گوتاری دەخوێند، دوو رکات نوێژ بکات و پەلە بکات و خێرا نوێژەکەی تەواو بکات.

(**وَالاستِخَارَةُ**) نوێژی ئیستخارە دوو ڕکاتە و سوننەتە ئەگەر کەسێك ویستی کارێکی گرنگ ئەنجام بدات و بە ئاسان بڕیاری بۆ نەدرێت ئەم دوو ڕکات نوێژە بکات، بوخاری لە جابرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((كَانَ رسول الله ﷺ يُعَلِّمُنَا الاسْتِخَارَةَ فِي الأمور كَمَا يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ، يَقُولُ: إِذَا هَمَّ أَحَدُكُمْ بِالْأَمْرِ، فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ مِنْ غَيْرِ الْفَرِيضَةِ، ثُمَّ لِيَقُلْ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ، وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ، وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ الْعَظِيمِ، فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلَا أَقْدِرُ، وَتَعْلَمُ وَلَا أَعْلَمُ، وَأَنْتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ، اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الْأَمْرَ خَيْرٌ لِي، فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي، أَوْ قَالَ: عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ، فَاقْدُرْهُ لِي وَيَسِّرْهُ لِي، ثُمَّ بَارِكْ لِي فِيهِ، وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الْأَمْرَ شَرٌّ لِي، فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي،

أوقال: فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ، فَاصْرِفْهُ عَنِّي وَاصْرِفْنِي عَنْهُ، وَاقْدُرْ لِي الْخَيرَ حَيْثُ كَانَ، ثُمَّ أرضني به؛ قال: ويسمي حاجته)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فێری نوێژی ئیستخارەی دەکرین لە هەموو ئیشوکارەکان وەك چۆن سورەتێك قورئانی فێردوکردین، و دەیفەرموو: ئەگەر کەسێك لە ئێوە ویستی کردەوەیەك ئەنجام بدات، دوو ڕکات نوێژ بکات کە فەرز نییە، پاشان بڵێت: ((اللَّهُمَّ إنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ، وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ، وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ الْعَظِيم، فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلَا أَقْدِرُ، وَتَعْلَمُ وَلَا أَعْلَمُ، وَأَنْتَ عَلَّامُ الْغُيُوب، اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الْأَمْرَ خَيْرٌ لِي، فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي، أَوْ قَالَ: عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ، فَاقْدُرْهُ لِي وَيَسِّرْهُ لِي، ثُمَّ بَارِكْ لِي فِيهِ، وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الْأَمْرَ شَرٌّ لِي، فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي، أوقال: فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ، فَاصْرِفْهُ عَنِّي وَاصْرِفْنِي عَنْهُ، وَاقْدُرْ لِي الْخَيرَ حَيْثُ كَانَ، ثُمَّ أرضني به))، و ناوی کردەوەیەکی دەهێنێت.

(**وَرَكعَتَانِ بَينَ كُلِّ أَذَانٍ وَإِقَامَةٍ**) لە نێوان هەموو بانگ و قامەتێکدا دوو ڕکات نوێژ سوننە، بوخاری و مسلم لە عبداللەی کوڕی موغەفەلەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((بَيْنَ كلِّ أَذَانَيْنِ صَلاةٌ، بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلاةٌ، ثُمَّ قَالَ فِي الثَّالِثَةِ: لِمَنْ شَاءَ)).

واتە: لە نێوان هەموو بانگ و قامەتێکدا نوێژ هەیە، لە نێوان هەموو بانگ و قامەتێکدا نوێژ هەیە، پاشان لە جاری سێیەمدا فەرمووی: بۆ هەرکەسێك بیەوێت.

چەند نوێژێکی سوننەت هاتووە نوسەر ئاماژەی بۆ نەکردوون، یەکەم: نوێژی تەوبەکردن: ئەحمەد و خاوەن سونەنەکان لە ئەبوبەکری صدیقەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، و ئەمە لەفزی ئەحمەدە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُذْنِبُ ذَنْبًا ثُمَّ يَتَوَضَّأُ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ يَسْتَغْفِرُ اللهَ لِذَلِكَ الذَّنْبِ، إِلَّا غَفَرَ لَهُ وَقَرَأَ هَاتَيْنِ الْآيَتَيْنِ: ﴿وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١١٠﴾﴾(النِّسَاء)، ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَـٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُواْ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٣٥﴾﴾(آل عيمران)).

واتە: هیچ کەسێك نییە تاوانێك ئەنجام بدات و دەستنوێژ بگرێت بە جوانی پاشان دوو ڕکات نوێژ بکات و داوای لێ خۆشبوون لە خوا بکات ئیللا خوا لێی خۆش دەبێت، پاشان ئەم دوو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١١٠﴾﴾(النِّسَاء)، ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَـٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُواْ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٣٥﴾﴾(آل عيمران).

دووەم نوێژی تەسبیح: ئەبوداود لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەباسی کوڕی عبدالمتلبی فەرموو: ((يَا عَبَّاسُ، يَا عَمَّاهُ، أَلَا أُعْطِيكَ، أَلَا أَمْنَحُكَ، أَلَا أَحْبُوكَ، أَلَا أَفْعَلُ بِكَ عَشْرَ خِصَالٍ، إِذَا أَنْتَ فَعَلْتَ ذَلِكَ غَفَرَ اللهُ لَكَ ذَنْبَكَ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ، قَدِيمَهُ وَحَدِيثَهُ، خَطَأَهُ وَعَمْدَهُ، صَغِيرَهُ وَكَبِيرَهُ، سِرَّهُ وَعَلَانِيَتَهُ، عَشْرَ خِصَالٍ: أَنْ تُصَلِّيَ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ تَقْرَأُ فِي

كُلِّ رَكْعَةٍ فَاتِحَةَ الْكِتَابِ وَسُورَةً، فَإِذَا فَرَغْتَ مِنَ الْقِرَاءَةِ فِي أَوَّلِ رَكْعَةٍ وَأَنْتَ قَائِمٌ، قُلْتَ: سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ لِلهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ، خَمْسَ عَشْرَةَ مَرَّةً، ثُمَّ تَرْكَعُ، فَتَقُولُهَا وَأَنْتَ رَاكِعٌ عَشْرًا، ثُمَّ تَرْفَعُ رَأْسَكَ مِنَ الرُّكُوعِ، فَتَقُولُهَا عَشْرًا، ثُمَّ تَهْوِي سَاجِدًا، فَتَقُولُهَا وَأَنْتَ سَاجِدٌ عَشْرًا، ثُمَّ تَرْفَعُ رَأْسَكَ مِنَ السُّجُودِ فَتَقُولُهَا عَشْرًا، ثُمَّ تَسْجُدُ، فَتَقُولُهَا عَشْرًا، ثُمَّ تَرْفَعُ رَأْسَكَ، فَتَقُولُهَا عَشْرًا، فَذَلِكَ خَمْسٌ وَسَبْعُونَ، فِي كُلِّ رَكْعَةٍ تَفْعَلُ ذَلِكَ فِي أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ، إِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ تُصَلِّيَهَا فِي كُلِّ يَوْمٍ مَرَّةً فَافْعَلْ، فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَفِي كُلِّ جُمُعَةٍ مَرَّةً، فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَفِي كُلِّ شَهْرٍ مَرَّةً، فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَفِي كُلِّ سَنَةٍ مَرَّةً، فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ، فَفِي عُمُرِكَ مَرَّةً)).

واتە: ئەی عەباس ئەی مامە، ئایا پێت نەبەخشم، ئایا شتێكت فێرنەكەم ئەگەر ئەنجامی بدەیت خوا لە دە جۆر تاوانت خۆش دەبێت: تاوانی سەرەتا و كۆتا، و كۆن و نوێ، هەڵە و ئەنقەست، گەورە و بچووك، و پەنهان و ئاشكرا، چوار ڕكات نوێژ بكە لە هەموو ڕكاتێكدا سورەتی الفاتحە و سورەتێكی تر بخوێنە، ئەگەر خوێندنی قورئانت تەواكرد لە كاتێكدا بە پێوە وەستاویت، بڵێ: (سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ لِلهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ) پازدە جار، پاشان ڕكوع ببە دە جار بیڵێ لە كاتێكدا لە ڕكوعدایت، پاشان سەرت لە ڕكوع بەرز بكەرەوە و دە جار بیڵێ، پاشان سوژدە ببە دە جار بیڵێ كاتێك لە سوژدەدایت، پاشان كاتێك سەرت لە سوژدە بەرز دەكەیتەوە دە جار بیڵێ، پاشان سوژدە ببە و دە جار بیڵێ، پاشان كاتێك سەرت لە سوژدە بەرز دەكەیتەوە دە جار بیڵێ، ئەوە حەفتا و پێنج جارە، لە هەر ڕكاتێكدا لە چوار ڕكاتەكە بەوشێوەیە بكە، ئەگەر توانیت هەموو ڕۆژێك

ئەنجامی بدەیت ئەنجامی بدە، ئەگەر ئەنجامت نەدا لە هەموو حەفتەیەکدا جارێك ئەنجامی بدە، ئەگەر ئەنجامت نەدا لە هەموو مانگێکدا جارێك ئەنجامی بدە، ئەگەر ئەنجامت نەدا لە هەموو ساڵێکدا جارێك ئەنجامی بدە، ئەگەر ئەنجامت نەدا لە تەمەنتدا جارێك ئەنجامی بدە.

سێیەم: دوو ڕکات نوێژ بۆ گەڕانەوە لە سەفەر: بوخاری و مسلم لە کەعبی کوڕی مالکەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەمە لەفزی مسلمە، دەڵێت: ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ لَا يَقْدَمُ مِنْ سَفَرٍ إِلَّا نَهَارًا فِي الضُّحَى، فَإِذَا قَدِمَ بَدَأَ بِالْمَسْجِدِ فَصَلَّى فِيهِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ جَلَسَ فِيهِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەفەر نەدەگەڕایەوە لە ڕۆژدا نەبووایە بە چێشتەنگاو، ئەگەر بگەیشتایە دەڕۆیشتە مزگەوت و دوو ڕکات نوێژی تێدا دەکرد، پاشان لە مزگەوت دادەنیشت.

چوارەم: دوو ڕکات نوێژ دوای دەستنوێژگرتن: مسلم لە عوقبەی کوڕی عامرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَتَوَضَّأُ فَيُحْسِنُ وُضُوءَهُ، ثُمَّ يَقُومُ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ مُقْبِلٌ عَلَيْهِمَا بِقَلْبِهِ وَوَجْهِهِ إِلَّا وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ)).

واتە: هیچ موسڵمانێك نییە دەستنوێژ بگرێت بە جوانی دەستنوێژەکەی بگرێت، پاشان هەستێت دوو ڕکات نوێژ بکات بە دڵ و بە گیان ئاگای لە نوێژەکەی بێت ئیللا بەهەشتی بۆ پێویست دەبێت.

و بوخاری و مسلم لە عوسمانەوە ڕیوایەتیان کردووە باسی دەستنوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((مَنْ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هَذَا، ثُمَّ قَامَ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ لَا يُحَدِّثُ فِيهِمَا نَفْسَهُ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)).

واتە: هەرکەسێك دەستنوێژ بگرێت وەك ئەم دەستنوێژەی من، پاشان هەستێت دوو ڕکات نوێژ بکات و بە نەفسی خۆیەوە خەریك نەبێت، خوای پەروەردگار لە تاوانی ڕابردووی خۆش دەبێت.

چوارەم: دوو ڕکات نوێژ بۆ لە ماڵ دەرچوون، و دوو ڕکات بۆ گەڕانەوە بۆ ماڵەوە: بەزار و دەیلەمی لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إذا دخَلْتَ منْزِلَك فصلِّ ركْعَتين يَمْنعانِك مَدخَل السُّوءِ، وإذا خَرجْت مِنْ منْزِلكَ فصلِّ رَكْعَتين يَمنعانِك مخرجَ السّوءِ)).

واتە: ئەگەر ڕۆیشتیتە ماڵەوە دوو ڕکات نوێژ بکە ڕێگری چوونەژوورەوەی خراپت لێ دەکەن، و ئەگەر لە ماڵ دەرچوویت دوو ڕکات نوێژ بکە ڕێگری دەرچوونی خراپت لێ دەکەن.

پێنجەم: دوو ڕکات دوای تەواف: ئیبن ماجە لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەلێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ طَافَ بِالْبَيْتِ سَبْعًا وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ كَانَ كَعِتْقِ رَقَبَةٍ)).

واتە: هەرکەسێك حەوت جار تەواف بە دەوری کەعبەدا بکات و دوو ڕکات نوێژ بکات وەك ئازادکردنی کۆیلەیەکە.

شەشەم: ڕۆیشت بۆ بەجێهێنانی دوو ڕکات نوێژ لە مزگەوت قوبا: بوخاری و مسلم لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَأْتِي مَسْجِدَ قُبَاءٍ رَاكِبًا وَمَاشِيًا، فَيُصَلِّي فِيهِ رَكْعَتَيْنِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەڕۆیشت بۆ مزگەوتی قوبا بە سواری و بە پیادە، دوو ڕکات نوێژی دەکرد.

و ترمزی و ئیبن ماجە لە ئوسەیدی کوڕی زوهەیری ئەنصارییەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((الصَلاَةُ فِي مَسْجِدِ قُبَاءٍ كَعُمْرَةٍ)).

واتە: نوێژکردنێك لە مزگەوتی قوبا پاداشتی عومەرەکردنێکی هەیە.

چەند پرسێك بەگشتی پەیوەست بە نوێژی سوننەتەوە، یەکەم: دروستە نوێژە سوننەتەکان لە مزگەوتدا بکرێن، بەڵام باشتروایە نوێژە سوننەتەکان بەشێوەیەکی گشتی لەماڵەوە بکرێن، جگە لەو نوێژانەی ئاماژەمان پێکرد لە مزگەزت دەکرێت وەك دوو ڕکاتەکەی پێش نوێژی مەغریب و نوێژ چێشتەنگاو، بوخاری و مسلم لە زەیدی کوری سابتەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەمە لەفزی بوخارییە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((صَلُّوا أَيُّهَا النَّاسُ فِي بُيُوتِكُمْ، فَإِنَّ أَفْضَلَ صَلاَةِ الْمَرْءِ فِي بَيْتِهِ إِلَّا الصَّلاَةَ الْمَكْتُوبَةَ)).

واتە: ئەی خەڵكینە نوێژ لە ماڵەكانتان بكەن، چونكە بەڕاستی باشترین نوێژی مرۆڤ ئەو نوێژەیە لە ماڵەوە دەیكات جگە لە نوێژە فەرزەكان.

و دەیلەمی لە صوهەیبەوە ڕیوایەتی كردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((صَلَاةُ الرَّجُلِ تَطَوُّعًا حَيْثُ لَا يَرَاهُ النَّاسُ تَعْدِلُ صَلَاتَهُ عَلَى أَعْيُنِ النَّاسِ خَمْسًا وَعِشْرِينَ)).

واتە: نوێژی سوننەتی پیاو لە شوێنێك خەڵك نەیبینن، هاوتای بیست و پێنج هێندەی ئەو نوێژەیە كە خەڵك دەیبینن.

دووەم: نوێژە سوننەتەكانی شەو و ڕۆژ دوو ڕكات دوو ڕكاتە: ئەحمەد و خاوەن سونەنەكان و ئیبن حبان لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتیان كردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((صَلَاةُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ مَثْنَى مَثْنَى)).

واتە: نوێژی شەو و ڕۆژ دوو دووە.

بەڵام هەندێك دەق هاتووە بە ڕاشكاوی بەڵگەیە كە چوار ڕكات پێكەوە بكرێت و لە كۆتاییەكەیدا سەلام بدرێتەوە، نەسائی لە عاصمی كوڕی زەمرەوە ڕیوایەتی كردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ((سَأَلْتُ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ، عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي النَّهَارِ قَبْلَ الْمَكْتُوبَةِ، قَالَ: مَنْ يُطِيقُ ذَلِكَ؟ ثُمَّ أَخْبَرَنَا، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُصَلِّي حِينَ تَزِيغُ الشَّمْسُ رَكْعَتَيْنِ، وَقَبْلَ نِصْفِ النَّهَارِ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ، يَجْعَلُ التَّسْلِيمَ فِي آخِرِهِ)).

واتە: پرسیارم لە عەلی کوڕی ئەبوتالب کرد لە نوێژی سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ پێش نوێژی فەرز، گوتی: کێ دەتوانێت ئەوە بکات؟ پاشان هەواڵی پێداین گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەوەی خۆر لە ناوەراست ئاسمان لاردەبوویەوە دوو ڕکات نوێژی دەکرد، و پێش نیوەڕۆ چوار ڕکاتی دەکرد، سەلامەکەی دەخستە کۆتایی؛ ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەوەی تێدایە ئەو نوێژانەی چوار ڕکاتین دەتوانرێت بە یەك سەلام ئەنجام بدرێت.

چوارەم: نوێژی سوننەت لە سەفەردا: بوخاری و مسلم لە حەفصی کوڕی عاصمەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((صَحِبْتُ ابْنَ عُمَرَ فِي طَرِيقِ مَكَّةَ، قَالَ: فَصَلَّى لَنَا الظُّهْرَ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَقْبَلَ، وَأَقْبَلْنَا مَعَهُ، حَتَّى جَاءَ رَحْلَهُ، وَجَلَسَ، وَجَلَسْنَا مَعَهُ، فَحَانَتْ مِنْهُ الْتِفَاتَةٌ نَحْوَ حَيْثُ صَلَّى، فَرَأَى نَاسًا قِيَامًا، فَقَالَ: مَا يَصْنَعُ هَؤُلَاءِ؟ قُلْتُ: يُسَبِّحُونَ، قَالَ: لَوْ كُنْتُ مُسَبِّحًا لَأَتْمَمْتُ صَلَاتِي، يَا ابْنَ أَخِي، إِنِّي صَحِبْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فِي السَّفَرِ، فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ، حَتَّى قَبَضَهُ اللهُ، وَصَحِبْتُ أَبَا بَكْرٍ، فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ، حَتَّى قَبَضَهُ اللهُ، وَصَحِبْتُ عُمَرَ، فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ، حَتَّى قَبَضَهُ اللهُ، ثُمَّ صَحِبْتُ عُثْمَانَ، فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ، حَتَّى قَبَضَهُ اللهُ، وَقَدْ قَالَ اللهُ: ﴿لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ ٢١﴾(الأحزاب).

واتە: هاوڕایی ئیبن عومەرم کرد لە ڕێگای مەککە، نوێژی نیوەڕۆی کرد دوو ڕکات، پاشان ڕۆیشت و ئێمەش لەگەڵیدا ڕۆیشتن، هەتاکو ڕۆیشتە شوێنی مانەوەکەی دانیشت، و ئێمەش لەگەڵیدا دانیشتین، لایەکی کردەوە بەلای ئەو شوێنەدا کە نوێژ تێدا کرد، بینی کەسانێك بەپێوەن و نوێژ دەکەن، گوتی: ئەوانە

چی دەکەن؟ گوتم: نوێژی سوننەت دەکەن، گوتی: ئەگەر نوێژی سوننەتم بکردایە نوێژە فەرزەکەم بە تەواوی دەکرد و کورتم نەدەکردەوە، ئەی برازا، من هاوڕایی پێغەمبەری خوام ﷺ کرد لە سەفەردا، دوو رکات زیاتری نەدەکرد هەتاکو خوا ڕۆحی کێشا، پاشان هاوەڕایی ئەبوبەکرم کرد دوو ڕکات زیاتری نەدەکرد هەتاکو خوا ڕۆحی کێشا، و هاوڕایی عومەرم کردووە دوو ڕکات زیاتر نەدەکرد، هەتاکو خوا ڕۆحی کێشا، پاشان هاوڕایی عوسمان کرد دوو ڕکات زیاتر نەکرد هەتاکو خوا رۆحی کێشا، و خوای پەروەردگار فەرموویەتی: بێگومان پێغەمبەری خوا سەرمەشقێکی جوانە.

ئیبن تەیمییە دەڵێت: کەسی موسافر نوێژی ویتر و سوننەتی بەیانی دەکات، و سوننەتە جگە لەوانە نەکات، و باشترە جگە لە سوننەتە (راتبة)کان بکات، و هەندێکیان ئیجماعیان لەوبارەیەوە نەقڵکردووە[1].

پێنجەم: نوێژی سوننەت بە کۆمەڵ: جگە لە نوێژی تەراویح کە سوننەتە لە ڕەمەزاندا بە کۆمەڵ بکرێت، هەندێك جار سوننە نوێژی سوننەت بە کۆمەڵ بکرێت بە تایبەت ئەگەر بۆ مەبەستێك بێت وەك فێرکرن[2]، بوخاری و مسلم لە ئەنەسەوە ڕیوایەتیان کردووە: ((أَنَّ جَدَّتَهُ مُلَيْكَةَ دَعَتْ رَسُولَ اللهِ ﷺ لِطَعَامٍ صَنَعَتْهُ لَهُ، فَأَكَلَ مِنْهُ، ثُمَّ قَالَ: قُومُوا فَلأُصَلِّ لَكُمْ)).

---

(١). (مجموع الفتاوى)(٥/٣٥٠).

(٢). بڕوانە: (المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج)(٥/١٦٢).

واتە: مولەیکەی داپیری دەعوەتی پێغەمبەری خوای ﷺ کرد بۆ خۆراکێك کە دروستی کردبوو، لێی خوا، پاشان فەرمووی: هەستن بۆ ئەوەی نوێژتان بۆ بکەم.

شەشەم: پێویستە موسڵمان گرنگییە زۆر بە بەجێهێنانی نوێژە سوننەتەکان بدات، چونکە بەهۆیانەوە لای خوای پەروەردگار خۆشەویست دەبێت، بوخاری لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِنَّ الله تَعَالَى قَالَ: مَنْ عادى لي وَلِيًّا فَقَدْ آذَنْتُهُ بالحَرْبِ، وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدي بشَيءٍ أَحَبَّ إليَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيهِ، وَمَا يَزَالُ عَبْدِي يَتَقرَّبُ إليَّ بالنَّوافِلِ حَتَّى أحِبَّهُ)).

واتە: خوای پەروەردگار دەفەرموێت: هەرکەسێك دژایەتی خۆشەویستێکم بکات پێی ڕادەگەیەم من دژایەتی دەکەم، و بەندەکەم بەهیچ شتێك لێم نزیك نابێتەوە وەك نزیکبوونەوە بەهۆی بەجێهێنانی ئەوەی لەسەرم فەرزکردووە، و بەردەوام بەندەم بە ئەنجامدانی سوننەتەکان لێم نزیك دەبێتەوە هەتاکو خۆشم دەوێت.

حەوتەم: گرنگە موسڵمان کەمتەرخەمی نەکات لە بەجێهێنانی نوێژە سوننەتەکان بۆ ئەوەی ئەگەر کەموکورتییەکی هەبوو لە نوێژە فەرزەکانی خوای پەروەردگار لە نوێژە سوننەتەکان بۆی پڕ بکاتەوە، ئەحمەد و خاوەن سونەنەکان لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ النَّاسُ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ أَعْمَالِهِمُ الصَّلَاةُ، قَالَ: يَقُولُ رَبُّنَا جَلَّ وَعَزَّ لِمَلَائِكَتِه وَهُوَ أَعْلَمُ: انْظُرُوا فِي صَلَاةِ عَبْدِي أَتَمَّهَا أَمْ نَقَصهَا؟ فَإِنْ كَانَتْ تَامَّةً كُتِبَتْ لَهُ تَامَّةً، وَإِنْ كَانَ انْتَقَص مِنْهَا شَيْئًا،

قَالَ: انْظُرُوا هَلْ لِعَبْدِي مِنْ تَطَوُّعٍ؟ فَإِنْ كَانَ لَهُ تَطَوُّعٌ، قَالَ: أَتِمُّوا لِعَبْدِي فَرِيضَتَهُ مِنْ تَطَوُّعِهِ)).

واتە: یەکەم شت کە لێپرسینەوەی خەڵکی لەسەر دەکرێت لە ڕۆژی قیامەتدا لە کردەوەکانیان نوێژە، دەفەرموێت: خوای باڵادەست بە فریشتەکان دەفەرموێت و خۆی لە هەمووان زاناترە: بڕواننە نوێژی بەندەکەم ئایا بە تەواوی و ڕێکوپێکی بەجێیهێناون، یان کەمتەرخەمی کردووە و بە ناتەواوی ئەنجامیداون؟ ئەگەر بە تەواوی و ڕێکوپێکی بەجێی هێنابوون بەوشێوەیە بۆی دەنوسرێت، و ئەگەر لە هەندێکی کەمتەرخەمی کردبێت و بە ناتەواوی بەجێی هێنابێت، دەفەرموێت: بزانن بەندەکەم نوێژی سوننەتی هەیە؟ ئەگەر نوێژی سوننەتی هەبوو، دەفەرموێت: نوێژە فەرزەکانی بەندەکەم لە نوێژە سوننەتەکانی تەواو بکەن.

## بَابُ صَلاةِ الجَمَاعَةِ

هِيَ مِنْ آكَدِ السُّنَنِ، وَتَنعَقِدُ بِاثنَين، وَإذَا كَثُرَ الجَمْعُ كَانَ الثَّوَابُ أَكثَرَ، وَتَصِحُّ بَعدَ المَفضُولِ، وَالأَوْلَى أَن يَكُونَ الإِمَامُ مِن الخِيَارِ، وَيَؤُمُّ الرَّجُلُ بِالنِّسَاءِ لا العَكْسُ، وَالمُفتَرِضُ بِالمُتَنَفِّلِ وَالعَكْسُ، وَتَجِبُ المُتَابَعَةُ فِي غَيرِ مُبطِلٍ، وَلا يَؤُمُّ الرَّجُلُ قَومًا هُم لَهُ كَارِهُونَ، وَيُصَلِّي بِهِم صَلاةَ أَخَفِّهِم.

وَيُقَدَّمُ: السُّلطَانُ، وَرَبُّ المَنزِلِ، وَالأَقرَأُ، ثُمَّ الأَعلَمُ، ثُمَّ الأَسَنُّ، وَإِذَا اختَلَّت صَلَاةُ الإِمَامِ؛ كَانَ ذلِكَ عَلَيهِ لَا عَلَى المُؤتَمِّينَ بِهِ، وموقِفُهُم خَلفَهُ؛ إِلّا الوَاحِدَ فَعَنْ يَمِينِهِ.

وَإِمَامَةُ النِّسَاءِ وَسَطَ الصَّفِّ، وَتُقَدَّمُ: صُفُوفُ الرِّجَالِ، ثُمَّ الصِّبيَانِ، ثُمَّ النِّسَاءِ، وَالأَحَقُّ بِالصَّفِّ الأَوَّلِ أُولُو الأَحلَامِ وَالنُّهَى، وَعَلَى الجَمَاعَةِ أَن يُسَوُّوا صُفُوفَهُم، وَيَسُدُّوا الخَلَلَ، وَيُتِمُّوا الصَّفَّ الأَوَّلَ، ثُمَّ الَّذِي يَلِيهِ، ثُمَّ كَذلِكَ.

### بابەتی نوێژی بە کۆمەڵ

لە سوننەتە جەخت لێکراوەکانە، و بە دوو کەس دادەمەزرێت، و ئەگەر زۆرتربن پاداشتی زیاتر، و دروستە نوێژکردن لە دوای کەسیکەوە باشترین نەبێت (فەزڵ بەسەردادراو)(المفضول)، و پیاو پێشنوێژی بۆ ئافرەت دەکات نەوەك بە پێچەوانەوە، و کەسێك نوێژی فەرز بکات پێشنوێژی بۆ کەسێك دەکات کە نوێژی سوننەت دەکات و بە پێچەوانەشەوە، و پێویستە شوێنی پێشنوێژ بکەون و چاوی لێ بکەن لە کردەوەیەکدا نەبێت کە نوێژ پووچەڵ بکاتەوە، و کەسێك پێشنوێژی بۆ کۆمەڵێك ناکات کە پێیان ناخۆش بێت پێشنوێژییان بۆ بکات، و وەك نوێژی ئەو کەسەیان نوێژیان بۆ دەکات کە کورتترین نوێژ دەکات.

و کاربەدەست پێش دەخرێت، و خاوەن ماڵ، و ئەو کەسەی زۆرترین قورئانی لەبەرە، و ئەو کەسەی زاناترە، پاشان ئەو کەسەی بە تەمەنترە، و ئەگەر هەڵە و کەموکورتییەك لە نوێژی پێشنوێژەکەیدا هەبێت؛ ئەوە لەسەر پێشنوێژەکەیە و نوێژکەرەکانی پشتی هیچیان لەسەر نییە، و لە

**پشتییەوە دەوەستن؛ مەگەر تەنها کەسێك بێت ئەو کاتە لای ڕاستی پێشنوێژەکەوە دەوەستێت.**

**و پێشنوێژی ئافرەت لە ناوەڕاستی ڕیزەکەوە دەوەستێت، و ڕیزی پیاوان پێش دەخرێت، پاشان منداڵان، پاشان ئافرەتان، و ئەوانەی شایستەن بە ڕیزی یەکەم کەسانی عاقڵ و خاوەن زانستن، و پێویستە لەسەر نوێژکەران ڕیزەکانیان ڕێکبخەن، و بۆشاییەکان پڕبکەنەوە، و ڕیزی یەکەم تەواو بکەن پاشان ڕیزی دوای ئەوە، پاشان بە هەمان شێوە.**

(**صَلاةِ الجَمَاعَةِ هِيَ مِنْ آكَدِ السُّنَنِ**) نوێژی بە کۆمەڵ زانایان ناکۆکن لە بارەیەوە، جمهوری زانایان بە سوننەتی جەختلێکراوەی دەزانن، و هەندێك بە واجبی دەزانن و ئەوە بۆچوونی ئەحمەد و عەتا و ئەبوسەور و ئیسحاق و جگە لەوانیشە، و هەندێك بە فەرزی کیفایەی دەزانن و ئەوە یەکێکە لە بۆچوونەکانی شافعی، و هەندێك بە مەرجی نوێژی دەزانن و ئەوە بۆچوونی زاهیرییەکان و ئیبن تەیمییەیە، و ئەو بۆچوونەی ئەرجەحترین بۆچوونە ئەوەیە نوێژی بە کۆمەڵ واجبە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ یەك پاداشتی بۆ ئەو کەسە داناوە کە بە تەنها نوێژ دەکات ئەگەر مەرجبووایە نوێژەکەی بەتاڵ دەبوویەوە و هیچ پاداشتێکی دەستگیر نەدەبوو، بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((صَلاَةُ الرَّجُلِ فِي الْجَمَاعَةِ تُضَعَّفُ عَلَى صَلاَتِهِ فِي بَيْتِهِ وَفِي سُوقِهِ خَمْسًا وَعِشْرِينَ ضِعْفًا)).

واتە: نوێژی بە کۆمەڵی پیاو بیست و پێنج پلەی هەیە بەسەر نوێژەکەیەوە لە ماڵ و بازاڕەکەی.

و ئیبن ماجه له ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووەوە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ سَمِعَ النِّدَاءَ فَلَمْ يَأْتِهِ، فَلَا صَلَاةَ لَهُ، إِلَّا مِنْ عُذْرٍ)).

واتە: هەرکەسێك بانگ ببیستێت نەیەت بۆ نوێژ، نوێژی بۆ نییە ئیللا لەبەر عوزرێك نەبێت.

و هەرەشەی توندکراوە لەو کەسانەی وازدەهێنن لە نوێژی بە کۆمەڵ، ئیبن ماجە لە ئیبن عەباس و ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، لە پێغەمبەری خوایان ﷺ بیستووە لەسەر مینبەرە دارەکەیەوە دەیفەرموو: ((لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عَنْ وَدْعِهِمُ الْجَمَاعَاتِ، أَوْ لَيَخْتِمَنَّ اللهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ، ثُمَّ لَيَكُونُنَّ مِنَ الْغَافِلِينَ)).

واتە: کەسانێك کۆتایی دەهێنن بە وازهێنانیان لە بەجێهێنانی نوێژەکان بە کۆمەڵ، یان خوا مۆر دەدات بەسەر دڵەکانیاندا، پاشان لەو کەسانە دەبن کە بێئاگان.

و بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕوایەتان کردووە و ئەمە لەفزی مسلمە، دەڵێت: ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقَدَ نَاسًا فِي بَعْضِ الصَّلَوَاتِ، فَقَالَ: لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ رَجُلًا يُصَلِّي بِالنَّاسِ، ثُمَّ أُخَالِفَ إِلَى رِجَالٍ يَتَخَلَّفُونَ عَنْهَا فَآمُرَ بِهِمْ فَيُحَرِّقُوا عَلَيْهِمْ بِحُزَمِ الْحَطَبِ بُيُوتَهُمْ، وَلَوْ عَلِمَ أَحَدُهُمْ أَنَّهُ يَجِدُ عَظْمًا سَمِينًا لَشَهِدَهَا - يَعْنِي صَلَاةَ الْعِشَاءِ -)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەندێك نوێژ کەسانێکی لەبەرچاو ونبوو، فەرمووی: سوێند بێت خەریکبوو فەرمان بکەم بە کەسێك نوێژ بکات بە خەڵك، پاشان بڕۆمە سەر کەسانێك کە دوا دەکەون لە نوێژ و فەرمان بکەم کەسانێك بە

کۆڵەدار خانووەکانیان بەسەردا بسوتێنن، ئەگەر کەسێك لەوانەی لە نوێژی عیشا دوادەکەون بزانن ئێسقانێکی قەڵەوی گۆشتنی دەست دەکەوێت ئامادەی دەبوو.

و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((أَتَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ أَعْمَى، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّهُ لَيْسَ لِي قَائِدٌ يَقُودُنِي إِلَى الْمَسْجِدِ، فَسَأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَنْ يُرَخِّصَ لَهُ فَيُصَلِّيَ فِي بَيْتِهِ فَرَخَّصَ لَهُ، فَلَمَّا وَلَّى دَعَاهُ فَقَالَ: هَلْ تَسْمَعُ النِّدَاءَ بِالصَّلَاةِ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَأَجِبْ)).

واتە: کەسێکی نابینا هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، بەڕاستی من کەسێکم نییە چاوساغیم بکات و بمهێنێت بۆ مزگەوت، پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد ڕوخستەی بدات لەماڵەوە نوێژ بکات، ڕوخستەی پێدا، کاتێك ڕۆیشت بانگی کردەوە و فەرمووی: ئایا بانگ دەبیستیت کاتێك بانگدەدرێت بۆ نوێژ؟ گوتی: بەڵێ، فەرموو: وەڵامی بانگەکە بدەرەوە و بێ بۆ مزگەوت نوێژ بکە.

و مسلم لە ئیبن مەسعودەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: (مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَلْقَى اللهَ غَدًا مُسْلِمًا فَلْيُحَافِظْ عَلَى هَؤُلَاءِ الصَّلَوَاتِ حَيْثُ يُنَادَى بِهِنَّ، فَإِنَّ اللهَ شَرَعَ لِنَبِيِّكُمْ ﷺ سُنَنَ الْهُدَى، وَإِنَّهُنَّ مِنْ سُنَنِ الْهُدَى؛ وَلَوْ أَنَّكُمْ صَلَّيْتُمْ فِي بُيُوتِكُمْ كَمَا يُصَلِّي هَذَا الْمُتَخَلِّفُ فِي بَيْتِهِ لَتَرَكْتُمْ سُنَّةَ نَبِيِّكُمْ؛ وَلَوْ تَرَكْتُمْ سُنَّةَ نَبِيِّكُمْ لَضَلَلْتُمْ؛ وَمَا مِنْ رَجُلٍ يَتَطَهَّرُ فَيُحْسِنُ الطُّهُورَ ثُمَّ يَعْمِدُ إِلَى مَسْجِدٍ مِنْ هَذِهِ الْمَسَاجِدِ إِلَّا كَتَبَ اللهُ لَهُ بِكُلِّ خُطْوَةٍ يَخْطُوهَا حَسَنَةً وَيَرْفَعُهُ بِهَا دَرَجَةً وَيَحُطُّ عَنْهُ بِهَا سَيِّئَةً، وَلَقَدْ رَأَيْتُنَا وَمَا يَتَخَلَّفُ

عَنْهَا إِلَّا مُنَافِقٌ مَعْلُومُ النِّفَاقِ، وَلَقَدْ كَانَ الرَّجُلُ يُؤْتَى بِهِ يُهَادَى بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ حَتَّى يُقَامَ فِي الصَّفِّ).

واته: کێ پێی خۆشە بە موسڵمانی بگات بە دیداری خوا با پارێزگاری لە نوێژەکانی بگات لە مزگەوتەکان کە بانگیان بۆ دەدرێت، چونکە بێگومان خوا سوننەکانی هیدایەتی بۆ پێغەمبەرەکەتان ﷺ بە شەرع کردووە، و نوێژەکان لە سوننەتەکانی هیدایەتن، و ئەگەر ئێوە لە ماڵەکانتان نوێژ بکەن وەك چۆن ئەو کەسە دوادەکەوێت و لە ماڵەکەی دەمێنێتەوە سوننە و ڕێبازی پێغەمبەرەکەتان ﷺ واز لێ هێناوە؛ و ئەگەر واز لە سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەرەکەتان ﷺ بهێنن گومڕا دەبن؛ هیچ کەسێك نییە دەستنوێژ بگرێت بە جوانی، پاشان بچێت بۆ مزگەوتێك لە مزگەوتەکان ئیللا خوا بە هەموو هەنگاوێك کە هەنگاو دەنێت چاکەی بۆ دەنوسێت و پلەیەك بەهۆیەوە بەرزی دەکاتەوە و تاوانێکی لەسەر دەسرێتەوە، سوێند بێت لای هاوەڵان زانراوبوو کەس لە نوێژی کۆمەڵ دوانەدەکەوت ئیللا دووڕوویەك نەبێت کە دووڕوویەکەی زانراوبوو، و سوێند بێت کەسێکیان دەهێنا لە نێوان دوو کەسدا هەڵیاندەگرت هەتاکو لە ڕیزی نوێژدا دەیانوەستاند.

ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوخستی نابینا نەدابێت لە نوێژی بە کۆمەڵ دوا بکەوێت و ئەو هەڕەشە ترسناکانەی لەسەر هاتبێت پێویستە موسڵمان ئەو پرسە بەجدی وەربگرێت و کەمتەرخەمی نەکات لە بەجێهێنانی نوێژە فەرزەکان لە مزگەوت.

(**وَتَنعَقِدُ بِاثنَين**) کەمتر ژمارە کە نوێژی کۆمەڵی پێ دابمەزرێت دوو کەسە، بوخاری و مسلم لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((بتُّ عِنْدَ خَالَتِي، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ، فَقُمْتُ أُصَلِّي مَعَهُ، فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، فَأَخَذَ بِرَأْسِي فَأَقَامَنِي عَنْ يَمِينِهِ)).

واتە: لای پورم مەیمونە مامەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا لەو شەودا نوێژ بکات، هەستام نوێژی لەگەڵدا بکەم، لای چەپی وەستام، سەری گرتم و لای ڕاستای وەستاندمی.

و بوخاری لە صەحیحەکەیدا بابەتێکی هێناوە بە ناوی: (بَابٌ: اثْنَانِ فَمَا فَوْقَهُمَا جَمَاعَةٌ)، پاشان لەگەڵ مسلمدا فەرموودەیەکیان لە مالکی کوڕی حوەریسەوە ڕیوایەتکردووە دەڵێت: پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرمووین: ((إِذَا حَضَرَتِ الصَّلَاةُ فَأَذِّنَا وَأَقِيمَا، ثُمَّ لِيَؤُمَّكُمَا أَكْبَرُكُمَا)).

واتە: ئەگەر کاتی نوێژ هات بانگ بدەن و قامەت بکەن، پاشان کامتان گەورەتر بوو پێشنوێژیتان بۆ بکات.

(**وَإِذَا كَثُرَ الجَمْعُ كَانَ الثَّوَابُ أَكثَرَ**) بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیە ئەحمەد و ئەبوداود و نەسائی و ئیبن حبان لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە ڕوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((صَلَاةُ الرَّجُلِ مَعَ الرَّجُلِ أَزْكَى مِنْ صَلَاتِهِ وَحْدَهُ، وَصَلَاتُهُ مَعَ الرَّجُلَيْنِ أَزْكَى مِنْ صَلَاتِهِ مَعَ الرَّجُلِ، وَمَا كَانَ أَكْثَرَ فَهُوَ أَحَبُّ إِلَى اللهِ عَزَّوَجَلَّ)).

واتە: نوێژ پیاوێك لەگەڵ پیاوێك پاداشتی زیاترە لە نوێژی بە تەنها، و نوێژی لەگەڵ دوو پیاو پاداشتی زیاترە لەگەڵ یەك پیاو، و هەتاکو ژمارەیان زیاتر بێت خۆشەویسترە بەلای خوای باڵادەستەوە.

(**وَتَصِحُّ بَعدَ المَفضُولِ**) لە سوننەتدا جێگیربووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك نەخۆشکەوتووە لە دوای ئەبوبەکرەوە نوێژی کردووە، و مسلم لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە ڕیوایەتی کردووە باسی ئەوە دەکات لە غەزای تەبوکی لەگەل پێغەمبەری خوادا ﷺ بووە و پێغەمبەری خوا ﷺ خەریکبووە بە دەستنوێژگرتنەوە، دەڵێت: ((فَأَقْبَلْتُ مَعَهُ حَتَّى نَجِدُ النَّاسَ قَدْ قَدَّمُوا عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ فَصَلَّى لَهُمْ، فَأَدْرَكَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِحْدَى الرَّكْعَتَيْنِ، فَصَلَّى مَعَ النَّاسِ الرَّكْعَةَ الآخِرَةَ، فَلَمَّا سَلَّمَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ قَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُتِمُّ صَلاَتَهُ، فَأَفْزَعَ ذَلِكَ الْمُسْلِمِينَ، فَأَكْثَرُوا التَّسْبِيحَ، فَلَمَّا قَضَى النَّبِيُّ ﷺ صَلاَتَهُ أَقْبَلَ عَلَيْهِمْ، ثُمَّ قَالَ: أَحْسَنْتُمْ، أَوَ قَالَ: قَدْ أَصَبْتُمْ، يَغْبِطُهُمْ أَنْ صَلَّوْا الصَّلاَةَ لوقتها)).

واتە: لەگەڵیدا هاتم بینیمان خەڵك عبدالرحمانی کوڕی عەوفیان پێشخستووە نوێژیان بۆ دەکات، پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت بە ڕکاتێکدا، و لەگەڵ خەڵکدا ڕکاتەکەی تری کرد، کاتێك عبدالرحمانی کوڕی عەوف سەلامیدایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا نوێژەکەی تەواو بکات، موسڵمان ترسان هەڵەیان کردبێت و زۆر تەسبیحاتیان کرد، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژەکەی تەواوکرد هات بۆ لایان، پاشان فەرمووی: باشتان کرد، یان فەرمووی: حەقتان پێکا، کارەکەیانی بەباش دانا و ئاواتی خواست بە حاڵیان کە نوێژەکەیان لە کاتی خۆیدا کردووە.

بەڵكو ئیبن عومەر لە پشتی كەسێكی خراپ و خوێنڕێژی وەك حەجاجی سەقەفییەوە نوێژی كردووە، ئیبن ئەبوشەیبە لە قاسمی كوڕی موخەیمرەوە ڕیوایەتی كردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: (أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّي خَلْفَ الْحَجَّاجِ).

واتە: لە پشتی حەجاجەوە نوێژی كردووە،

(**وَالأَوْلَى أَن يَكُونَ الإِمَامُ مِن الخِيَارِ**) لە بڕگەی پێشوو باسی ئەوەكرد دروستە كەسێكی باش پێشنوێژی كەسێكی باشتر بكات، بەڵام باشتروایە باشترینەكان پێشنوێژی بۆ موسڵمانان بكەن، چونكە كاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ كە نەخۆشكەوت فەرمانی كرد كە ئەبوبەكر پێشنوێژی بۆ موسڵمانان بكات كەلە هەموو هاوەڵان باشترە، بوخاری و مسلم لە ئەبوموساوە ڕیوایەتیان كردووە دەڵێت: ((مَرِضَ النَّبِيُّ ﷺ، فَاشْتَدَّ مَرَضُهُ، فَقَالَ: مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ)).

واتە: كاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆشكەوت و نەخۆشییەكەی قورسبوو، فەرمووی: فەرمان بە ئەبوبەكر بكەن نوێژ بكات بۆ خەڵك.

(**وَيَؤُمُّ الرَّجُلُ بِالنِّسَاءِ لا العَكْسُ**) پێویستە پیاوان پێشنوێژی بۆ ئافرەتان بكەن و دروست نییە ئافرەتان پێشنوێژی بۆ پیاوان بكەن، مسلم لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی كردووە: ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ صَلَّى بِهِ وَبِأُمِّهِ أَوْ خَالَتِهِ، قَالَ: فَأَقَامَنِي عَنْ يَمِينِهِ وَأَقَامَ الْمَرْأَةَ خَلْفَنَا)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژ بە خۆی و دایكی یان پوری كردوو، دەڵێت: منی لای ڕاستی دانا، و ئافرەتەكەی لە پشتمانەوە دانا.

و بوخاری لە ئەبوبەکرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوْا أَمْرَهُمْ امْرَأَةً)).

واتە: هیچ کۆمەڵە خەڵکێك سەرفراز نابن ئەگەر ئافرەت بکەنە بەرپرس بەسەریانەوە؛ ئەم فەرموودەیە بەڵگەی کاربەدەستی گەورەیە، و پێشنوێژی نوێژیش بەدەر نییە لەو بەرپرسیارێتییە، و ئیبن حەزم دەڵێت: زانایان کۆدەنگن ئافرەت پێشنوێژی پیاوان ناکات لە کاتێکدا بزانن ئافرەتە، ئەگەر پێشنوێژییان بکات نوێژەکە پووچەڵ بە کۆڕا[1].

(**وَالمُفتَرِضُ بِالمُتَنَفِّلِ وَالعَكْسُ**) ئەگەر پێشنوێژ نوێژی فەرز بکات و ئەوانەی دوای دروستە نوێژ سوننەت بکەن، ئەحمەد و ئەبوداود و نەسائی لە یەزیدی کوڕی ئەسوەدەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ صَلَاةَ الْفَجْرِ فِي مَسْجِدِ الْخَيْفِ فَلَمَّا قَضَى صَلَاتَهُ إِذَا هُوَ بِرَجُلَيْنِ فِي آخِرِ الْقَوْمِ لَمْ يُصَلِّيَا مَعَهُ، فَقَالَ: عَلَيَّ بِهِمَا، فَأُتِيَ بِهِمَا تُرْعَدُ فَرَائِصُهُمَا، فَقَالَ: مَا مَنَعَكُمَا أَنْ تُصَلِّيَا مَعَنَا؟، قَالَا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا قَدْ صَلَّيْنَا فِي رِحَالِنَا، قَالَ: فَلَا تَفْعَلَا، إِذَا صَلَّيْتُمَا فِي رِحَالِكُمَا، ثُمَّ أَتَيْتُمَا مَسْجِدَ جَمَاعَةٍ فَصَلِّيَا مَعَهُمْ فَإِنَّهَا لَكُمْ نَافِلَةٌ)).

واتە: ئامادەی نوێژی بەیانی بووم لە مزگەوتی خەیف لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك نوێژەکەی تەواوکرد بینی دوو کەس لە کۆتایی خەڵکەکەوە نوێژیان نەکرد، فەرمووی: بیان هێنن بۆ لام، هێنایانیان نێوچاوانیان دەلەرزی، فەرموو:

(١). (مراتب الإجماع)(٢٧).

چی ڕێگرتان بوو نوێژمان لەگەڵدا بکەن؟ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لە ماڵەکانی خۆمان نوێژمان کرد، فەرمووی: وامەکەن، ئەگەر نوێژتان لە ماڵەکانتان کرد، پاشان هاتن بۆ مزگەوتێك نوێژی بە کۆمەڵی تێدا دەکرا، نوێژیان لەگەڵدا بکەن ئەم نوێژەی لەگەڵ خەڵکدا دەیکەن سوننەتە بۆتان؛ ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کەسێك نوێژی سوننەت بکات دەتوانێت نوێژ لە پشتی پێشنوێژێکەوە بکات کە نوێژی فەرز دەکات.

و بە پێچەوانەشەوە ئەگەر پێشنوێژەکە نوێژی سوننەت بکات و کەسانێك لە پشتییەوە نوێژی فەرز بکەن دروستە، بوخاری و مسلم جابرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((كَانَ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ يُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، ثُمَّ يَرْجِعُ فَيَؤُمُّ قَوْمَهُ))؛ وَفِي رِوَايَةِ الشَّافِعِيِّ: ((كَانَ مُعَاذٌ يُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ الْعِشَاءَ ثُمَّ يَنْطَلِقُ إِلَى قَوْمِهِ فَيُصَلِّيهَا، هِيَ لَهُ تَطَوَّعٌ وَهِيَ لَهُمْ مَكْتُوبَةٌ الْعِشَاءُ)).

واتە: موعازی کوڕی جەبەل نوێژی لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ دەکرد، پاشان دەگەڕایەوە پێشنوێژی بۆ کەسوکارەکەی خۆی دەکرد؛ لە ڕیوایەتی شافیعیدا دەڵێت: موعاز نوێژی عیشای لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد، پاشان دەگەڕایەوە بۆ لای کەسوکارەکەی نوێژەی بۆ دەکردن، بۆ موعاز سوننەت بوو و بۆ کەسوکارەکەی نوێژی فەرزی عیشا بوو.

(**وَتَجِبُ الْمُتَابَعَةُ فِي غَيرِ مُبطِلٍ**) پێشنوێژ بۆ ئەوە دانراوە چاوی لێ بکرێت، بەڵام ئەگەر کردەوەیەك نوێژ بەتاڵ بکاتەوە چاوی لێ ناکرێت، بوخاری و مسلم

لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِنَّمَا جُعِلَ الْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَلاَ تَخْتَلِفُوا عَلَيْهِ)).

واتە: بێگومان پێشنوێژ دانراوە بۆ ئەوە چاوی لێ بکرێت، ناکۆك مەبن لەگەڵیدا.

و هەڕەشەی توندکراوە لەو کەسەی پێچەوانەی پێشنوێژ دەکات، بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَمَا يَخْشَى أَحَدُكُمْ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ قَبْلَ الإِمَامِ أَنْ يَجْعَلَ اللهُ رَأْسَهُ رَأْسَ حِمَارٍ! أَوْ يَجْعَلَ اللهُ صُورَتَهُ صُورَةَ حِمَارٍ)).

واتە: ئایا کەسێك لە ئێوە ناترسێت ئەگەر سەری پێش پێشنوێژ بەرز بکاتەوە خوا سەر بکاتە سەری گوێدرێژ! یان شێوەی بکاتە شێوەی گوێدرێژ.

و ئەوەی نابێت لە شتێکدا کە نوێژ بەتاڵ بکاتەوە چاوی لێ بکرێت، بۆ نموونە: ئەگەر پێشنوێژ لە نوێژەکەیدا قسەی کرد چاوی لێ ناکرێت، بەڵام ئەگەر پێشنوێژ بۆ نموونە بە هەڵە ڕکاتێك زیادە بکات و ئاگادار بکرێتەوە بەڵام بەردەوام بێت پێویستە چاوی لێ بکرێت پاشان سەلامیدایەوە پێی بگوترێت و ئەو کاتە سوژدەی هەڵە دەبات، بوخاری و مسلم لە ئیبن مەسعودەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەمە لە فزی بوخارییە، دەڵێت: ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ صَلَّى الظُّهْرَ خَمْسًا فَقِيلَ لَهُ: أَزِيدَ فِي الصَّلاةِ؟ فَقَالَ: وَمَا ذَاكَ؟، قَالَ: صَلَّيْتَ خَمْسًا، فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ بَعْدَ مَا سَلَّمَ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ پێنج ڕکات نوێژی کرد، پێی گوترا: ئایا نوێژ زیادکراوە، فەرمووی: بۆچی ئەو پرسیارە دەکەن؟ گوتی: پێنج ڕکات نوێژت کرد، دوو سوژدەی برد دوای ئەوەی سەلامیدایەوە.

(**وَلا يَؤُمُّ الرَّجُلُ قَومًا هُم لَهُ كَارِهُونَ**) کەسێك ئەگەر ئەو کەسانەی نوێژ لە پشتییەوە دەکەن پێیان ناخۆشبێت نوێژیان بۆ بکات لەبەر ئەوەی کەسێکی خراپە یان بیدعەکارە یان نوێژەکەی بەجوانی بەجێناهێنێت نابێت نوێژیان بۆ بکات و تاوانبار دەبێت ئەگەر بەردەوام بێت لەسەر پێشنوێژیکردنیان، بەڵام ئەگەر لەبەر هۆکارێکی شەرعی نەبێت لای لێ ناکرێتەوە بەتایبەت ئەگەر ئەو نارەزایەتییە لای کەسانێکی کەمەوە بێت، بەڵام پێویستە هەوڵی چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە دانایانە بدرێت، ترمزی لە ئەبوئومامەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((ثَلَاثَةٌ لَا تُجَاوِزُ صَلَاتُهُمْ آذَانَهُمْ: العَبْدُ الآبِقُ حَتَّى يَرْجِعَ، وَامْرَأَةٌ بَاتَتْ وَزَوْجُهَا عَلَيْهَا سَاخِطٌ، وَإِمَامُ قَوْمٍ وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ)).

واتە: سێ کەس نوێژەکانیان لە ئاستی گوێکانیان بەرزتر نابێتەوە و لێیان قەبوڵ ناکرێت: بەندەیەك لە دەستی خاوەنەکەی هەڵهاتبێت هەتاکو نەگەڕێتەوە بۆ لای خاوەنەکەی، و ئافرەتێك شەو بخەوێت و پیاوەکەی لێی تورە بێت، و پێشنوێژی کەسانێك کە پێیان ناخۆش بێت پێشنوێژییان بۆ بکات.

و تەبەرانی لە تەڵحەی کوڕی عوبەیداللەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە (حسن لغیرە) داناوە: ((صَلَّى بِقَوْمٍ فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: إِنِّي نَسِيتُ أَنْ أَسْتَأْمِرَكُمْ قَبْلَ أَنْ أَتَقَدَّمَ أَرَضِيتُمْ بِصَلَاتِي؟ قَالُوا: نَعَمْ وَمَنْ يَكْرَهُ ذَلِكَ يَا حَوَارِيَّ رَسُولِ اللهِ ﷺ؟ قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: أَيُّمَا رَجُلٍ أَمَّ قَوْمًا وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ لَمْ تُجَاوِزْ صَلَاتُهُ أُذُنَيْهِ)).

واتە: نوێژی کرد بە کۆمەڵە خەڵکێك کاتێك نوێژەکەی تەواوکرد گوتی: من لە بیرم چوو ڕوخسەتتان لێ وەربگرم پێش ئەوەی پێش بکەوم ئایا ڕازیبوون بە نوێژەکەم؟ گوتیان: بەڵێ، کێ ئەوەی پێناخۆشە ئەی دۆست و خۆشەویستی تایبەتی پێغەمبەری خوا ﷺ؟، گوتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هەرکاتێك پیاوێك پێشنوێژی بکات بۆ کۆمەڵە خەڵکێك پێیان ناخۆش بێت، نوێژەکەی هەتا ئاستی گوێکانی بەرز نابێتەوە و لێی قەبوڵ ناکرێت.

(**وَيُصَلِّي بِهِم صَلاةَ أَخَفِّهِم**) پێویست پێشنوێژ ڕەچاوی حاڵی ئەو کەسانە بکات کەلە پشتییەوە نوێژ دەکەن، و نوێژەکەی ئەوەندە درێژ نەکاتەوە لە توانایاندا نەبێت بەڵکو ڕەچاوی حاڵی لاوازترین کەسیان دەکات، مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِذَا أَمَّ أَحَدُكُمُ النَّاسَ فَلْيُخَفِّفْ، فَإِنَّ فِيهِمُ الصَّغِيرَ وَالْكَبِيرَ وَالضَّعِيفَ وَالْمَرِيضَ، فَإِذَا صَلَّى وَحْدَهُ فَلْيُصَلِّ كَيْفَ شَاءَ)).

واتە: ئەگەر کەسێك لە ئێوە پێشنوێژی بۆ خەڵك کرد نوێژەکەی کورت بکاتەوە، چونکە منداڵ و پیر و لاواز و نەخۆشیان تێدایە، و ئەگەر خۆی بە تەنها نوێژی کرد چۆن ویستی نوێژ بکات.

ڕەچاوکردنی حاڵی موسڵمانان داواکراوە لە شەرعدا، بەڵام نابێت ئەو کورتییە بەشێوەیەك بێت نوێژەکە بەجوانی بەوشێوەیەی پێویستە بەجێ نەهێنن.

(**وَيُقَدَّمُ: السُّلطَانُ وَرَبُّ المَنزِلِ**) مسلم لە ئەبومەسعودی ئەنصارییەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((وَلَا يَؤُمَّنَّ الرَّجُلُ الرَّجُلَ فِي سُلْطَانِهِ، وَلَا يَقْعُدْ فِي بَيْتِهِ عَلَى تَكْرِمَتِهِ إِلَّا بِإِذْنِهِ)).

واتە: کەس پێشنوێژ پیاوێك نەکات لە سنوری دەسەڵاتی، و لەماڵیدا لەسەر ڕاخەر و شوێنە تایبەتەکەی دانەیشێت بەبێ ڕوخسەتی؛ ئەمە پێشنوێژ مزگەوتەکان و بەرێوەبەرەکانیش دەگرێتەوە کە لەسەر مزگەوتەکان بەرپرسن و بەبێ ڕوخستەی ئەوانە نابێت کەس پێشنوێژی بکات.

و ئەبوداود و ترمزی لە مالکی کوڕی حوەریسەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((مَنْ زَارَ قَوْمًا فلاَ يَؤُمَّهُمْ، وَلْيَؤُمَّهُمْ رَجُلٌ مِنْهُمْ)).

واتە: هەرکەس سەردانی کەسانێکی کرد پێش نوێژییان بۆ نەکات، و با پیاوێك لە خۆیان پێشنوێژییان بۆ بکات.

و ئەبوداود لە ئەبومەسعودی ئەنصارییەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویت: ((وَلَا يُؤَمُّ الرَّجُلُ فِي بَيْتِهِ وَلَا فِي سُلْطَانِهِ)).

واتە: کەس پێشنوێژی پیاوێك نەکات لە ماڵەکەیدا، و لە شوێنی دەسەڵات و فەرمانڕەوایەکەیدا.

و بەیهەقی ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە: (أَنَّ ابْنَ عُمَرَ أَتَى أَرْضًا لَهُ عِنْدَهَا مَسْجِدٌ يُصَلِّي فِيهِ مَوْلىً لَهُ، فَصَلَّى ابْنُ عُمَرَ مَعَهُمْ، فَسَأَلُوهُ أَنْ يَؤُمَّهُمْ، فَأَبَى، وَقَالَ: صَاحِبُ الْمَسْجِدِ أَحَقُّ).

واتە: ئیبن عومەر ڕۆیشت بۆ سەرزەمینێك مزگەوتێکی تێدابوو مەولایەکی نوێژی تێدا دەکرد، ئیبن عومەر نوێژی لەگەڵدا کردن، داوایان لێکرد پێشنوێژییان بۆ بکات ڕەتیکردەوە، و گوتی: خاوەن مزگەوتەکە شایانترە پێشنوێژی بکات.

و ئیبن ئەبوشەیبە و عبدالرزاق لە ئەبوسەعیدی مەولای ئوسەیدی ئەنصارییەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: (تَزَوَّجْتُ وَأَنَا مَمْلُوكٌ، فَدَعَوْتُ نَفَرًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ فِيهِمْ ابْنُ مَسْعُودٍ وَأَبُو ذَرٍّ وَحُذَيْفَةُ، قَالَ: وَأُقِيمَتْ الصَّلَاةُ، فَذَهَبَ أَبُو ذَرٍّ لِيَتَقَدَّمَ، فَقَالُوا: إِلَيْكَ، قَالَ: أَوَكَذَلِكَ؟، قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: فَتَقَدَّمْتُ إِلَيْهِمْ وَأَنَا عَبْدٌ مَمْلُوكٌ).

واتە: ژنم هێنا و من بەندە بووم، دەعوەتی چەند هاوەڵاڵێکی پێغەمبەری خوام ﷺ دەعوەت کرد، ئیبن مەسعود و ئەبوزەڕ و حوزەیفەیان تێدابوو، و قامەتکرا بۆ نوێژ، ئەبوزەڕ ڕۆیشت پێش بکەوێت، گوتیان: مەڕۆرە پێشەوە، گوتی: بەوشێوەیە؟، گوتیان: بەڵێ، دەڵێت: من پێشیان کەوتم و من بەندەیەك بووم خاوەنم هەبوو.

ترمزی دوای ڕیوایەتکردنی فەرموودەکەی مالکی کوڕی حوەیریس دەڵێت: کردار لەسەر ئەمەیە لای زانایانی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ و جگە لەوانیش، و دەڵێن: خاوەن ماڵ شایانترە بە پێشنوێژ لەو کەسەی سەردانی دەکات، و هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەگەر خاوەن ماڵەکە ڕوخسەتیدا ئاساییە پێشنوێژی بۆ خاوەن ماڵەکە بکات، و ئیسحاق دەستی گرتووە بە فەرموودەکەی مالکی کوڕی حوەیریسەوە، و جەختی کردووەتەوە لەسەر ئەوەی نابێت کەس پێشنوێژی بۆ خاوەن ماڵ بکات ئەگەر خاوەن ماڵەکەش ڕوخسەتی بدات، دەڵێت: هەروەها لە مزگەوتیش ئەگەر سەردانیان بکات پێشنوێژییان ناکات، بەڵکو پیاوێك لە خۆیان پێشنوێژییان بۆ دەکات[1].

---

(١). (سنن الترمذي)(١/٣٨٣).

و شافعی دەڵێت: پێم ناخۆشە کەسێك پێشنوێژی بکات جگە لە خاوەن دەسەڵات لە ماڵەکەیدا، ئیللا خۆی ڕۆخسەتی بدات، ئەگەر ڕوخسەتیدا ئاساییە[1].

(**وَالأَقرَأُ، ثُمَّ الأَعلَمُ، ثُمَّ الأَسَنُّ**) مسلم لە ئەبومەسعودی بەدرییەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((يَؤُمُّ الْقَوْمَ أَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اللهِ، فَإِنْ كَانُوا فِي الْقِرَاءَةِ سَوَاءً فَأَعْلَمُهُمْ بِالسُّنَّةِ، فَإِنْ كَانُوا فِي السُّنَّةِ سَوَاءً فَأَقْدَمُهُمْ هِجْرَةً، فَإِنْ كَانُوا فِي الْهِجْرَةِ سَوَاءً فَأَقْدَمُهُمْ سِلْمًا - وَفِي رِوَايَةٍ: سِنًّا -)).

واتە: ئەو کەسەی لە هەمووان زیاتر قورئانی لەبەربێت پێشنوێژی خەڵك دەکات، ئەگەر لەبەرکردنیان یەکسان بوو ئەو کەسیان زاناترە بە سوننەت پێشنوێژی دەکات، ئەگەر لە زانینی سوننەتدا یەکسان بوون ئەوەیان پێشتر کۆچی کردبێت پێشنوێژی دەکات، و ئەگەر لە کۆچکردنیشدا یەکسان بوون ئەوەیان پێشتر موسڵمان بووبێت، و لە ڕیوایەتێکدا: تەمەنی گەورەتر بێت پێشنوێژی دەکات.

و بوخاری لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((لَمَّا قَدِمَ الْمُهَاجِرُونَ الأَوَّلُونَ الْعُصْبَةَ، مَوْضِعٌ بِقُبَاءَ، قَبْلَ مَقْدَمِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، كَانَ يَؤُمُّهُمْ سَالِمٌ مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ، وَكَانَ أَكْثَرَهُمْ قُرْآنًا)).

واتە: کاتێك کۆچەرییەکان هاتن بۆ عوصبە کە شوێنێکە لە قوبا، پێش کۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ، سالمی مەولای ئەبوحوزەیفە پێشنوێژی بۆ دەکرن، کەلە هەموویان قورئانی زیاتر لەبەربوو.

---

(١). (الأم)(١/١٨٣).

(**وَإِذَا اختَلَّت صَلَاةُ الإِمَامِ؛ كَانَ ذلِكَ عَلَيهِ لَا عَلَى المُؤتَمِّينَ بِهِ**) ئەگەر پێشنوێژ هەڵە بکات و نوێژەکەی کێشەی تێبکەوێت زیانی بۆ ئەو نوێژکەرانە نییە لە پشتییەوە نوێژ دەکەن، بوخاری لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((يُصَلُّونَ لَكُمْ، فَإِنْ أَصَابُوا فَلَكُمْ، وَإِنْ أَخْطَئُوا فَلَكُمْ وَعَلَيْهِمْ)).

واتە: پێشنوێژەکان نوێژتان بۆ دەکەن، ئەگەر حەقیان پێکان پاداشتی نوێژەکەتان بۆ هەیە، و ئەگەر هەڵەیان کرد ئێوە پاداشتی نوێژەکەتان دەستدەکەوێت و ئۆباڵی هەڵەکەیان لە ئەستۆی خۆیانە.

و ئەگەر پێشنوێژ نوێژەکەشی بەتاڵ بێتەوە زیانی بۆ نوێژی ئەو کەسانە نییە نوێژیان لە پشتییەوە کردووە، ئیبن ئەبوشەیبە لە سالمەوە ڕیوایەتی کردووە لە ئیبن عومەرەوە: (أَنَّهُ صَلَّى بِهِمُ الْغَدَاةَ، ثُمَّ ذَكَرَ أَنَّهُ صَلَّى بِغَيْرِ وُضُوءٍ فَأَعَادَ وَلَمْ يُعِيدُوا).

واتە: نوێژی بەیانی بۆ کردین، پاشان بیری کەوتەوە نوێژی بەبێ دەستنوێژ نوێژی کردووە، نوێژەکەی دووبارە کردەوە و ئەوانە نوێژەکەیان دووبارە نەکردەوە.

و ئەسرەم لە عومەرەوە ڕیوایەتی کردووە: (أَنَّه صَلَّى بِالنَّاسِ الصُّبْحَ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الْجَرْفِ فَأَهْرَاقَ الْمَاءَ، فَوَجَدَ فِي ثَوْبِهِ احْتِلَامًا فَأَعَادَ الصَّلَاةَ وَلَمْ يُعِدْ النَّاسُ)[1].

واتە: نوێژی بەیانی بە خەڵك کردووە، پاشان ڕۆیشت بۆ کەناری شیوەکە ئاوی بەسەر خۆیدا کرد، و ئاوی مەنی بە پۆشاکەکەیەوە بینی نوێژەکەی دووبارە کردەوە و خەڵك نوێژەکەیان دووبارە نەکردەوە.

---

(١). ئەلبانی لە (إرواء الغليل)(٢/٣١٤) بە ژمارە: (٥٣٣) دەڵێت: (وروى الأثرم نحو هذا عن عثمان وعلي).

**(وموقِفُهُم خَلفَهُ؛ إلّا الوَاحِدَ فَعَنْ يَمِينِهِ)** خەڵك لە پشتی پێشنوێژەوە دەوەستن بۆ نوێژی بە کۆمەڵ، بەڵام ئەگەر تەنها یەك کەس نوێژی لەگەڵدا بکات لای ڕاستی دەوەستێت، مسلم فەرموودەیەکی درێژی لە جابرەوە ڕیوایەتکردووە باسی ئەوە دەکات لە غەزایەکدا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بووە، دەڵێت: ((قَامَ رَسُولُ الله ﷺ لِيُصَلِّيَ... جِئْتُ حَتَّى قُمْتُ عَنْ يَسَار رَسُول الله ﷺ، فَأَخَذَ بِيَدِي فَأَدَارني حَتَّى أَقَامَنِي عَنْ يَمِينه... ثُمَّ جَاءَ جَبَّارُ بْنُ صَخْر فَقَامَ عَنْ يَسَارِ رَسُولِ الله ﷺ فَأَخَذَ رَسُولُ الله ﷺ بِيَدَيْنَا جَمِيعًا، فَدَفَعَنَا حَتَّى أَقَامَنَا خَلْفَهُ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا نوێژ بکات، ڕۆیشتم هەتاکو لای چەپی پێغەمبەری خواوە ﷺ وەستام، دەستی گرتم و سوڕاندمی هەتاکو لای لای ڕاستی وەستاندمی، پاشان جەباری کوڕی صەخر هات لای چەپی پێغەمبەری خوا ﷺ وەستا، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی هەردووکمانی گرت، پاڵی پێوەناین هەتاکو لە پشتییەوە وەستاندمانی.

و بوخاری و مسلم لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((بِتُّ عِنْدَ خَالَتِي، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ، فَقُمْتُ أُصَلِّي مَعَهُ، فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، فَأَخَذَ بِرَأْسِي فَأَقَامَنِي عَنْ يَمِينِهِ)).

واتە: لای پوورم مەیمونە مامەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا لەو شەودا نوێژ بکات، هەستام نوێژی لەگەڵدا بکەم، لای چەپی وەستام، سەری گرتم لای ڕاستی وەستاندمی.

و یەك کەس لە ئاستی پێشنوێژەکە دەوەستێت، و دواناکەوێت، ئەحمەد لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ فَصَلَّيْتُ خَلْفَهُ، فَأَخَذَ بِيَدِي فَجَرَّنِي فَجَعَلَنِي حِذَاءَهُ)).

واتە: لە کۆتایی شەودا ڕۆییشت بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژم لە پشتییەوە کرد، بە دەستی ڕایکێشام و لە ئاستی خۆی دایانم.

و مالك لە نافعەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: (قُمْتُ وَرَاءَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ فِي صَلَاةٍ مِنْ الصَّلَوَاتِ وَلَيْسَ مَعَهُ أَحَدٌ غَيْرِي فَخَالَفَ عَبْدُ اللهِ بِيَدِهِ فَجَعَلَنِي حِذَاءَهُ).

واتە: لە نوێژێك لە نوێژەکان لە پشتی ئیبن عومەرەوە وەستام کەسم لەگەڵدا نەبوو، بە دەستی ڕایکێشام هەتاکو لە ئاستی خۆی دایانم.

و مالك لە عبداللەی کوڕی عوتبەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: (دَخَلْتُ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ بِالْهَاجِرَةِ، فَوَجَدْتُهُ يُسَبِّحُ، فَقُمْتُ وَرَاءَهُ فَقَرَّبَنِي، فَجَعَلَنِي بِحِذَائِهِ عَنْ يَمِينِهِ، فَلَمَّا جَاءَ يَرْفَأُ تَأَخَّرْتُ فَصَفَفْنَا وَرَاءَهُ).

واتە: ڕۆیشتمە ژوورەوە بۆ لای عومەری کوڕی خەتاب لە کاتی نیوەڕۆدا، بینیم نوێژی سوننەت دەکات، لە پشتییەوە وەستام نزیکی کردمەوە، لای ڕاستییەوە لە ئاستی خۆیدا وەستاندمی، کاتێك یەرفأ هات دواکەوتم لە پشتییەوە ڕیزمان بەست.

بەڵام ئەگەر بە تەنها یەك ئافرەت بوو لە پشتی پێشنوێژەکەوە دەوەستێت، و لە هیچ حاڵێکدا لە تەنیشتی پێشنوێژەوە ناوەستێت، مسلم لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی کردووە: ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ صَلَّى بِهِ وَبِأُمِّهِ أَوْ خَالَتِهِ، قَالَ: فَأَقَامَنِي عَنْ يَمِينِهِ وَأَقَامَ الْمَرْأَةَ خَلْفَنَا)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژ بە خۆی و دایکی یان پوری کردوو، دەڵێت: منی لای ڕاستی دانا، و ئافرەتەکەی لە پشتمانەوە دانا.

بەڵام ئەگەر شوێن وەستان کەم بوو یان پێویست بوو دەتوانن لای ڕاست و چەپی پێشنوێژەکەوە بوەستن، نەسائی لە ئەسوەد و عەلقەمەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێن: ((دَخَلْنَا عَلَى عَبْدِ اللهِ نِصْفَ النَّهَارِ فَقَالَ: إِنَّهُ سَيَكُونُ أُمَرَاءُ يَشْتَغِلُونَ عَنْ وَقْتِ الصَّلَاةِ فَصَلُّوا لِوَقْتِهَا، ثُمَّ قَامَ، فَصَلَّى بَيْنِي وَبَيْنَهُ فَقَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَعَلَ)).

واتە: لە نیوەڕۆدا چووینە ژوورەوە بۆ لای ئیبن مەسعود گوتی: کاربەدەستانێك پەیدا دەبن خەریك دەبن و نوێژەکەیان دوا دەخەن، ئێوە نوێژەکەتان لە کاتی خۆیدا بکەن، پاشان هەستا نوێژی لە نێوانماندا کرد و گوتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بەم شێوەیەی کرد.

(**وَإِمَامَةُ النِّسَاءِ وَسَطَ الصَّفِّ**) ئەگەر ئافرەتێك پێش نوێژی بۆ ئافرەتان بکات لە ناوەڕاستیان دەوەستێت، عبدالرزاق لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ڕیوایەتی کردووە: (أَنَّ عَائِشَةَ كَانَتْ تَؤُمُّ النِّسَاءَ فِي التَّطَوُّعِ، تَقُومُ مَعَهُنَّ فِي الصَّفِّ).

واتە: عائیشە پێشنوێژی بۆ ئافرەتان دەکرد لە نوێژی سوننەتدا، لەگەڵیاندا لە ڕیزەکەدا دەوەستا.

و ئیبن ئەبوشەیبە لە ئوم حەسەنەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: (رَأَيْتُ أُمَّ سَلَمَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ تَؤُمُّ النِّسَاءَ تَقُومُ مَعَهُنَّ فِي صَفِّهِنَّ).

واتە: ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەری خوام ﷺ بینی پێشنوێژی بۆ ئافرەتان دەکرد، لەگەڵیاندا لە ڕیزەکە دەوەستا[١].

---

(١). ئەلبانی دوای ئەو ئەو ئەسەرانەی هێناوە لە (تمام المنة)(١٥٤) دەڵێت: بالجملة فهذه الآثار صالحة للعمل بها.

(**وَتُقَدَّمُ: صُفُوفُ الرِّجَالِ، ثُمَّ الصِّبيَانِ، ثُمَّ النِّسَاءِ**) بوخاری و مسلم له ئەنەسەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((صَلَّيْتُ أَنَا وَيَتِيمٌ فِي بَيْتِنَا، خَلْفَ النَّبِيِّ ﷺ، وَأُمِّي أُمُّ سُلَيْمٍ خَلْفَنَا)).

واتە: من و هەتیوێك لە ماڵی خۆمان نوێژمان کرد لە پشتی پێغەمبەری خواوە ﷺ، و دایکم ئوم سولەیم لە پشتمانەوە نوێژی کرد.

و ئەحمەد و ئیبن ماجە لە ئەنەسەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُحِبُّ أَنْ يَلِيَهُ الْمُهَاجِرُونَ وَالْأَنْصَارُ لِيَأْخُذُوا عَنْهُ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی خۆشبوو کۆچەرییەکان و پشتیوانان لە پشتییەوە و لە نزیکی بوەستن لە نوێژدا بۆ ئەوەی حوکمەکانی نوێژی لێ وەربگرن.

بەڵام ئەوەی منداڵان لە پشتی پیاوانەوە دەوەستن بەڵگەی ڕاشکاوی لەسەر نییە، بەڵام لەوانەیە بتوانرێت ئەو فەرموودەیە بکرێتە بەڵگە کە مسلم لە ئەبومەسعودەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((لِيَلِنِي مِنْكُمْ أُولُو الْأَحْلَامِ وَالنُّهَى، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثَلَاثًا)).

واتە: با ئەو کەسانە خاوەن عەقڵ و ژیرن لێم نزیك ببنەوە، پاشان خەڵك دوای ئەوان بوەستن، سێ جار ئەمەی فەرموو.

ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەوەی تێدا کەسانی عاقڵ و ژیرەکان لە پێشنوێژەوە نزیکبن، و منداڵان بەشێوەکی گشتی بەوشێوەیە نین، ئەمە بۆ ڕێزی یەکەمی

نزيك ئيمام ڕاستە بەڵام بۆ ڕيزەكانی تر ئاساييە منداڵان لەگەڵ پياواندا بوەستن، و ئەو فەرموودەيەی ئەحمەد و ئەبوداود لە ئەبومالكی ئەشعەرييەوە ڕيوايەتيان كردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((يَجْعَلُ الرِّجَالَ قُدَّامَ الْغِلْمَانِ، وَالْغِلْمَانَ خَلْفَهُمْ، وَالنِّسَاءَ خَلْفَ الْغِلْمَانِ))، ئەلبانی بە زەعيفی داناوە.

(**وَالأَحَقُّ بِالصَّفِّ الأَوَّلِ أُولُو الأَحلَامِ وَالنُّهَى**) بە بەڵگەی ئەو فەرموودەی مسلم لە ئەبومەسعودەوە ڕيوايەتی كردووە كە باسكرا.

(**وَعَلَى الجَمَاعَةِ أَن يُسَوُّوا صُفُوفَهُم**) ڕێكخستنی ڕيزەكانی نوێژ لە شەريعەتدا زۆر گرنگی پێدراوە و فەرموودەی زۆری لەسەر هاتووە، و زۆرێك لە زانايان بە واجبيان زانيوە لەبەر ئەو هەڕەشانە هاتووە لەسەر ڕێكنەخستنی ڕيزەكانی نوێژ، مسلم لە ئەبومەسعودەوە ڕيوايەتی كردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((اسْتَوُوا، وَلَا تَخْتَلِفُوا فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ)).

واتە: ڕيزەكانتان ڕێكبخەن، و ناكۆك مەبن ئەگەرنا دڵەكانتان ناكۆك دەبێت.

و بوخاری و مسلم بە تەبايی لە نوعمانی كوڕی بەشيرەوە ڕيوايەتيان كردووە دەڵێت: گويم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەيفەرموو: ((لَتُسَوُّنَّ صُفُوفَكُمْ، أَوْ لَيُخَالِفَنَّ اللهُ بَيْنَ وُجُوهِكُمْ)).

واتە: ڕيزەكانی نوێژتان ڕێكدەخەن يان خوا ناكۆكی دەخاتە نێوان ڕوخسارەكانتانەوە.

و بوخاری و مسلم لە ئەنەسی كوڕی مالكەوە ڕيوايەتيان كردووە و ئەمە لەفزی مسلمە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((سَوُّوا صُفُوفَكُمْ فَإِنَّ تَسْوِيَةَ الصَّفِّ مِنْ تَمَامِ الصَّلَاةِ)).

واتە: ڕیزەکانتان ڕێکبخەن، چونکە بێگومان ڕێکخستنی ڕیز لە تەواوی نوێژە.

(**وَيَسُدُّوا الخَلَلَ**) پڕکردنەوەی بۆشایی نێوان موسڵمانان ئەو فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر کە ئەحمەد لە ئەبوئومامەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((سَوُّوا صُفُوفَكُمْ، وَحَاذُوا بَيْنَ مَنَاكِبِكُمْ، وَلِينُوا فِي أَيْدِي إِخْوَانِكُمْ، وَسُدُّوا الْخَلَلَ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَدْخُلُ فِيمَا بَيْنَكُمْ بِمَنْزِلَةِ الْحَذْفِ)).

واتە: ڕیزەکانتان ڕێکبخەن، و شانتان با ڕێکی یەك بێت، و نەرمبن بە دەستی براکانتانەوە ئەگەر داوایان لێکردن جێگایان بکەنەوە لە ڕیزی نوێژدا یان داوایان کرد پاش و پێش بکەن بۆ ڕێکخستنی ڕیزی نوێژ، و بۆشاییەکانی نێوانتان پڕ بکەنەوە، چونکە ئەگەر بۆشاییەکان پڕ نەکەنەوە شەیتان دەچێتە نێوانتانەوە وەك بەرخە کۆرپە.

(**وَيُتِمُّوا الصَّفَّ الأَوَّلَ، ثُمَّ الَّذِي يَلِيهِ، ثُمَّ كَذلِكَ**) پێویستە ڕیزەکانی نوێژ ڕیزی یەکەم پاشان ڕیزی دووەم و بەوشێوەیە ڕیزە پێشینەکان تەواو بکرێن، ئەحمەدو ئەبوداود و نەسائی لە ئەنەسەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَتِمُّوا الصَّفَّ الْمُقَدَّمَ ثُمَّ الَّذِي يَلِيهِ فَمَا كَانَ مِنْ نَقْصٍ فَلْيَكُنْ فِي الصَّفِّ الْمُؤَخَّرِ)).

واتە: ڕیزی پێشەوە تەواو بکەن پاشان ڕیزەکەی دوای ئەو، ئەگەر ڕیزێك بە تەواو نەکراوی مایەوە با ڕیزی کۆتایی بێت.

و لای ڕاستی ڕیزی نوێژ باشترە لە لای چەپی، بەڵام نابێت ڕیز نوێ دروست بکرێت هەتاکو ڕیزی پێشەوە تەواو نەکرێت، لە صەحیحی مسلمدا بابەتێك

هاتووە بە ناونیشانی: (بَابُ اسْتِحْبَاب يَمِينِ الإِمَام)، پاشان ئەم فەرموودەیەی لە بەرائەوە ڕیوایەتکردووە دەڵێت: ((كُنَّا إِذَا صَلَّيْنَا خَلْفَ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَحْبَبْنَا أَنْ نَكُونَ عَنْ يَمِينِهِ، يُقْبِلُ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ)).

واتە: ئێمەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر نوێژمان لە پشتی پێغەمبەری خواوە ﷺ بکردایە پێمان خۆشبوو لای ڕاستییەوە بوەستین، کاتێك سەلامی دەدایەوە ڕووی تێدەکردین.

و سوننەتە ڕیزەکانی نوێژ لە یەکەوە نزیك بێت، ئەحمەد و ئەبوداود و نەسائی لە ئەنەسەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((رُصُّوا صُفُوفَكُمْ، وَقَارِبُوا بَيْنَهَا، وَحَاذُوا بِالْأَعْنَاقِ)).

واتە: ڕیزەکانات ڕێکبخەن و بۆشایی لە نێوانتاندا نەبێت، و ڕیزەکانتان نزیك بێت لە یەکەوە، و گەردنتان لە ئاستی یەك بێت و پاش و پێش نەبێت.

و سوننەتە ئیمام فەرمان بە نوێژکەران بکات ڕێك ڕابوەستن و بوشاییەکانی نێوانیان پڕ بکەنەوە، بوخاری و مسلم لە ئەنەسی کوڕی مالکەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەمە لەفزی مسلمە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((سَوُّوا صُفُوفَكُمْ فَإِنَّ تَسْوِيَةَ الصَّفِّ مِنْ تَمَامِ الصَّلَاةِ)).

واتە: ڕیزەکانتان ڕێکبخەن، چونکە بێگومان ڕێکخستنی ڕیز لە تەواوی نوێژە.

و باشترین ڕیزی نوێژی پیاوان ڕیزی یەکەمە، ئەحمەد لە بەرائی کوڕی عازبەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا

ﷺ دەفەرموێت: ((إِنَّ اللهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الصَّفِّ الْأَوَّلِ، أَوِ الصُّفُوفِ الْأُولَى)).

واتە: بەڕاستی خوا و فریشتەكانی سەڵاوات دەدەن لەسەر ڕیزی یەكەم، یان ڕیزە یەكەمینەكان.

پرسیێك: ئایا دروستە لە مزگەوتێكدا كە ئیمامێكی جێگیر و دیاریكراوی هەبێت نوێژی جەماعەت دووبارە بكرێتەوە، جمهوری زانایان بە مەكروهی دەزانن نوێژی جەماعەت دووبارە بكرێتەوە لەو مزگەوتەی ئیمامی و جێگیر و بەردەوامی هەیە، تەبەرانی لە (المعجم الأوسط) لە ئەبوبەكرەوە ڕیوایەتی كردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَقْبَلَ مِنْ نَوَاحِي الْمَدِينَةِ يُرِيدُ الصَّلَاةَ، فَوَجَدَ النَّاسَ قَدْ صَلَّوْا، فَمَالَ إِلَى مَنْزِلِهِ، فَجَمَعَ أَهْلَهَ، فَصَلَّى بِهِمْ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە دەورووبەری مەدینە گەڕایەوە ویستی نوێژ بكات، بینی خەڵك نوێژیان تەواوكردووە، گەڕایەوە بۆ ماڵەوە و كەسوكاری كۆكردنەوە و نوێژی بۆ كردن.

و عبدالرزاق و تەبەرانی لە (المعجم الكبير) لە ئیبراهیمەوە ڕیوایەتیان كردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ((أَنَّ عَلْقَمَةَ وَالْأَسْوَدَ، أَقْبَلَا مَعَ ابْنِ مَسْعُودٍ إِلَى الْمَسْجِدِ فَاسْتَقْبَلَهُمُ النَّاسُ قَدْ صَلُّوا، فَرَجَعَ بِهِمَا إِلَى الْبَيْتِ فَجَعَلَ أَحَدَهُمَا عَنْ يَمِينِهِ، وَالْآخَرَ عَنْ شِمَالِهِ، ثُمَّ صَلَّى بِهِمَا)).

واتە: عەلقەمە و ئەسوەد لەگەڵ ئیبن مەسعوددا هاتن بۆ مزگەوت خەڵك پێشوازییان لێكرد و نوێژیان كردبوو، ئیبن مەسعود گەڕاندیانییەوە بۆ ماڵەوە

یەکێکیانی خستە لای ڕاستی و یەکێکیانی خستە لای چەپی، پاشا نوێژی پێکردن.

و ئیبن ئەبوشەیبە لە حەسەنەوە ڕیوایەتی کردووە: (كَانَ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ ﷺ، إِذَا دَخَلُوا الْمَسْجِدَ وَقَدْ صُلِّيَ فِيهِ صَلَّوْا فُرَادَى).

واتە: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا محمد ﷺ، ئەگەر بڕۆیشتایە بۆ مزگەوتێك نوێژی تێدا کرابێت بە تەنها نوێژیان دەکرد.

و ئەو فەرموودەی ئەبوداود و ترمزی لە ئەبوسەعیدەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، و ئەمە لەفزی ترمزییە، دەڵێت: ((دَخَلَ رَجُلٌ الْمَسْجِدَ فَقَامَ يُصَلِّي وَحْدَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَلَا رَجُلٌ يَتَصَدَّقُ عَلَى هَذَا فَيُصَلِّيَ مَعَهُ)).

واتە: پیاوێك هاتە نێو مزگەوتەوە و هەستا بە تەنها نوێژی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: کەسێك هەستێت بەم کەسە ببەخشێت و نوێژی لەگەڵدا بکات.

ترمزی دوای ڕیوایەتکردنی ئەم فەرموودەیە دەڵێت: ئەوە بۆچوونی زیاتر لە زانایەکی هاوەڵانی پێغەمبەری خوایە ﷺ و جگە لەوانیش لە هاوەڵان، دەڵێن: ئاساییە کۆمەڵە کەسێك نوێژی جەماعەت بکەن لە مزگەوتێکدا نوێژی تێدا کرابێت ئەوە بۆچوونی ئەحمەد و ئیسحاقە، و هەندێك زانای تر دەڵێن: بە تەنها نوێژ دەکەن، ئەوە بۆچوونی سوفیان و ئیبن موبارەك و مالك و شافعییە[١].

---

(١). (سنن الترمذي)(١/٢٦٠).

بەڵام ئەم فەرموودەیە باسی دوو کەس ناکات نوێژی فەرزیان نەکردبێت، بەڵکو کەسێك نوێژی فەرزی نەکردووە، و کەسێك پێی دەبەخشێت و نوێژی لەگەڵدا دەکات و نوێژەکەی سوننەتە.

و بوخاری لە صەحیحەکەیدا بابەتێکی هێناوە: (بَابُ فَضْلِ صَلَاةِ الْجَمَاعَةِ) و ئەسەرێکی بە موعەلەقی هێناوە و بەیهەقیشی ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صحیحی داناوە، دەڵێت: (وَكَانَ الْأَسْوَدُ إِذَا فَاتَتْهُ الْجَمَاعَةُ ذَهَبَ إِلَى مَسْجِدٍ آخَرَ، وَجَاءَ أَنَسٌ إِلَى مَسْجِدٍ قَدْ صُلِّيَ فِيهِ فَأَذَّنَ وَأَقَامَ وَصَلَّى جَمَاعَةً).

واتە: ئەسود ئەگەر نوێژی جەماعەتی لە دەستبچووایەت دەڕۆیشت بۆ مزگەوتێکی تر، و ئەنەس هات بۆ مزگەوتێك نوێژی تێدا کرابوو، بانگیدا و قامەتی کرد و نوێژی جەماتی کرد.

و ئەم ئەسەرە وەك دیارە پێچەوانەی کردەوەی ئیبن مەسعودە، و لەوانەیە ئەو مزگەوتە نوێژی تێداکردووە ئیمامی جێگیر و دیاریکراوی نەبووبێت، و ئەگەر بە ڕەهایی دووبارەکردنەوەی جەماعەت لە مزگەوتدا ڕێگا پێدراوبێت نابێت لۆمە و سەرزەنشتی ئەو کەسە بکرێت کە دوا دەکەوێت، چونکە دەتوانێت بڵێت: جەماعەتی دووەم نوێژ دەکەم، و ئەمەش وەك شاراوە نییە شڵەژان و ناکۆکی دەنێتەوە و لەوانەیە کەسانێك ئیمامێکیان بە دڵ نەبێت و خۆیان دوای نوێژ لە مزگەوتدا ئامادەبن و جەماعەتی تر دابمەزرێنن[1].

---

(١). بڕوانە: (تمام المنة)(١٥٨).

بەڵام بۆ ئەو مزگەوتانەی لەسەر ڕێگاکانن یان دێیەك ئیمامێکی جێگر و دیاریکراوی نەبێت ئاساییە نوێژی جەماعەتیان تێدا بکرێت، نەوەوی دەڵێت: ئەگەر مزگەوتێك ئیمامێکی جێگیر و دیاریکراوی نەبێت مەکروهـ نییە جەماعەتی دووەم و سێیەم و زیاتری تێدا بکرێت بە کۆڕا[1]؛ و ئیبن ڕەجەب دەڵێت: ئەگەر مزگەوتێك ئیمامێکی جێگیر و دیاریکراوی نەبوو مەکروهـ نییە نوێژی جەماعەتی تێدا دووبارە بکرێتەوە لای هیچ کەس لە زانایان جگە لە لەیس کوڕی سەعد کە لەو مزگەتانەش دووبارەکردنەوەی جەماعەتی بە مەکروهـ دەزانێت[2].

---

(١). (المجموع)(٤/٢٢٢).

(٢). (فتح الباري)(٦/٩).

## بَابُ سُجُودِ السَّهوِ

**وَهُوَ سَجدَتَانِ قَبلَ التَّسلِيمِ أَو بَعدَهُ؛ بِإِحرَامٍ، وَتَشَهُّدٍ، وَتَحلِيلٍ، وَيُشرَعُ: لِتَركِ مَسنُونٍ، وَلِلزِّيَادَةِ وَلَو رَكعَةً سَهوًا، وَلِلشَّكِ فِي العَدَدِ، وَإِذَا سَجَدَ الإِمَامُ تَابَعَهُ المُؤْتَمُّ.**

## بابەتی سوژدەی هەڵە

**بریتییە لە دوو سوژدە پێش سەلامدانەوە یان دوای سەلامدانەوە؛ بە (الله أكبر)ی ئیحرام، و تەحیات خوێندن، و سەلامدانەوەوە، و شەرعییە بۆ وازهێنان لە سوننەتێك، و بۆ زیادە ئەگەر ڕکاتێکیش بێت بە هەڵە، و بۆ گومان لە ژمارەی ڕکاتەکان، و ئەگەر پێشنوێژ سوژدەی هەڵەی برد نوێژکەرەکانی پشتی شوێنی دەکەون.**

(**وَهُوَ سَجدَتَانِ قَبلَ التَّسلِيمِ أَو بَعدَهُ**) سوژدەی سەهو دوو سوژدەیە بۆ پڕکردنەوەی کەموکورتی و هەڵەی نوێژ، ئەبوداود لە سەوبانەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((فِي كُلِّ سَهْوٍ سَجْدَتَانِ بَعْدَ مَا يُسَلِّمُ)).

واتە: بۆ هەموو سەهوێك دوو سوژدە هەیە دوای ئەوە سەلام دەدرێتەوە.

و ئەبویەعلا لە عائیشەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((سَجدَتَا السَّهْوِ فِي الصَّلاَةِ تُجْزِئَانِ مِنْ كُلِّ زِيَادةٍ وَنُقْصَانٍ)).

واتە: دوو سوژدەی سەهو لە نوێژدا هەموو زیادە و کەموکورتییەك قەرەبوو دەکاتەوە.

و جمهور زانایان بە واجبی دەزانن، چونکە فەرمانی پێکراوە، بوخاری و مسلم لە ئیبن مەسعودەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:

((إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ فَلْيَتَحَرَّ الصَّوَابَ، فَلْيُتِمَّ عَلَيْهِ، ثُمَّ لِيُسَلِّمْ، ثُمَّ يَسْجُدُ سَجْدَتَيْنِ)).

واتە: ئەگەر كەسێكتان گومانی هەبوو لە نوێژەكەی با هەوڵبدات بە خۆیدا بچێتەوە بۆ ئەوەی ڕاستی بۆ ساغ ببێتەوە، و نوێژەكەی لەسەر ئەوە تەواو بكات، پاشان سەلام بداتەوە، پاشان دوو سوژدە ببات.

و لیژنەی هەمیشەیی فەتوا دەڵێن: سوژدەی سەهو واجبە لەسەر ئیمام و جگەویش، ئەگەر لە نوێژەكەیدا هەڵە بكات بە نەكردنی واجبێك یان ئەنجامدانی یاساغكراوێك[1].

و زانایان ناكۆكن ئایا پێش سەلامدانەوەیە یان دوای سەلامدانەوە، لەوانەیە نزیكترین بۆچوون ئەو بۆچوونە بێت كە دەڵێت: ئەگەر شێوەی هەڵە و كەموكورتییەكە لە فەرموودەدا دیاریكرابێت پێش سەلام یان دوای سەلام سوژدەی سەهو لەو شوێنە دەبات، و ئەگەر دیاری نەكرابێت خۆی سەرپشكە لە كوێدا سوژدەی سەهو دەبات، یان ئەو بۆچوونەی كە دەڵێت: هەموو زیادەیەك دوای سەلام سوژدەی سەهوی بۆ دەبات، و هەموو كەموكورتییەك پێش سەلام سوژدەی سەهوی بۆ دەبات، و گومان ئەگەر بۆی ساغبوویەوە دوای سەلام سوژدەی سەهو دەبات، و ئەگەر بۆی ساغ نەبوویەوە پێش سەلام سوژدەی سەهو دەبات.

بەڵگە لەسەر زیادە، بوخاری و مسلم لە ئیبن مەسعودەوە ڕیوایەتی كردووە دەڵێت: ((صَلَّى بِنَا النَّبِيُّ ﷺ الظُّهْرَ خَمْسًا، فَقِيلَ: أَزِيدَ فِي الصَّلَاةِ؟، قَالَ: وَمَا ذَاكَ؟، قَالُوا: صَلَّيْتَ خَمْسًا، فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ بَعْدَمَا سَلَّمَ)).

(١). (فتاوى اللجنة الدائمة-١)(١٢٦/٧)

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ پێنج ڕکاتی بۆ کردین، گوترا: ئایا نوێژ زیادکراوە؟، فەرمووی: ئەوە چییە بۆ ئەو پرسیارە دەکەن؟، گوتیان: پێنج ڕکات نوێژت کرد، دوو سوژدەی برد دوای ئەوەی سەلامیدابوویەوە.

و بەڵگە لەسەر کەموکورتی، بوخاری لە عبداللەی کوڕی بوحەینەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَامَ من اثْنَتَينِ منَ الظُّهْرِ، لَمْ يَجْلِسْ بَيْنَهُمَا، فَلَمَّا قَضَى صَلَاتَهُ سَجَدَ سَجْدَتَينْ ثُمَّ سَلَّمَ بَعْدَ ذَلِكَ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕکاتی دووەمی نوێژی نیوەڕۆ هەستا، و لە نێوانیاندا دانەنیشت، کاتێك نوێژەکەی تەواوکرد دوو سوژدەی برد پاشان دوای ئەوە سەلامیدایەوە.

و ئەگەر گومانی هەبوو و بۆی ساغبوویەوە دوای سەلام سوژدە دەبات، بوخاری و مسلم لە ئیبن مەسعودەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ فَلْيَتَحَرَّ الصَّوَابَ، فَلْيُتِمَّ عَلَيْهِ، ثُمَّ لِيُسَلِّمْ، ثُمَّ يَسْجُدُ سَجْدَتَيْنْ)).

واتە: ئەگەر کەسێکتان گومانی هەبوو لە نوێژەکەی با هەوڵبدات بە خۆیدا بچێتەوە بۆ ئەوەی ڕاستی بۆ ساغ ببێتەوە، و نوێژەکەی لەسەر ئەوە تەواو بکات، پاشان سەلام بداتەوە، پاشان دوو سوژدە ببات.

و ئەگەر گومانی هەبوو بۆی ساغ نەبوویەوە پێش سەلام سوژدە دەبات، مسلم لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ فَلَمْ يَدْرِ كَمْ صَلَّى ثَلَاثًا أَمْ أَرْبَعًا، فَلْيَطْرَحِ الشَّكَّ وَلْيَبْنِ عَلَى مَا اسْتَيْقَنَ؛ ثُمَّ يَسْجُدُ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ)).

واتە: ئەگەر کەسێك گومانی بۆ دروستبوو لە نوێژەکەیدا نەزانێت سێ ڕکات یان چوار ڕکات نوێژی کردووە، با واز لە گومان بهێنێت و پشت بەوە ببەستێت کە دڵنیاییە، پاشان دوو سوژدە ببات پێش ئەوەی سەلام بداتەوە.

(**بِإِحرَامٍ**) ئەگەر سوژدەی سەهو دوای سەلام بوو (الله أكبر) دەخوێنێت، پاشان دوو سوژدەی هاوشێوەی سوژدەی نوێژەکەی دەبات پاشان سەلام دەداتەوە، بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەمە لەفزی بوخارییە، دەڵێت: ((صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ إِحْدَى صَلاَتِي الْعَشِيِّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ قَامَ إِلَى خَشَبَةٍ فِي مُقَدَّمِ الْمَسْجِدِ، فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَيْهَا، وَفِي الْقَوْمِ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، فَهَابَا أَنْ يُكَلِّمَاهُ، وَخَرَجَ سَرَعَانُ النَّاسِ، فَقَالُوا: أَقُصِرَتِ الصَّلاَةُ! وَرَجُلٌ يَدْعُوهُ النَّبِيُّ ﷺ ذَا الْيَدَيْنِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَنَسِيتَ أَمْ قُصِرَتْ؟ فَقَالَ: لَمْ أَنْسَ وَلَمْ تُقْصَرْ، فَقَالَ: بَلَى، قَدْ نَسِيتَ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ كَبَّرَ، فَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ، أَوْ أَطْوَلَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَكَبَّرَ، ثُمَّ وَضَعَ رَأْسَهُ، فَكَبَّرَ، فَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ، أَوْ أَطْوَلَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ وَكَبَّرَ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات نوێژی نیوەڕۆ یان عەسری کرد، پاشان سەلامیدایەوە، پاشان هەستا ڕۆیشت بۆ لای دارێك لە پێشی مزگەوتەوە و دەستی خستەسەری، و ئەبوبەکر و عومەریش لە نێو خەڵکەکەدا بوون لەبەر ڕێز و گەورەیی قسەیان لەگەڵدا نەکرد، و ئەو خەڵکەیان پەلەیان بوو لە مزگەوت دەرچوون و گوتیان: نوێژ کورتبووەتەوە، و پیاوێك لەگەڵ خەڵکەکەدا بوو پیاوی دەگوترا (ذو اليدين)، گوتی: ئایا لەبیرت چوو یان نوێژ کورتکراوەتەوە؟، فەرمووی: نەلەبیرم چووە و نوێژیش کورت نەکراوەتەوە، گوتی: بەڵێ، لەبیرت چوو، دوو ڕکات نوێژی کرد پاشان سەلامیدایەوە، پاشان الله أکبری کرد، و

سوژدەی برد وەك سوژدەی نوێژەکەی یان درێژتر، پاشان سەری بەرزکردەوە و الله أکبری کرد، پاشان سەری دانایایەوە و الله أکبری کرد، و سوژدەی برد وەك سوژدەی نوێژەکەی یان درێژتر، پاشان سەری بەرزکردەوە و الله أکبری کرد.

و نەوەوی دەڵێت: شەرعییە الله أکبر بخوێندرێت بۆ سوژدەی سەهو و ئەمە ئیجماعی لەسەرە[1].

(**وَتَشَهُّدٍ**) تەحیات خوێندن بۆ سوژدەی سەهو بەڵگەی صەحیحی لەسەر نییە، و ئەو فەرموودەیە ئەبوداود و ترمزی لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى بِهِمْ، فَسَهَا فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ تَشَهَّدَ، ثُمَّ سَلَّمَ))؛ ئەلبانی بە زەعیف و شازی داناوە.

(**وَتَحلِيلٍ**) ئەگەر سوژدەی سەهو لە دوای سەمدانەوە بێت سەلامدەداتەوە، دوای دوو سوژدە سەهوەکەش سەلام دەدرێتەوە، لە فەرموودەکەی عبداللەی کوڕی بوحەینە گوتی: ((... فَلَمَّا قَضَى صَلَاتَهُ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ بَعْدَ ذَلِكَ)).

(**وَيُشرَعُ: لِتَركِ مَسنُونٍ**) هەندێك لە زانایان دەڵێن: بە بەڵگەی ئەو فەرموودانەی باسی ئەوە دەکەن هەموو هەڵەیەك دوو سوژدەی سەهوی بۆ دەبرێت، دەڵێن: ئەگەر لە نوێژدا سوننەتیش وازی لێ بهێنرێت سوژدەی سەهو دەبرێت، مسلم لە ئیبن مەسعودەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِذَا نَسِيَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ)).

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە لە بیری چوو دوو سوژدە ببات.

---

(١). (المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج)(٥/٩٥).

و ئەبوداود لە سەوبانەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((إِذَا نَسِيَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ))؛ و دەفەرمویێت: ((فِي كُلِّ سَهْوٍ سَجْدَتَانِ بَعْدَ مَا يُسَلِّمُ)).

واتە: بۆ هەموو سەهوێك دوو سوژدە هەیە دوای ئەوە سەلام دەدرێتەوە.

و بوخاری لە صەحیحەکەیدا دەڵێت: (بَابُ السَّهْوِ فِي الْفَرْضِ وَالتَّطَوُّعِ): (وَسَجَدَ ابْنُ عَبَّاسٍ بِسَجْدَتَيْنِ بَعْدَ وِتْرِهِ).

واتە: بابەتی سەهو لە فەرز و سوننەتدا: و ئیبن عەباس رضي الله عنهما دوو سوژدەی دوای نوێژی ویترەکەی بردووە.

و ئیبن مونزر لە (الأوسط) لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: (إِذَا أَوْهَمْتَ فِي التَّطَوُّعِ فَاسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ).

واتە: ئەگەر لە سوننەتدا هەڵەت کرد دوو سوژدەی سەهو ببە.

پاشان ئیبن مونزر دەڵێت: ئەمە بۆچوونی حەسەنی بەصری و سەعیدی کوڕی جوبەیر و قەتادە و سەوری و مالك و ئەوزاعی و شافعی و ئەحمەد و هاوەڵانی ڕائییە، و ئیبن سیرین دەڵێت: ئەگەر لە سوننەتدا هەڵەی کرد سوژدەی لەسەر نییە[1].

و ئیبن ئەبوشەیبە کۆمەڵە ئەسەرێکی لە (المصنف)دا هێناوە لە بابەتی (الرَّجُلُ يَسْهُو فِي التَّطَوُّعِ مَا يَصْنَعُ) هەندێکیان بۆچوونیان وایە سوننەت سوژدەی

---

(١). (الأوسط في السنن والإجماع والاختلاف)(٣/٣٢٥).

سەهوی بۆ دەبردرێت، بۆ نموونە لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: (سَجْدَتَا السَّهْوِ فِي النَّوَافِلِ كَسَجْدَتَيِ السَّهْوِ فِي الْمَكْتُوبَةِ).

واتە: دوو سوژدەی سەهو لە نوێژە سوننەتەکان وەك ئەو دوو سوژدە سەهوەیە کە بۆ سەهوی نوێژی فەرز دەبردرێت.

و لە ئیبن عەونەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: (سَأَلْتُ مُحَمَّدًا، عَنْ شَيْءٍ مِنَ الْوَهْمِ فِي التَّطَوُّعِ، فَقَالَ: لَا أَدْرِي أَيْنَ مَوْضِعَهُ، فَقُلْتُ: أَسْجُدُ بَعْدَهُ سَجْدَتَيْنِ؟ قَالَ: أَتُشَبِّهُهَا بِالْمَكْتُوبَةِ أَمَّا أَنَا فَلَوْ كُنْتُ لَمْ أَفْعَلْ)[١].

واتە: پرسیارم کرد لە محمد سەبارەت بە سەهو لە نوێژی سوننەتدا، گوتی: نازانم شوێنەکەی لە کوێیە، گوتم: دوای دوو سوژدەی کۆتایی ئەو دوو سوژدەیە دەبەم؟ گوتی: ئایا دەیچوێنیت بە نوێژە فەرزەکان، بەڵام ئەگەر من ئەو حاڵەم بەسەردا بێت سوژدەی سەهو نابەم.

(**وَلِلزِّيَادَةِ وَلَو رَكعَةً سَهوًا**) سوژدەی سەهو وەك سەرەتا ئاماژەم پێکرد یەکێك لە هۆکارەکانی زیادکردنە بەشێوەیەکی گشتی، بوخاری و مسلم لە ئیبن مەسعودەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((صَلَّى بِنَا النَّبِيُّ ﷺ الظُّهْرَ خَمْسًا، فَقِيلَ: أَزِيدَ فِي الصَّلَاةِ؟، قَالَ: وَمَا ذَاكَ؟، قَالُوا: صَلَّيْتَ خَمْسًا، فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ بَعْدَمَا سَلَّمَ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ پێنج ڕکاتی بۆ کردین، گوترا: ئایا نوێژ زیادکراوە؟، فەرمووی: ئەوە چییە بۆ ئەو پرسیارە دەکەن؟، گوتیان: پێنج ڕکات نوێژت کرد، دوو سوژدەی برد دوای ئەوەی سەلامیدایەوە.

---

(١). بڕوانە: (المصنف)(١/٣٨٦).

(**وَلِلشَّكِ فِي العَدَدِ**) مسلم لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ فَلَمْ يَدْرِ كَمْ صَلَّى ثَلَاثًا أَمْ أَرْبَعًا، فَلْيَطْرَحِ الشَّكَّ وَلْيَبْنِ عَلَى مَا اسْتَيْقَنَ؛ ثُمَّ يَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ)).

واتە: ئەگەر کەسێك گومانی بۆ دروست لە نوێژەکەیدا نەزانێت سێ ڕکات یان چوار ڕکات نوێژی کردووە، با واز لە گومان بهێنێت و پشت بەوە ببەستێت کە دڵنیاییە، پاشان دوو سوژدە ببات پێش ئەوەی سەلام بداتەوە.

(**وَإِذَا سَجَدَ الإِمَامُ تَابَعَهُ المُؤْتَمُّ**) بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِنَّمَا جُعِلَ الْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَلَا تَخْتَلِفُوا عَلَيْهِ)).

واتە: بێگومان پێشنوێژ دانراوە بۆ ئەوە چاوی لێ بکرێت، ناکۆك مەبن لەگەڵیدا.

چەند پرسێك: یەکەم: ئەگەر کەسێك لە نوێژ دوا کەوتبێت و ئیمام سوژدەی سەهو ببات چی دەکات؟ ئەگەر ئەگەر ئیمام سوژدەی سەهوی پێش سەلام برد پێویستە ئەو کەسەی دواکەوتووە سوژدەی سەهوی لەگەڵدا ببات پاشان ئیمام سەلامیدایەوە ئەو کەسە نوێژەکەی خۆی تەواو دەکات، بەڵام ئەگەر دوای سەلامدانەوەی نوێژەکەی سوژدەی برد سوژدەی سەهوی لەگەڵدا نابات بەڵکو بە سەمدانەوەی پەیوەندی بە ئیمامەکەیەوە نامێنێت.

پاشان ئەو کەسەی دواکەتووە ئەگەر ئەو کاتەی ئیمام هەڵەی کردووە ئەمەیش گەشتبێتە هەڵەکەی، ئەگەر ئیمامەکەی پێش سەلام سوژدەی سەهوی بردبێت ئەو کەسەی دواکەوتووە پێش سەلام سوژدەی سەهو دەبات پاشان سەلام دەداتەوە، چونکە سوژدەی سەهوی یەکەمجاری لە شوێنی خۆیدا نەبووە بەڵکو لەبەر چاولێکردنی ئیمامەکەی بووە، و ئەگەر ئیمام سوژدەی سەهوی دوای سەلامدانەوە برد و ئەمیش گەیشتبیتە هەڵەی ئیمامەکەی ئەو کاتە دوای تەواوکردنی نوێژەکەی و سەلامدانەوەی دوو سوژدەی سەهو دەبات و سەلام دەداتەوە[1].

دووە: نوێژ مردوو سوژدەی سەهوی تێدا نییە، چونکە نوێژەکە خۆی سوژدەی تێدا نییە.

سێیەم: ئەگەر کەسێك لە سوژدەی سەهودا هەڵە بکات، دووبارە سوژدەی سەهو نابات، ئیبن مونز دەڵێت: زانایان ناکۆن سەبارەت بە کەسێك لە سوژدەی سەهودا سەهو بکات، کۆمەڵێك لە زانایان دەڵێن: سوژدەی سەهوی لەسەر نییە، و ئەوە بۆچوونی نەخعیی و حەسەن و موغیرە و ئیبن ئەبولەیلا و بەتی و مەنصوری کوڕی زازان و مالك و سەوری و لەیسی کوری سەعد و شافعی و حەسەنی کوڕی صالح و ئەحمەد و ئیسحاقە، و ئیسحاق دەڵێت: ئەوە ئیجماعی زانایانی تابعی لەسەر، و بۆچوونی هاوەڵانی ڕەئییە، و قەتادە دەڵێت: ئەو کەسەی لە سوژدەی سەهوەکەیدا سەهو بکات سوژدەکەی دووبارە دەکاتەوە[2].

---

(١). بڕوانە: (مجموع فتاوى ورسائل العثيمين)(٢٥/١٤).

(٢). (الأوسط في السنن والإجماع والاختلاف)(٣٢٦/٣).

چوارەم: سوژدەی سەهو ڕوکن قەرەبوو ناکاتەوە، بەڵام واجب قەرەبوو دەکاتەوە، بۆ نموونە: کەسێك لە نوێژەکەیدا ڕکوع نەبات یەکسەر دابنەوێتەوە بۆ سوژدە، دەبێت بگەڕێتەوە ڕکوعەکەی ببات پاشان سوژدەی سەهوی بۆ ببات، بەڵام کەسێك الله أکبری گواستنەوە نەخوێنێت ناگەڕێتەوە بەڵکو سوژدەی سەهوی بۆ دەبات.

پێنجەم: کەسێك تەحیاتی یەکەم نەخوێنێت، پێش ئەوەی ڕاست بێتەوە دادەنیشێت و تەحیاتەکەی دەخوێنێت پاشان سوژدەی سەهو دەبات بەڵام ئەگەر ڕاستبوویەوە ناگەڕێتەوە پاشان سوژدەی سەهو دەبات، ئەبوداود لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِذَا قَامَ الْإِمَامُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ، فَإِنْ ذَكَرَ قَبْلَ أَنْ يَسْتَوِيَ قَائِمًا فَلْيَجْلِسْ، فَإِنِ اسْتَوَى قَائِمًا فَلَا يَجْلِسْ، وَيَسْجُدْ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ)).

واتە: ئەگەر پێشنوێژ لە ڕکاتی دووەمدا هەستا و تەحیاتی نەخوێند، ئەگەر بیریکەوتەوە پێش ئەوەی ڕێك ڕابوەستێت با دابنیشێت، و ئەگەر ڕێك ڕاوەستا با دانەیشێت، و دوو سوژدەی سەهو دەبات.

شەشەم: ئەگەر کەسێك دوو هەڵە بکات هەڵەیەکیان پێویست بێت پێش سەلام سوژدەی سەهوی بۆ ببردرێت، و هەڵەکەی تریات پێویست بێت دوای سەلام سوژدەی سەهوی بۆ ببردرێت، زانایان دەڵێن: پێش سەلامدانەوە سوژدە سەهو دەبات[1].

---

(١). بڕوانە: (مجموع فتاوى ورسائل العثيمين)(١٠٤/١٤).

حەوتەم: کەسێك سوژدەی سەهوی لەبیر بچێت، ئەگەر زۆری پێ بچێت پاشان بیر بکەوێتەوە سوژدەی سەهو نابات و نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، و ئەوە مەزهەبی نوێی شافعییە و هاوەڵانی ڕەئییە[1].

هەشتەم: ئەو کەسەی بە جەماعەت لە پشتی ئیماوە نوێژ دەکات ئەگەر هەڵە بکات سوژدەی سەهوی لەسەر نییە، نەوەوی ئیجماعی زانایانی هێناوە کەسێك لەگەڵ ئیمامدا هەڵە بکات سوژدەی سەهوی لەسەر نییە، بەڵام ئەگەر دوا کەوتبێت و دوای ئەوە ئیمام سەلام دەداتەوە هەڵە بکات پێویستە لەسەری سوژدەی سەهو ببات، چونکە لەو کاتەدا پەیوەندی بە ئیمامەکەیەوە نەماوە[2].

و ئەو فەرموودەیە دارەقوتنی لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((لَيْسَ عَلَى مَنْ خَلْفَ الْإِمَامِ سَهْوٌ، فَإِنْ سَهَا الْإِمَامُ، فَعَلَيْهِ وَعَلَى مَنْ خَلْفَهُ))؛ ئەلبانی بە زەعیفی داناوە.

---

(١). بڕوانە: (المغني)(٢/٢٨).

(٢). بڕوانە: (المجموع)(٤/١٤٣).

## بَابُ القَضَاءِ لِلفَوَائِتِ

**إِن كَانَ التَّركُ عَمدًا لَا لِعُذرٍ؛ فَدَيْنُ اللّٰهِ أَحَقُّ أَن يُقضَى، وَإِن كَانَ لِعُذرٍ فَلَيسَ بِقَضَاءٍ؛ بَل أَدَاءٌ فِي وَقتِ زَوَالِ العُذرِ، إِلَّا صَلَاة العِيدِ؛ فَفِي ثَانِيهِ.**

## بابەتی قەزاكردنەوەی نوێژی لەدەستچوو

**ئەگەر وازهێنان لە نوێژ بە ئەنقەست بوو نەوەك بۆ عوزرێک؛ ئەوە قەرزی خوا شایانترە قەزا بكرێتەوە، و ئەگەر لەبەر عوزرێك بوو قەزا نییە؛ بەڵكو ئەداكردنی نوێژەكەیە لە كاتێكدا كە عوزرەكە نامێنێت، جگە لە نوێژی جەژن ئەگەر لە دەستبچێت؛ لە ڕۆژی دووەمدا دەكرێتەوە.**

(**إِن كَانَ التَّركُ عَمدًا لَا لِعُذرٍ؛ فَدَيْنُ اللّٰهِ أَحَقُّ أَن يُقضَى**) زانایان ناكۆكن كەسێك بە ئەنقەست نوێژێك نەكات هەتاكو كاتەكەی تەواو دەبێت ئایا بۆی هەیە قەزای بكاتەوە یان تاوانبار دەبێت و دەبێت تەوبە لەو تاوانەی بكات و هەوڵبدات نوێژی سوننەتی زۆر بكات بەڵكو خوای پەروەردگار بۆی قەرەبوو بكاتەوە، جمهوری زانایان بۆچوونیان وایە كەسێك بە ئەنقەست نوێژێك نەكات هەتاكو كاتەكەی تەواو دەبێت دەبێت قەزای بكاتەوە، بوخاری و مسلم لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتیان كردووە دەڵێت: ((جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا صَوْمُ شَهْرٍ، أَفَأَقْضِيهِ عَنْهَا؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَدَيْنُ اللهِ أَحَقُّ أَنْ يُقْضَى)).

واتە: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، دایكم مرد ڕۆژووی مانگێكی لەسەرە، ئایا لەبری قەزای بكەمەوە؟ فەرمووی: بەڵێ، قەرزی خوا شایانترە قەزا بكرێتەوە.

و هەندێك لە زانایان ئیجماعیان هێناوە لەسەر ئەوەی نوێژێك بە ئەنقەست نەکرابێت قەزا دەکرێتەوە، نەوەوی دەڵێت: هەموو ئەو زانایانەی ئیعتبار بۆ قسەیان دەکرێت کۆدەنگ هەرکەسێك نوێژێك بە ئەنقەست واز لێ بهێنێت پێویستە لەسەری قەزای بکاتەوە، و ئیبن حەزم پێچەوانەیانە و دەڵێت: هەرگیز ناتوانێت قەزای بکاتەوە و صەحیح نییە، و دەڵێت: بەڵکو کردەوەی چاکەی زۆر و نوێژی سوننەتی زۆر دەکات بۆ ئەوەی تەرازووی چاکەکانی قورس بکات لە رۆژی قیامەتدا و داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکات و تەوبە دەکات[1].

و محمدی کوڕی نەصری مەروەزی دەڵێت: ئەگەر پیاوێك بە ئەنقەست نوێژێك نەکات هەتاکو کاتەکەی تەواو دەبێت قەزای دەکاتەوە، هیچ ناکۆکییەك نازانین لەوبارەیەوە ئەوە نەبێت کەلە حەسەنەوە ڕیوایەت دەکرێت، هەرکەسێك ئەو کەسە تەکفیر بکات داوای تەوبەی لێ دەکات و تەوبەکەی قەزاکردنەوەی نوێژەکەیەتی و گەڕانەوەیەتی بۆ ئیسلام، و هەرکەسێك تەکفیری نەکات بە تاوانباری دەزانێت و پێویستی دەکات لەسەری قەزای بکاتەوە[2].

و ئیبن قودامە دەڵێت: هیچ ناکۆکییەك نییە لە نێوان موسڵماناندا سەبارەت بە کەسێك نوێژ واز لێ بهێنێت دەبێت قەزای بکاتەوە[3].

---

(١). (المجموع)(٣/٧١).

(٢). (تعظيم قدر الصلاة)(٢/٩٧٥).

(٣). (المغني)(٣/٣٥٧).

بەڵام هەندێك لە زانایان بۆچوونیان وایە جگە لە کەسێك کە نوێژی لەبیر بچێت یان خەوی لێ بکەوێت هەتاکو کاتەکەی تەواو دەبێت، هەرکەسێك بە ئەنقەست نوێژ نەکات هەتاکو کاتەکەی تەواو دەبێت نوێژ قەزا ناکاتەوە بەڵکو تاوانبارە و دەبێت تەوبە بکات و نوێژ سوننەت زۆر بکات بەڵکو خوای پەروەردگار قەرەبوو بکاتەوە، ئەحمەد و خاوەن سوننەنەکان لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ النَّاسُ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ أَعْمَالِهِمُ الصَّلَاةُ، قَالَ: يَقُولُ رَبُّنَا جَلَّ وَعَزَّ لِمَلَائِكَتِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ: انْظُرُوا فِي صَلَاةِ عَبْدِي أَتَمَّهَا أَمْ نَقَصَهَا؟ فَإِنْ كَانَتْ تَامَّةً كُتِبَتْ لَهُ تَامَّةً، وَإِنْ كَانَ انْتَقَصَ مِنْهَا شَيْئًا، قَالَ: انْظُرُوا هَلْ لِعَبْدِي مِنْ تَطَوُّعٍ؟ فَإِنْ كَانَ لَهُ تَطَوُّعٌ، قَالَ: أَتِمُّوا لِعَبْدِي فَرِيضَتَهُ مِنْ تَطَوُّعِهِ)).

واتە: یەکەم شت کە لێپرسینەوەی خەڵکی لەسەر دەکرێت لە ڕۆژی قیامەتدا لە کردەوەکانیان نوێژە، دەفەرموێت: خوای باڵادەست بە فریشتەکان دەفەرموێت و خۆی لە هەمووان زاناترە: بڕواننە نوێژی بەندەکەم ئایا بە تەواوی و ڕێکوپێکی بەجێیهێناون، یان کەمتەرخەمی کردووە و بە ناتەواوی ئەنجامیداون؟ ئەگەر بە تەواوی و ڕێکوپێکی بەجێی هێنابوون بەوشێوەیە بۆی دەنوسرێت، و ئەگەر لە هەندێکی کەمتەرخەمی کردبێت و بە ناتەواوی بەجێی هێنابێت، دەفەرموێت: بزانن بەندەکەم نوێژی سوننەتی هەیە؟ ئەگەر نوێژی سوننەتی هەبوو، دەفەرموێت: نوێژە فەرزەکانی بەندەکەم لە نوێژە سوننەتەکانی تەواو بکەن.

بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا ١٠٣﴾(النساء).

واتە: بێگومان نوێژ لەسەر باوەڕداران فەرزکراوە، و دەبێت لە کاتی دیاری کراودا بەجێی بهێنن.

و بوخاری و مسلم لە ئەنەسەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ نَسِيَ صَلاَةً، فَلْيُصَلِّ إِذَا ذَكَرَهَا، لاَ كَفَّارَةَ لَهَا إِلاَّ ذَلِكَ: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ١٤﴾(طه)).

واتە: هەرکەسێك نوێژێکی لەبیرچوو، با نوێژەکەی بکات ئەگەر بیرکەوتەوە، هیچ کەفارەتێکی نییە جگە لەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: نوێژ بەوشێوەیە بکە کە فەرمانت پێکراوە بۆ ئەوەی یادی منی تێدا بکەیت.

و مسلم لە ئەبوقەتادەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((خَطَبَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فَقَالَ: ... أَمَا إِنَّهُ لَيْسَ فِي النَّوْمِ تَفْرِيطٌ، إِنَّمَا التَّفْرِيطُ عَلَى مَنْ لَمْ يُصَلِّ الصَّلاَةَ حَتَّى يَجِيءَ وَقْتُ الصَّلاَةِ الأُخْرَى، فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَلْيُصَلِّهَا حِينَ يَنْتَبِهُ لَهَا)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ گوتاری بۆ خوێندینەوە فەرمووی: لە خەودا کەمتەرخەمی نییە، بەڵام کەسێك کەمتەرخەمە کە نوێژ نەکات هەتاکو کاتی نوێژی تر دێت، هەرکەسێك خەوی لێکەوت کاتێ بەئاگا دێت نوێژەکەی بکات.

و ئەوە بۆچوونی داودی زاهیری و ئیبن حەزم و بۆچوونێکە لە مەزهەبی ئەحمەد و ئەبین تەیمییە و ئیبن قەیم و ئیبن باز و ئیبن عوسەیمین و ئەلبانی و موقبل وادعییە، و ئەم بۆچوونەش ڕاجح و پەسەندە.

(**وَإِن كَانَ لِعُذرٍ فَلَيسَ بِقَضَاءٍ؛ بَل أَدَاءٌ فِي وَقتِ زَوَالِ العُذرِ**) ئەگەر نوێژ لە دەست بچێت لەبەر خەو و لەبیرچوون فەرموودەکەی ئەنەس و ئەبوقەتادە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کاتی ئەو کەسە خەوی لێ دەکەوێت یان لەبیر دەچێت ئەو کاتەیە کە بیری دەکەوێتەوە یان لە خەو هەڵدەستێت، بەوەش پێی ناوترێت قەزاکردنەوەی نوێژ بەڵکو بەجێهێنانی نوێژە لە کاتی خۆیدا بۆ ئەو دوو جۆرە کەسە.

(**إِلَّا صَلَاةَ العِيدِ**) ئەگەر کەسێك یان کۆمەڵە کەسێك نەزانن جەژنە هەتاکو کاتی نوێژەکە بەسەردەچێت، بۆ ڕۆژی دواتر نوێژی جەژن دەکەن، ئەحمەد و خاوەن سونەنەکان جگە لە ترمزی لە ئەبوعومەیری کوڕی ئەنەسەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((حَدَّثَنِي عُمُومَةٌ لِي مِنَ الْأَنْصَارِ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ: غُمَّ عَلَيْنَا هِلَالُ شَوَّالٍ، فَأَصْبَحْنَا صِيَامًا، فَجَاءَ رَكْبٌ مِنْ آخِرِ النَّهَارِ، فَشَهِدُوا عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، أَنَّهُمْ رَأَوْا الْهِلَالَ بِالْأَمْسِ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ النَّاسَ أَنْ يُفْطِرُوا مِنْ يَوْمِهِمْ، وَأَنْ يَخْرُجُوا لِعِيدِهِمْ مِنَ الْغَدِ)).

واتە: مامە ئەنصارییەکانم لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیان باسکردم دەڵێت: ئاسمان هەور بوو مانگی شەوالمان نەبینی ڕۆژوومان گرت، کۆمەڵە سوارییەك لە کۆتایی ڕۆژدا هاتن، شایەتییاندا لای پێغەمبەری خوا ﷺ کە دوێنێ مانگیان بینیوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد ئەو ڕۆژە ڕۆژوەکەیان بشکێنن، و بەیانی دەربچن بۆ نوێژی جەژن.

## بابُ صَلاةِ الجُمُعَةِ

**تَجِبُ عَلَى كُلِّ مُكَلَّفٍ إلَّا المَرأَةَ، وَالعَبدَ، وَالمُسَافِرَ، وَالمَرِيضَ، وَهِيَ كَسَائِرِ الصَّلَوَاتِ؛ لا تُخَالِفُهَا إلَّا فِي مَشرُوعِيَّةِ الخُطبَتَينِ قَبلَهَا؛ وَوَقتُهَا: وَقتُ الظُّهرِ.**

**وَعَلَى مَن حَضَرَهَا: أَن لَا يَتَخَطَّى رِقَابَ النَّاسِ، وَأَن يُنصِتَ حَالَ الخُطبَتَينِ، وَنُدِبَ لَهُ: التَّبكِيرُ، وَالتَّطَيُّبُ، وَالتَّجَمُّلُ، وَالدُّنُوُّ مِن الإمَامِ، وَمَن أَدرَكَ رَكعَةً مِنهَا، فَقَد أَدرَكَهَا؛ وَهِيَ فِي يَومِ العِيدِ رُخصَةٌ.**

## بابەتی نوێژی جومعە

**نوێژی جومعە واجبە لەسەر هەموو موكەلەفێك جگە لە ئافرەت، و كۆیلە، و موسافر، و نەخۆش، و وەك نوێژەكانی ترە؛ و جیاوازی نییە لەگەڵ نوێژەكانی تر جگە لە شەرعییەتی خوێندنی دوو گوتار پێش نوێژەكەی، و كاتەكەی كاتی نوێژی نیوەڕۆیە.**

**و پێویستە لەسەر ئەو كەسەی ئامادەی نوێژی جومعە دەبێت: هەنگاو نەنێت بەسەر خەڵكدا، و بێدەنگ بێت كاتی دوو گوتارەكە، و سوننەتە بۆی: زوو بچێت بۆ مزگەوت، و بۆنی خۆش لە خۆی بدات، و خۆی بڕازێنێتەوە و پۆشاكی جوان لەبەر بكات، و لە نزیك ئیمامەوە دابنیشێت، و هەركەسێك بگات بە ڕكاتێكدا، گەیشتووە بە نوێژی جومعەدا؛ و ئامادەبوونی نوێژی جومعە لە ڕۆژی جەژندا ڕوخسەتە.**

(**تَجِبُ عَلَى كُلِّ مُكَلَّفٍ**) واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێكی عاقڵی باڵغ ئامادەی نوێژی جومعە ببن، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٩﴾(الجمعة).

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر بانگدرا لە ڕۆژی جومعە بڕۆن بۆ نوێژ و زیكری خوا و گوێگرتن لە ئامۆژگاری ئیمام، و دەستهەڵگرن لە كڕین و فرۆشتن، ئەوە خێر و چاكەیە بۆتان ئەگەر ئێوە بزانن.

و مسلم لە ئیبن عومەر و ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتی کردووە: ((أَنَّهُمَا سَمِعَا رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: عَلَى أَعْوَادِ مِنْبَرِهِ لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عَنْ وَدْعِهِمُ الْجُمُعَاتِ، أَوْ لَيَخْتِمَنَّ اللهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ، ثُمَّ لَيَكُونُنَّ مِنَ الْغَافِلِينَ)).

واتە: لە پێغەمبەری خوایان ﷺ بیستووە لەسەر مینبەرە دارەکەیەوە دەیفەرموو:کەسانێك کۆتایی دەهێنن بە وازهێنانیان لە نوێژی جومعە، یان خوا مۆر دەدات بەسەر دڵەکانیاندا، پاشان لەو کەسانە دەبن کە بێئاگان.

و ئەبوداود و نەسائی لە حەفصەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەمە لەفزی نەسائییە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا دەفەرموێت: ((رَوَاحُ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ)).

واتە: ڕۆیشتن بۆ نوێژی جومعە واجبە لەسەر هەموو باڵغێك.

**(إلَّا المَرأَةَ، وَالعَبدَ، وَالمُسَافِرَ، وَالمَرِيضَ)** نوێژی جومعە لەسەر ئافرەت و کۆیلە و موسافر و نەخۆش واجب نییە، ئەبوداود و لە تارقی کوڕی شیهابەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((الْجُمُعَةُ حَقٌّ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ فِي جَمَاعَةٍ إِلَّا أَرْبَعَةً: عَبْدٌ مَمْلُوكٌ، أَوِ امْرَأَةٌ، أَوْ صَبِيٌّ، أَوْ مَرِيضٌ)).

واتە: جومعە حەق و واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێك لەگەڵ جەماعەتدا جگە لە چوار کەس: کۆیلەیەك خاوەنی هەبێت، و ئافرەت، و منداڵ، و نەخۆش.

نوسەر باسی منداڵی نەکردووە، چونکە نەڕۆژی جومعە و نەهیچ نوێژێکی تری لەسەر فەرز نییە، و موسافر، تەبەرانی لە (المعجم الأوسط) و دارقوتنی لە ئیبن

عومەرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((لَيْسَ عَلَى مُسَافِرٍ جُمُعَةٌ)).

واتە: موسافر جومعەی لەسەر نییە.

**(وَهِيَ كَسَائِرِ الصَّلَوَاتِ؛ لا تُخَالِفُهَا إِلَّا فِي مَشْرُوعِيَّةِ الخُطبَتَينِ قَبلَهَا)**

نوسەر بەم بڕگەیە ڕەدی ئەوانە دەداتەوە کە مەرجی پێویستی هەبوو کاربەدەستی گەورە و شار و ژمارەی دیاریکراو دادەنێن بۆ واجبوونی جومعە بەڵام ئەو مەرجانە هیچ بەڵگەی لەسەر نییە، و زانایان ناکۆن چەند کەس جومعەیان پێ دادەمەزرێت، و چەند ژمارەیەکیان باسکردووە، لەوانەیە بەهێزترینیان ئەو بۆچوونە بێت کە دەڵێت: پێویستە سێ کەس بن، ئیمام و دوو کەسی تر، چونکە دوو کەمترین ژمارەی کۆیە، ئەبوداود و نەسائی لە ئەبودەردائەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((مَا مِنْ ثَلاثَةٍ فِي قَرْيَةٍ، وَلاَ بَدْوٍ، لاَ تُقَامُ فِيهِمُ الصَّلاَةُ إِلاَّ قَد اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمِ الشَّيْطَانُ، فَعَلَيْكُمْ بِالجَمَاعَةِ، فَإِنَّمَا يَأْكُلُ الذِّئْبُ مِنَ الغَنَمِ القَاصِيَةَ)).

واتە: هیچ سێ کەسێك نییە لە گوندێك یان بیابانێکدابن، نوێژی جەماعە نەکەن ئیللا شەیتان زاڵ دەبێت بەسەریاندا، نوێژەکانتان بە جەماعەت بکەن، چونکە بێگومان گورگ ئەو مەڕە دەخوات کەلە ڕانە مەڕەکە دوور دەکەوێتەوە.

و ئەوە بۆچوونی هەندێك لە زانایانی سەلەفە، ئیبن قودامە دەڵێت: ئەحمەد و ئەوزاعی و ئەبوسەور دەڵێن: جومعە بە سێ کەس دادەمەزرێت، چونکە ناوی کۆ دەیانگرێتەوە[١].

---

(١). بڕوانە: (المغني)(٣/٢٠٤).

و ئەگەر کۆمەڵە خەڵك پێکەوە لە مزگەوت کۆببنەوە کەسێك نەبێت گوتاریان بۆ بخوێنێت نوێژی نیوەڕۆ دەکەن.

و پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام دوو گوتاری لە ڕۆژی جومعەدا خوێندووەتەوە و لە نێوانیاندا دانیشتووە، بوخاری و مسلم لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ قَائِمًا ثُمَّ يَقْعُدُ، ثُمَّ يَقُومُ كَمَا تَفْعَلُونَ الْآنَ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بەپێوە گوتاری دەخوێندن، پاشان دادەنیشت، پاشان هەڵدەستا وەك ئەمڕۆ ئەنجامی دەدەن.

و زانایان ناکۆکن سەبارەت بە حوکمی گوتارەکانی ڕۆژی جومعە، جمهوری زانایان بۆچوونیان وایە گوتار خوێندن مەرجە، ئیبن عبدالبر دەڵێت: ئیجماع دامەزراوە ئەگەر ئیمام گوتار نەخوێنێت بۆ خەڵك چوار ڕکات نوێژ دەکەن[1]؛ و ئیبن قودامە دەڵێت: گوتار مەرجی جومعەیە، جومعە بەبێ گوتار صەحیح نییە، ئەوە بۆچوونی عەتا و نەخعی و قەتادە و سەوری و شافعی و ئیسحاق و ئەبوسەور و هاوەڵانی ڕەئییە، ناکۆکی نازانین لەوبارەیەوە، جگە لە حەسەن، دەڵێت: نوێژەکەیان دروستە ئیمام گوتار بخوێنێت یان گوتار نەخوێنێت[2].

و هەندێك لە زانایان بە واجبی دەزانن، بە بەڵگەی ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام گوتاری خوێندووە، و قسەکردن لە کاتی گوتارداندا حەرامە، ئەوە بۆچوونی ئەلبانییە، و هەندێك بە سوننەتی دەزانن ئەوە بۆچوونی داودی زاهیرییە.

---

(١). (الاستذكار)(٢/٣١).

(٢). (المغني)(٢/٢٢٤).

(**وَوَقتُهَا: وَقتُ الظُّهرِ**) لە بنەڕەتدا کاتی نوێژ جومعە کاتی نوێژی نیوەڕۆیە و ئەوە بۆچوونی جمهوری زانایانە، بوخاری لە ئەنەسی کوڕی مالکەوە ڕیوایەتی کردووە: ((أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي الْجُمُعَةَ حِينَ تَمِيلُ الشَّمْسُ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی جومعەی دەکرد کاتێك خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایدەدا؛ کە ئەو کاتە کاتی نوێژی نێوەڕۆیە.

و مسلم لە سەلەمەی کوری ئەکوەعەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((كُنَّا نُجَمِّعُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ إِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ نَرْجِعُ نَتَتَبَّعُ الْفَيْءَ)).

واتە: ئێمە نوێژ جومعەمان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد ئەگەر خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایبدایەت، پاشان دەگەڕاینەوە بە دوای سێبەردا دەگەڕاین.

و مەزهەبی حەنبەلییەکان و هەندێك زانایان ئەوەیە دەتوانرێت پێش کاتی نیوەڕۆش نوێژی جومعە بکرێت، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی مسلم لە محمدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەینەوە ڕیوایەتی کردووە: ((أَنَّهُ سَأَلَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ: مَتَى كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُصَلِّي الْجُمُعَةَ؟ قَالَ: كَانَ يُصَلِّي، ثُمَّ نَذْهَبُ إِلَى جِمَالِنَا فَنُرِيحُهَا حِينَ تَزُولُ الشَّمْسُ)).

واتە: پرسیاری لە جاری کوڕی عبداللە کردووە: کەی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی جومعەی دەکرد؟ گوتی: نوێژی دەکرد، پاشان دەڕۆیشتین حوشترەکانمان ئازاد دەکرد بۆ لەوەڕگا کاتێك خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایدەدا.

و ئیبن و ئەبوشەیبە و دارەقوتنی لە عبداللەی کوڕی سیدانی سولەمییەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ((شَهِدْتُ الْجُمُعَةَ مَعَ أَبِي

بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، فَكَانَتْ خُطْبَتُهُ وَصَلَاتُهُ قَبْلَ نِصْفِ النَّهَارِ، ثُمَّ شَهِدْنَا مَعَ عُمَرَ، فَكَانَتْ خُطْبَتُهُ وَصَلَاتُهُ إِلَى أَنْ أَقُولَ تَنَصَّفَ النَّهَارُ، ثُمَّ شَهِدْنَا مَعَ عُثْمَانَ، فَكَانَتْ خُطْبَتُهُ وَصَلَاتُهُ إِلَى أَنْ أَقُولُ زَالَ النَّهَارُ، فَمَا رَأَيْتُ أَحَدًا عَابَ ذَلِكَ وَلَا أَنْكَرَهُ)).

واتە: ئامادەی جومعە بووم لەگەڵ ئەبوبەکری صدیق، گوتارەکەی و نوێژەکەی پێش نیوەڕۆ بوو، پاشان لەگەڵ عومەردا ئامادەی بووین، گوتارەکەی و نوێژەکەی ئەو کاتە بوو ئەمگوت کاتی نیوەڕۆیە، پاشان لەگەڵ عوسماندا ئامادەی بووین، نوێژەکەی و گوتارەکەی ئەو کاتە بوو دەمگوت خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایداوە، و کەسم نەبینی ڕەخنە لەوە بگرێت و نکۆڵی بکات.

و ئیبن ئەبوشەیبە لە عبداللەی کوڕی سەلەمەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: (صَلَّى بِنَا عَبْدُ اللهِ الْجُمُعَةَ ضُحًى، وَقَالَ: خَشِيتُ عَلَيْكُمُ الْحَرَّ).

واتە: ئیبن مەسعود لە چێشتەنگاودا نوێژی جومعەی پێکردین، و گوتی: لە گەرما ترسام لێتان.

و زەرکەشی دەڵێت: ئەحمەد دەڵێت: لە ئیبن مەسعود و جابر و سەعد و موعاوییەوە ڕیوایەتکراوە نوێژیان پێش کاتی نیوەرۆ کردووە، و ئەگەر ئەو هاوەڵانە نوێژیان کردبێت و هاوەڵان نوێژیان لەگەڵدا کردبن و نکۆڵی نەکرابێت دەبێتە ئیجماع، و ئەوەی ڕیوایەتکراوە لە کاتی نیوەرۆدا نوێژی جومعە کراوە دژ نییە لەگەڵ ئەمەدا، چونکە هەموو موسڵمانان ڕێگریان نەکردووە لە ئەنجامدانی لە کاتی نیوەرۆدا[1].

---

(١). (شرح الزركشي على مختصر الخرقي)(٢/٢١٠).

بەڵام ئەو کەسانەی نوێژی جومعەیان لەسەر نییە و لە ماڵەوە نوێژ دەکەن، پەیوەندییان بە نوێژی مزگەوتەوە نییە ئەگەر پێش کاتی نیوەڕۆ بانگدرا، بەڵکو پێویستە کاتی نێوەڕۆ بێت ئینجا نوێژ بکەن[1]؛ و ئیبن قودامە دەڵێت: ئەو کەسانە جومعەیان لەسەر واجب نییە وەك موسافر و کۆیلە و ئافرەت و نەخۆش و هەموو ئەوانەی عوزریان هەیە، بۆیان هەیە نوێژی نیوەڕۆ بکەن پێش ئیمام بە بۆچوونی زۆربەی زانایان[2].

(**وَعَلَى مَن حَضَرَهَا: أَن لَا يَتَخَطَّى رِقَابَ النَّاسِ**) پێویستە ئەو کەسەی ئامادەی جومعە دەبێت هەنگاو نەنێت بەسەر خەڵکدا و عەزییەتیان نەدات، ئەبوداو و نەسائی لە ئەبوزاهیرییەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((كُنَّا مَعَ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُسْرٍ صَاحِبِ النَّبِيِّ ﷺ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَجَاءَ رَجُلٌ يَتَخَطَّى رِقَابَ النَّاسِ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ بُسْرٍ: جَاءَ رَجُلٌ يَتَخَطَّى رِقَابَ النَّاسِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَالنَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: اجْلِسْ فَقَدْ آذَيْتَ)).

واتە: لەگەڵ عبداللەی کوڕی بوسری هاوەڵی پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین لە ڕۆژی جومعە، کەسێك هات هەنگاوینا بەسەر خەڵکدا، عبداللەی کوڕی بوسر گوتی: پیاوێك هەنگاوینا بەسەر خەڵکدا لە ڕۆژی جومعەدا، و پێغەمبەری خوا ﷺ گوتاری دەخوێندەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دانیشتە بە ڕاستی ئازاری خەڵکتدا.

---

(١). بڕوانە: (فتاوى نور على الدرب لابن باز بعناية الشويعر)(٢٥٧/١٣).

(٢). (المغني)(٢٢٢/٣).

بەڵام ئەگەر ئیمام دەرگای نەبوو لە پێشی مزگەوتەوە، هەنگاو بنێت بەسەر خەڵکدا بۆ ئەوەی بگاتە سەر مینبەرەکەی بە مەرجێك ڕێگای تری نەبێت بۆ ئەو مەبەستە، ئەو نەهییە نایگرێتەوە، و ئەگەر بۆشاییەك هەبوو لە پێشەوە و خەڵك نەچوونە پێشەوە کەسێك دەتوانێت بەهیوری بچێتە پێشەوە و عەزییەتی خەڵك نەدات، و ئەگەر ناچاریش بێت هەنگاو بنێت نەهییەکە نایگرێتەوە[1].

(**وَأَن يُنصِتَ حَالَ الخُطبَتَينِ**) پێویستە ئەو کاتەی ئیمام گوتار دەخوێنێت موسڵمان گوێی لێ بگرن، و قسە نەکەن، بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ: أَنْصِتْ، يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ، فَقَدْ لَغَوْتَ)).

واتە: ئەگەر بە هاوەڵەکەت بڵێیت: گوێ بگرە، و بێدەنگبە، لە ڕۆژی جومعەدا کاتێك ئیمام گوتار دەخوێنێت، ئەوە قسەی بەتاڵ و پووچەڵت کردووە.

و ئەبوداود لە عبداللەی کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَمَسَّ مِنْ طِيبِ امْرَأَتِهِ إِنْ كَانَ لَهَا، وَلَبِسَ مِنْ صَالِحِ ثِيَابِهِ، ثُمَّ لَمْ يَتَخَطَّ رِقَابَ النَّاسِ، وَلَمْ يَلْغُ عِنْدَ الْمَوْعِظَةِ كَانَتْ كَفَّارَةً لِمَا بَيْنَهُمَا، وَمَنْ لَغَا وَتَخَطَّى رِقَابَ النَّاسِ كَانَتْ لَهُ ظُهْرًا)).

واتە: هەرکەسێك ڕۆژی جومعە خۆی بشوات و بۆنی هاوسەرەکەی لە خۆی بدات ئەگەر هەی بوو، و لە پۆشاکە باشەکانی لەبەر بکات، پاشان هەنگاو

(١). (الشرح الممتع)(٥/٩٥).

نەنێت بەسەر خەڵکدا، و قسە نەکات لە کاتی ئامۆژگار ئیمام، دەبێتە کەفارەتی نێوان دوو جومعەی، و هەرکەسێك قسە بکات و هەنگاو بنێت بەسەر خەڵکدا ئەوە پاداشتی نوێژی نیوەڕۆی بۆ هەیە.

(**وَنُدِبَ لَهُ: التَّبكِيرُ**) لە خۆرهەڵهاتنەوە هەتا ئەو کاتەی ئیمام دەچێتە سەر مینبەر پێنج سەعاتە، هەتاکو زۆرتر بچێت پاداشتی زیاتری دەست دەکەوێت، بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ غُسْلَ الْجَنَابَةِ ثُمَّ رَاحَ، فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَدَنَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّانِيَةِ، فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَقَرَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّالِثَةِ، فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ كَبْشًا أَقْرَنَ، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الرَّابِعَةِ، فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ دَجَاجَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الْخَامِسَةِ، فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَيْضَةً، فَإِذَا خَرَجَ الإِمَامُ حَضَرَتِ الْمَلاَئِكَةُ يَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ)).

واتە: هەرکەسێك ڕۆژی جومعە خۆی بشوات وەك خۆشۆردنی لەشگرانی پاشان بڕوات بۆ مزگەوت، وەك ئەوەیە حوشترێکی کردبێتە بکاتە قوربانی، و هەرکەسێك لە سەعاتی دووەمدا بچێت وەك ئەوەیە مانگایەکی کردبێتە قوربانی، و هەرکەسێك لە سەعاتی سێیەمدا بچێت وەك ئەوەیە بەرانێکی شاخداری کردبێتە قوربانی، و هەرکەسێك لە سەعاتی چوارەمدا بچێت وەك ئەوەی مریشکێکی کردبێتە قوربانی، و هەرکەسێك لە سەعاتی پێنجەمدا بچێت وەك ئەوەیە هێلکەیەکی کردبێتە قوربانی، ئەگەر ئیمامەکە ئامادەبوو فریشتەکانی ئامادەی بیستنی زیکر دەبن.

و خاوەن سونەنەکان لە ئەوسی کوڕی ئەوسی سەقەفییەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((مَنْ غَسَّلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاغْتَسَلَ، وَبَكَّرَ وَابْتَكَرَ، وَمَشَى وَلَمْ يَرْكَبْ، وَدَنَا مِنَ الْإِمَامِ، فَاسْتَمَعَ وَلَمْ يَلْغُ، كَانَ لَهُ بِكُلِّ خَطْوَةٍ عَمَلُ سَنَةٍ، أَجْرُ صِيَامِهَا وَقِيَامِهَا)).

واتە: هەرکەسێك خۆی بشوات لە ڕۆژی جومعە و بە جوانی خۆی بشوات، و بچێت بۆ مزگەوت و زوو بچێت، و بە پێ بڕوات و بە سواری نەڕوات، و نزیك ببێتەوە لە ئیمام، و گوێ بگرێت و قسە نەکات، بە هەموو هەنگاوێك پاداشتی کردەوە ساڵێکی بۆ هەیە، پاشتی ڕۆژ و شەونوێژی.

(**وَالتَّجَمُّلُ**) لەبەرکردنی باشترین و جوانترین پۆشاکەکان سوننەتە بۆ ڕۆژی جومعە، ئەبوداود لە ئەبوسەعیدی خودری و ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەیت کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَلَبِسَ مِنْ أَحْسَنِ ثِيَابِهِ، وَمَسَّ مِنْ طِيبٍ إِنْ كَانَ عِنْدَهُ، ثُمَّ أَتَى الْجُمُعَةَ فَلَمْ يَتَخَطَّ أَعْنَاقَ النَّاسِ، ثُمَّ صَلَّى مَا كَتَبَ اللهُ لَهُ، ثُمَّ أَنْصَتَ إِذَا خَرَجَ إِمَامُهُ حَتَّى يَفْرُغَ مِنْ صَلَاتِهِ كَانَتْ كَفَّارَةً لِمَا بَيْنَهَا وَبَيْنَ جُمُعَتِهِ الَّتِي قَبْلَهَا)).

واتە: هەرکەسێك ڕۆژی جومعە خۆی بشوات و لە جوانترین و باشترین پۆشاکەکانی لەبەر بکات، و بۆنی خۆش لە خۆی بدات ئەگەر هەی بوو، پاشان بچێت بۆ جومعە و هەنگاو نەنێت بەسەر خەڵکدا، پاشان نوێژ بکات ئەوەندی خوای بۆی نوسیوە، پاشان ئەگەر ئیمامەکەی دەرچوو گوێ بگرێت و بێدەنگ

بێت هەتاکو نوێژەکەی تەواو دەکات، دەبێتە کەفارەتی نێوان ئەو جومعەیە و جومعەی پێشی.

(**وَالدُّنُوُّ مِن الإِمَامِ**) نزیکبوونەوە لە ئیمام بە زوو ڕۆیشت بۆ مزگەوت بە دەست دێت، لە فەرموودەکەی ئەوسی کوڕی ئەوسدا بەڵگە لەسەر ئەوە هاتبوو، و ئەحمەد و ئەبوداود لە سەمورەی کوڕی جوندبەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((احْضُرُوا الذِّكْرَ، وَادْنُوا مِنَ الْإِمَامِ، فَإِنَّ الرَّجُلَ لَا يَزَالُ يَتَبَاعَدُ حَتَّى يُؤَخَّرَ فِي الْجَنَّةِ، وَإِنْ دَخَلَهَا)).

واتە: ئامادەی زیکربن، و لە ئیمامەوە نزیك ببنەوە، بێگومان پیاوی واهەیە بەردەوام دوور دەکەوێتەوە هەتاکو لە بەهەشتدا دوور دەخرێتەوە ئەگەر بچێتە بەهەشتیشەوە.

(**وَمَن أَدرَكَ رَكعَةً مِنهَا، فَقَد أَدرَكَهَا**) نەسائی و ئیبن ماجە لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنْ صَلَاةِ الجُمُعَةِ أَوْ غَيْرِهَا فَقَدْ تَمَّتْ صَلَاتُهُ))؛ وَفِي رِوَايَةِ ابْنِ مَاجَهْ: ((فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلَاةَ)).

واتە: هەرکەسێك بگات بە ڕکاتێك نوێژی جومعەدا یان هەر نوێژێکی تر ئەوە نوێژەکەی تەواوە گەیشتووە بە نوێژەکەدا؛ لە ڕیوایەتێکدا: ئەوا بێگومان گەیشتووەتە نوێژەکەدا.

و بوخار و مسلم و خاوەن سونەنەکان لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الصَّلَاةِ رَكْعَةً فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلَاةَ)).

واتە: هەر کەسێك بگات بە ڕکاتێك لە نوێژدا، بێگومان گەشتوە بە ئەو نوێژ.

ترمزی دوای ڕیوایەتکردنی ئەو فەرموودەیە دەڵێت: کردار لەسەر ئەمەیە لای زۆربەی زاناکانی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ و جگە لەوانیش، دەڵێن: هەرکەسێك بگات بە ڕکاتێك نوێژی جومعە ڕکاتێکی تری لەگەڵدا دەکات، و هەرکەسێك بگات بە نوێژدا دانیشتبوون چوار ڕکات نوێژ دەکات، ئەوە بۆچوونی سوفیانی سەوری و ئیبن موبارەك و شافعی و ئەحمەد و ئیسحاقە.

(**وَهِيَ فِي يَومِ العِيدِ رُخصَةٌ**) جەژن و هەینی ئەگەر پێکەوە لە یەك ڕۆژدا کۆبوونەوە، نوێژی هەینی لەسەر ئەو موسڵمانانە دەکەوێت کە ئامادەی نوێژی جەژن بوون و دەتوانن ئامادەی نوێژی هەینی نەبن، بەڵام لەسەر پێشنوێژ پێویستە نوێژی جومعە بکات، ئەبوداود و ئیبن ماجە لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((قَد اجْتَمَعَ فِي يَوْمِكُمْ هَذَا عِيدَانِ، فَمَنْ شَاءَ أَجْزَأَهُ مِنَ الْجُمُعَةِ، وَإِنَّا مُجَمِّعُونَ)).

واتە: دوو جەژن لەم ڕۆژەدا کۆبووەتەوە، کە مەبەستی ڕۆژی جومعە و یەکێکە لە جەژنەکانی ڕەمەزان یان قوربان، هەرکەسێك ویستی هەیە نوێژی جەژن نوێژی جومعەی لەسەر دەخات، و ئێمە نوێژی جومعە ئەنجام دەدەین.

و هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەمە ڕوخسەتە بۆ گوندنشینەکان و ئەم ئەسەرە دەکەنە بەڵگە کە بوخاری لە ئەبوعوبەیدەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: (شَهِدْتُ العِيدَ مَعَ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ، فَكانَ ذَلِكَ يَوْمَ الجُمُعَةِ، فَصَلَّى قَبْلَ الخُطْبَةِ، ثُمَّ خَطَبَ

فَقالَ: يا أَيُّها النّاسُ، إنَّ هَذا يَوْمٌ قَدِ اجْتَمَعَ لَكُمْ فِيهِ عِيدان، فَمَن أَحَبَّ أَنْ يَنْتَظِرَ الجُمُعَةَ مِن أَهْلِ العَوالِي فَلْيَنْتَظِرْ، ومَن أَحَبَّ أَنْ يَرْجِعَ فَقَدْ أذِنْتُ لَهُ).

واتە: ئامادەی نوێژی جەژن بووم لەگەڵ عوسمانی کوڕی عەفان ئەو ڕۆژە ڕۆژی جومعە بوو، نوێژی پێش گوتارخوێندن کرد، و گوتی: ئەمڕۆ دوو جەژن پێکەوە کۆبوونەتەوە، هەرکەسێك لە دانیشتووانی (العوالی) کە (دەوروبەری مەدینەیە) پێی خۆشە چاوەڕوانی نوێژی هەینی بکات با چاوەڕوانی بکات، و هەرکەسێك پێی خۆشە بگەڕێتەوە با بگەڕێتەوە، من ڕوخسەتمداوە.

پاشان ئەو زانایانەی کە دەڵێن: ئەگەر جەژن و هەینی پێکەوە کۆبوونەوە نوێژی هەینی لەسەر دەکەوێت، ناکۆکن ئەو کەسەی ئامادەی نوێژی هەینی نابێت ئایا نوێژی نیوەڕۆ ئەنجام دەدات؟ هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەو دوو ڕکاتەی نوێژی جەژن لە بری دوو ڕکاتەکەی هەینییە و نوێژ ناکات هەتاکو عەسر، و ئەم فەرموودەیە دەکەنە بەڵگە کە ئەبوداود لە عەتاوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((اجتمَعَ يومُ جُمعةٍ ويومُ فِطرٍ على عهدِ ابنِ الزُّبيرِ، فقال: عيدانِ اجتَمَعا في يومٍ واحدٍ، فجمَعَهما جميعًا، فصلَّاهُما ركعتينِ بُكْرَةً، لَمْ يَزِدْ عليهما حتى صلّى العصرَ))، وفي رواية: ((وَكانَ ابنُ عبّاسٍ بالطّائفِ فلمّا قدمَ ذَكرنا ذلكَ لَهُ فقالَ: أصابَ السُّنَّة))، وَفِي رِوَايَةٍ لِحَاكِم وَصَحَّحَهُ الْأَلْبَانِي: ((فبلغَ ابنَ الزُّبيرِ فقالَ: رَأَيْتُ عُمَرَ بْنَ الخَطّابِ إذا اجْتَمَعَ عِيدان صَنَعَ مِثْلَ هَذا)).

واتە: ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و هەینی پێکەوە کۆبوونەوە لە سەردەمی ئیبن زوبێر، گوتی: دوو جەژن پێکەوە کۆبوونەتەوە، هەردووکیان پێکەوە کۆکردەوە و

سەرلەبەیان دوو ڕکاتی ئەنجامدا، ئیتر لەوە زیاتری نەکرد هەتاکو نوێژی عەسر، و لە ڕیوایەتێکدا، دەڵێت: ئیبن عەباس لە تائیف بوو کاتێك گەڕایەوە ئەو باسەمان بۆ گێڕایەوە،گوتی: سوننەتی پێکاوە، و لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێت: ئەو قسە و باسانە گەیشتەوە ئیبن زوبێر گوتی: عومەری کوڕی خەتابم بینی، ئەگەر دوو جەژن پێکەوە کۆبوونایەتەوە بەو شێوەیەی دەکرد.

و ئەمە بۆچوونی شەوکانی و ئەلبانییە، و زۆربەی زانایان دەڵێن: نوێژی نیوەڕۆی لەسەر ناکەوێت، صەنعانی دەڵێت: شاراوە نییە کە عەتا باسی ئەوەی کردووە کە ئیبن زوبێر دەرنەچووە بۆ نوێژی هەینی، بەڵام ئەمە دەقێکی یەکلاکەرەوە نییە کە نوێژی نیوەڕۆی لە ماڵەوە نەکردووە، بۆیە جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی مەزهەبی ئیبن زوبێر ئەوەیە نوێژی نیوەڕۆ لەسەر ئەو کەسانە دەکەوێت کە ئامادەی نوێژی جەژن بوون لەبەر ئەم ڕیوایەتە پەسەند نییە، چونکە دەشێت نوێژی نیوەڕۆی لە ماڵەوە کردبێت، بەڵکو لە عەتاوە هاتووە کە نوێژی نیوەڕۆیان بە تەنها کردووە، کە ئاماژەی ئەوەی تێدایە کەس نەیگوتووە نوێژی نیوەڕۆیان لەسەر دەکەوێت[١]؛ و لیژنەی هەمیشەیی فەتوا دەڵێن: هەرکەسێك ئامادەی نوێژی هەینی نەبێت، لەوانەی ئامادەی نوێژی جەژن بوون واجبە لەسەری نوێژی نیوەڕۆ ئەنجام بدات[٢]؛ و ئەمە بۆچوونی ئیبن باز و ئیبن عوسەیمین و محمد ئەسیوبییە.

---

(١). (سبل السلام)(٤٠٩/١).

(٢). (فتاوى اللجنة الدائمة - ١)(٣٣١/٨).

چەند پرسێك: یەكەم: خوێندنی سورەتی الكهف سوننەتە لە شەو ڕۆژی جومعەدا، حاكم و بەیهەقی لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە ڕیوایەتیان كردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفورموێت: ((مَنْ قَرَأَ سُورَةَ الْكَهْفِ فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ، أَضَاءَ لَهُ مِنَ النُّورِ مَا بَيْنَ الْجُمُعَتَيْنِ)).

واتە: هەركەسێك سورەتی الكهف لە ڕۆژی جومعەدا بخوێنێت، نێوان دوو جومعەی بە نور بۆ ڕووناك دەكاتەوە.

و ئەوەی ئەرجەحە كاتی خوێندنی لە ئاوابوونی خۆری ڕۆژی پێنج شەممەوە دەست پێدەكات هەتاكو ئاوابوونی خۆری ڕۆژی جومعە بە بەڵگەی ئەو ئەسەرەی دارمی لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە ڕیوایەتی كردووە دەڵێت: (مَنْ قَرَأَ سُورَةَ الْكَهْفِ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ، أَضَاءَ لَهُ مِنْ النُّورِ فِيمَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْبَيْتِ الْعَتِيقِ).

واتە: هەركەسێك سورەتی كەهف لە شەوی جومعەدا بخوێنێت، نێوان خۆی و كەعبەی بە نور بۆ ڕووناك دەكاتەوە.

دووەم: سەڵاواتدا لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژ و شەوی جومعەدا: بەیهەقی لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی كردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَكْثِرُوا الصَّلَاةَ عَلَيَّ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَلَيْلَةَ الْجُمُعَةِ؛ فَمَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلَاةً صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ عَشْرًا)).

واتە: زۆر سەڵاواتم لە شەو و ڕۆژی جومعەدا لەسەر بدەن، هەركەسێك سەڵاواتێكم لەسەر بدات خوای پەروەردگار دە سەڵاواتی لەسەر دەدات.

سێیەم: خۆشۆردن لە ڕۆژی جومعەدا: نوسەر لە بابەتی خۆشۆردندا باسی خۆشۆردنی کرد لە ڕۆژی جومعەدا و بە سوننەتی دەزانێت، و ئەوە بۆچوونی چوار مەزهەبەکەیە بە بەڵگەی ئەو فەرموودەی ئەبوداود لە سەمورەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ تَوَضَّأَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَبِهَا وَنِعْمَتْ، وَمَنِ اغْتَسَلَ فَهُوَ أَفْضَلُ)).

واتە: هەرکەسێك دەستنوێژ بگرێت لە ڕۆژی هەینی ڕوخسەتی وەرگرتووە و باشترین ڕوخسەتە، و هەرکەسێك خۆی بشوات باشترە.

و ئەو فەرموودەیەی مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ ثُمَّ أَتَى الْجُمُعَةَ فَاسْتَمَعَ وَأَنْصَتَ، غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ وَزِيَادَةُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ)).

واتە: هەرکەسێك بە جوانی دەستنوێژ بگرێت، پاشان بێت بۆ نوێژی هەینی گوێ بگرێت و بێدەنگ بێت، تاوانەکانی نێوان دوو هەینی دەسڕێتەوە و زیادەی سێ ڕۆژیش.

و هەندێك لە زانایان بە واجبی دەزانن و هەندێك فەرموودە دەکەنە بەڵگە لەوانە: بوخاری و مسلم لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ جَاءَ مِنْكُمْ الْجُمُعَةَ فَلْيَغْتَسِلْ)).

واتە: هەرکەسێك لە ئێوە هات بۆ نوێژی هەینی با خۆی بشوات.

و لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((غُسْلُ يَوْمِ الجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ)).

واتە: خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی واجبە لەسەر هەموو کەسێکی باڵغ.

ئەو زانایانەی دەڵێن: خۆشۆردنی هەینی سوننەتە ((وَاجِبٌ عَلَى))یان بە (حتم) واتە: دەبێت و حەتمییە خۆی بشوات لێکداوەتەوە، بەڵام ئەوەی دیارە لە ڕواڵەتی لەفزەکەوە واجب بە مانای پێویست و فەرزە.

چوارەم: ڕووکردن ئیمام لە کاتی دانیشتن بۆ جومعە، ئیبن ماجە لە سابتی کوڕی قەیسەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە دەڵێت: ((كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا قَامَ عَلَى الْمِنْبَرِ، اسْتَقْبَلَهُ أَصْحَابُهُ بِوُجُوهِهِمْ)).

واتە: ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەر بوەستایە، هاوەڵانی ڕوویان تێدەکرد.

پێنجەم: سوننەتە گوتاری جومعە کورت بێت و نوێژی جومعە درێژ بێت: مسلم لە عەماری کوڕی یاسرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((إِنَّ طُولَ صَلَاةِ الرَّجُلِ، وَقِصَرَ خُطْبَتِهِ، مَئِنَّةٌ مِنْ فِقهِهِ، فَأَطِيلُوا الصَّلَاةَ وَأَقْصِرُوا الْخُطْبَةَ)).

وات: بێگومان درێژی نوێژی پیاو، و کورتی گوتارەکەی، نیشانەی تێگەیشتنییەتی، بۆیە نوێژ درێژ بکەنەو و گوتار کورت بکەنەوە.

و ئەبوداود لە عەمارە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ بِإِقْصَارِ الْخُطَبِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین بە کورتکردنەوەی گوتار.

شەشەم: نوێژ جومعە دوو ڕکاتە وەك نوێژی بەیانی: ئەحمەد و نەسائی و ئیبن ماجە لە عومەری کوری خەتابەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی

داناوە، دەڵێت: ((صَلَاةُ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَانِ، وَصَلَاةُ الْفِطْرِ رَكْعَتَانِ، وَصَلَاةُ الْأَضْحَى رَكْعَتَانِ، وَصَلَاةُ السَّفَرِ رَكْعَتَانِ، تَمَامٌ غَيْرُ قَصْرٍ، عَلَى لِسَانِ مُحَمَّدٍ ﷺ)).

واتە: نوێژ جومعە دوو ڕکاتە، و نوێژی جەژنی ڕەمەزان دوو ڕکاتە، و نوێژی جەژنی قوربان دوو ڕکاتە، و نوێژی سەفەر دوو ڕکاتە، تەواوە و کورت نەکراوەتەوە، لەسەر زاری محمدەوە ﷺ.

## بَابُ صَلاةِ العِيدَينِ

**هِيَ رَكعَتَانِ، فِي الأُولَى سَبعُ تَكبِيرَاتٍ قَبلَ القِرَاءَةِ، وَفِي الثَّانِيَةِ خَمسٌ كَذلِكَ، وَيَخطُبُ بَعدَهَا، وَيُستَحَبُّ: التَّجَمُّلُ، وَالخُرُوجُ إِلَى خَارِجِ البَلَدِ، وَمُخَالَفَةُ الطَّرِيقِ، وَالأَكلُ قَبلَ الخُرُوجِ فِي الفِطرِ دُونَ الأَضحَى، وَوَقتُهَا بَعدَ ارتِفَاعِ الشَّمسِ قَدْرَ رُمْحٍ إِلَى الزَّوَالِ، وَلَا أَذَانَ فِيهَا وَلا إِقَامَةَ.**

## بابەتی نوێژی دوو جەژنەکە

**نوێژی جەژن دوو ڕکاتە، لە ڕکاتی یەکەمدا حەوت الله أکبر پێش خوێندنی سورەتی الفاتحە دەخوێندرێت، و لە ڕکاتی دووەمدا پێنج الله أکبر دەخوێندرێت بە هەمان شێوە، و سوننەتە: پۆشاکی جوان بپۆشرێت، و دەرچوون بۆ دەرەوەی شار، و گۆڕینی ڕێگا، و خواردن پێش دەرچوون بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان جگە لە جەژنی قوربان، و کاتەکەی دوای بەرزبوونەوەی خۆرە بە ئەندازەی ڕمێك هەتاکو کاتی نیوەڕۆ، و بانگ و قامەتی نییە.**

(**هِيَ رَكعَتَانِ**) ئەحمەد و نەسائی و ئیبن ماجە لە عومەری کوری خەتابەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((صَلَاةُ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَانِ، وَصَلَاةُ الْفِطْرِ رَكْعَتَانِ، وَصَلَاةُ الْأَضْحَى رَكْعَتَانِ، وَصَلَاةُ السَّفَرِ رَكْعَتَانِ، تَمَامٌ غَيْرُ قَصْرٍ، عَلَى لِسَانِ مُحَمَّدٍ ﷺ)).

واتە: نوێژ جومعە دوو ڕکاتە، و نوێژی جەژنی ڕەمەزان دوو ڕکاتە، و نوێژی جەژنی قوربان دوو ڕکاتە، و نوێژی سەفەر دوو ڕکاتە، تەواوە و کورت نەکراوەتەوە، لەسەر زاری محمدەوە ﷺ.

نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان بەڵگەی زۆریان لە سوننەتی صەحیحدا لەسەر هاتووە، بەڵام زانایان ناکۆکن لەسەر حوکمەکەی، هەندێك لە زانایان دەڵێن: سوننەتی (مؤکدة)یە، و هەندێکیان دەڵێن: فەرزی کیفایەیە ئەگەر

کۆمەڵێك لە موسڵمانان ئەنجامی بدەن لەسەر ئەوانی تر دەکەوێت، و هەندێکیان دەڵێن: واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێکی باڵغی عاقڵ، و هەتاکو فەرمان بە ئافرەتانیش کراوە دەربچبن بۆ نوێژی جەژنەکان، ئەمە بۆچوونی ئەبوحەنیفەیە، و ڕیوایەتێکە لە ئەحمەدەوە، و ڕای پەسەندە بە لای ئیبن حەزم و ئیبن تەیمییە و ئیبن قەیم و صەنعانی و شەوکانی و ئەلبانی و ئیبن باز و ئیبن عوسەیمین، و ئیبن حەزم و ئیبن تەیمییە و صەنعانی و شەوکانی و صدیق حسن خان و ئەلبانی بە واجبی دەزانن لەسەر ئافرەتانیش، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردووە بە دەرچوون بۆ نوێژی جەژنەکان وەك لە فەرموودەی ئوم عەتییەدا هاتووە، و خوا دەفەرموێت: ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ۝٢﴾(الكوثر).

واتە: نوێژ بکە بۆ پەروەردگارت و ئاژەڵی بۆ سەرببڕە.

هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەو نوێژەی لێرە فەرمانی پێکراوە نوێژی جەژنی قوربانە، ئیبن عوسەیمین دەڵێت: لێرە مەبەست هەموو نوێژەکانە، و یەکەم نوێژێك کە دەیگرێتەوە ئەو نوێژەیە کە پەیوەستە بە سەربڕینی ئاژەڵەوە، کە نوێژی جەژنی قوربانە[1]؛ و ئیبن ئەبوحاتەم لە عەتاوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ﴾ مەبەست نوێژی جەژنە؛ و قورتبی دەڵێت: قەتادە و عەتا و عیکرمە دەڵێن: ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ﴾ مەبەست نوێژی جەژنی قوربانە[2].

و خوا دەفەرموێت: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ۝١٤ وَذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ۝١٥﴾(الأعلى).

---

(١). (تفسير جزء عم)(٣٣٣).

(٢). (الجامع لأحكام القرآن)(٢١٨/٢٠).

واتە: بە ڕاستی سەرفراز بووە ئەو کەسەی دەروونی خۆی لە هاوبەش بڕیاردان و تاوان و خراپەکاری پاك دەکاتەوە، و یادی پەروەردگاری دەکات و نوێژەکانی ئەنجام دەدات.

کۆمەڵێك لە زانایان دەڵێن: ئەم دوو ئایەتە ئەگەرچی لە مەککە دابەزیون بەڵام باسی زەکاتی سەرفترە و نوێژی جەژنی ڕەمەزان دەکەن، بەغەوی دەڵێت: ﴿وَذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾﴾ مانای ئەوەیە دەربچێت بۆ جەژن و نوێژ بکات، و ئیبن مەسعود دەڵێت: (رَحِمَ اللهُ امْرَءًا تَصَدَّقَ ثُمَّ صَلّى، ثُمَّ يَقْرَأُ: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾﴾)[1].

واتە: ڕەحمەتی خوا لەو کەسەی ماڵ دەبەخشێت، پاشان نوێژ دەکات، و ئەم ئایەتەی خوێندەوە.

و ئیبن حەجەر دەڵێت: جێگیر بووە: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾﴾ باسی زەکاتی سەرفترەیە لە ڕەمەزاندا، و ئیبن ئەبوحاتەم لە حیدەوە بە سەنەدێکی حەسەن ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: (قَوْلَهُ تعالى: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾﴾، نَزَلَتْ فِي صَلاةِ العِيدِ وزَكاةِ الفِطْرِ)[2].

واتە: ئەو دوو ئایەتە دەربارەی جەژن و زەکاتی سەرفترە دابەزیون.

و ئیبن کەسیر دەڵێت: ڕیوایەتمان کردووە لە عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە: (أَنَّهُ كَانَ يَأْمُرُ النَّاسَ بِإِخْرَاجِ صَدَقَةِ الْفِطْرِ، ويَتْلُو هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾﴾)[3].

---

(١). (معالم التنزيل في تفسير القرآن)(٤٠٢/٨).

(٢). (فتح الباري)(٢٦٢/٧).

(٣). (تفسير القرآن العظيم)(٣٨٢/٨).

واتە: فەرمانی بە خەڵك دەكرد كە زەكاتی سەرفترە دەربكەن، و ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە.

و بەیهەقی لە ئەبوعالییەوە ڕیوایەتی كردووە دەڵێت: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ١٤ وَذَكَرَ ٱسۡمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ١٥﴾، دەربارەی زەكاتی سەرفترە دابەزیوە، پاشان نوێژی جەژن ئەنجام دەدات.

و مسلم لە ئوم عەتییەی ئەنصارییەوە ڕیوایەتی كردووە دەڵێت: ((أَمَرَنا رَسولُ اللهِ ﷺ، أَنْ نُخْرِجَهُنَّ في الفِطْرِ والأَضْحى، العَواتِقَ، والْحُيَّضَ، وذَواتِ الخُدُور، فأمَّا الحُيَّضُ فَيَعْتَزِلْنَ الصَّلاةَ، ويَشْهَدْنَ الخَيْرَ، ودَعْوَةَ الْمُسْلِمِينَ، قُلتُ: يا رَسولَ اللهِ، إحْدانا لا يَكونُ لَها جِلْبابٌ، قالَ: لِتُلْبِسْها أُخْتُها مِن جِلْبابِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێدەكردین بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان كچانی گەنج، و ئەوانەی لە سوڕی مانگانەدان، و ئەو كچانەی لە ماڵدا لە پەنایەكدا بوون، دەربكەین بۆ نوێژ، بەڵام ئەوانەی كەلە سوڕی مانگانەدان نوێژناكەن، و ئامادەی خێر و چاكە و پاڕانەوەی موسڵمانان دەبن، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئافرەتی وامان هەیە پۆشاكی نییە، فەرمووی: با خوشكەكەی پۆشاكی لەبەر بكات.

و ئیبن ئەبوشەیبە لە ئەبوبەكرەوە ڕیوایەتی كردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە دەڵێت: (حَقٌّ عَلى كُلِّ ذاتِ نِطاقٍ الخُرُوجُ إلى العِيدَيْنِ).

واتە: مافە بەسەر هەموو ئەوانەی كەمەریان دەبەستن، دەربچن بۆ نوێژی جەژنەكان.

فەرموودەکەی ئوم عەتییە و ئەسەرەکەی ئەبوبەکر بەڵگەن لەسەر ئەوەی نەك تەنها بۆ پیاوان بەڵکو بۆ ئافرەتان، و ئەوانەشی پۆشاکیان نییە لەبەری بکەن پۆشاکی خوشکەکانیان بە ئەمانەت بهێنن و ئامادەی نوێژی جەژن ببن، و زیاتر لەوانە ئەو ئافرەتانەشی کە لە سوڕی مانگانەدان دەربچن بۆ نوێژگە و گوێ لە گوتار و ئامۆژگاری بگرن و نزا و پاڕانەوە بکەن؛ و ئەبوداود و ئیبن ماجە لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((قدِ اجتمعَ في يومِكم هذا عيدانِ فمن شاءَ أجزأَهُ منَ الجمعةِ و إنّا مجمِّعونَ)).

واتە: دوو جەژن لەم ڕۆژەدا کۆبووەتەوە، کە مەبەستی ڕۆژی هەینی و یەکێکە لە جەژنەکانی ڕەمەزان یان قوربان، هەرکەسێك ویستی لەسەربوو نوێژی جەژن نوێژی هەینی لەسەر دەخات، و ئێمە نوێژی هەینی ئەنجام دەدەین.

ئەمەش بەڵگەی ئەوەی تێدایە هەرکەسێك نوێژی جەژن بکات دەتوانێت ئامادەی نوێژی هەینی نەبێت، و ئەگەر نوێژی جەژن سوننەت بووایە فەرزی هەینی لەسەر ئەو موسڵمانانە نەدەخست کە ئامادەی نوێژی جەژن دەبن، و قەنوجی دەڵێت: لەو بەڵگانەی کە بەڵگەن لەسەر واجبی نوێژی جەژن ئەوەیە نوێژی هەینی لەسەر ئەو کەسە دەخات کە ئامادەی نوێژی جەژن دەبێت، ئەگەر لە یەك ڕۆژدا کۆبوونەوە، و هەرشتێك واجب نەبێت حوکمی واجب لەسەر موسڵمان ناخات[1]؛ و ئەبوداو و نەسائی و حاکم لە وەهبی کوڕی کەیسانەوە

(١). (الروضة الندية شرح الدرر البهية)(١٤٢/١).

ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: (اجتَمعَ عيدانِ على عَهْدِ ابنِ الزُّبَيْرِ فأخَّرَ الخروجَ حتّى تعالى النَّهارُ، ثمَّ خرجَ فَخطبَ فأطالَ الخُطبَةَ، ثمَّ نزلَ فصلّى، ولم يُصلِّ للنّاسِ يومَئذٍ الجمُعةَ فذُكِرَ ذلِكَ لابنِ عبّاسٍ فقالَ: أصابَ السُّنَّةَ).

واتە: هەینی و جەژن لە سەردەمی ئیبن زوبێر پێکەوە لە یەك ڕۆژدا کۆبوونەوە، دەرچوونی دواخست هەتاکو خۆر بەرزبوویەوە، پاشان گوتاری خوێند و گوتارەکەی درێژکردەوە، پاشان دابەزی نوێژی کرد، و ئەو ڕۆژە نوێژی هەینی بۆ خەڵك نەکرد، ئەوەیان بۆ ئیبن عەباس گێڕایەوە، گوتی: سوننەتی پێکاوە.

ئەلبانی لەسەر ئەم فەرموودەیە دەڵێت: سودێکی گرنگی تێدایە ئەویش ئەوەیە نوێژی جەژن واجبە وەك نوێژی هەینی، ئەگەر وانەبووایە واجبوونی نوێژی هەینی لەسەر موسڵمان نەدەخست[1].

(**فِي الأُولَى سَبعُ تَكبِيرَاتٍ قَبلَ القِرَاءَةِ، وَفِي الثَّانِيَةِ خَمسٌ كَذلِكَ**) نوێژی جەژن دوو ڕکاتە وەك نوێژی بەیانی، لە ڕکاتی یەکەمدا دوای تەکبیرەی ئیحرام، و نەوەوی دەڵێت: دوای خوێندنی دوعای ئیستفتاح، و پێش خوێندنی سورەتی فاتیحە حەوت (الله أكبر) دەخوێندرێت جگە لەو تەکبیرەی بۆ چوونە ڕکوعە، و لە ڕکاتی دووەمدا پێش خوێندنی سورەتی فاتیحە پێنج (الله أكبر) دەخوێندرێت جگە لەو تەکبیرەی بۆ چوونە ڕکوعە، ئەبوداود و ئیبن ماجە و دارقوتنی لە عائیشەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((أنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ

---

(١). (الأجوبة النافعة عن أسئلة لجنة مسجد الجامعة)(٨٧).

كانَ يُكَبِّرُ فِي الفِطْرِ و الأَضْحى فِي الأُولى سَبْعَ تَكْبِيراتٍ، و فِي الثّانِيَةِ خَمْسَ تَكْبِيراتٍ، سِوى تَكْبِيرَتَيِ الرُّكُوعِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان لە ڕكاتی یەكەمدا حەوت (الله أكبر)ی دەخوێند، و لە ڕكاتی دووەمدا پێنج (الله أكبر)ی دەخوێند، جگە لە (الله أكبر)ی چوونە ڕكوع.

و تەحاوی لە قاسمەوە ڕیوایەتی كردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە دەڵێت: ((عن بعض أصحاب النبي ﷺ قال: صَلّى بنا النَّبيُّ ﷺ يومَ عيدٍ، فكَبَّرَ أربعًا و أربعًا، ثُمَّ أقبَلَ علينا بوَجهِهِ حين انصرَفَ، قال: لا تَنسَوْا، كتَكبيرِ الجَنائزِ، و أشارَ بأصابعِه، و قَبَضَ إبهامَه)).

واتە: هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بۆ كردین لە ڕۆژی جەژن، چوار، چوار (الله أكبر)ی كرد، پاشان كاتێك نوێژەكەی تەواو كرد، ڕووی تێكردین و فەرمووی: لە بیرتان نەچێت، وەك تەكبیرەی نوێژی مردووە، و بە دەستی ئاماژەی بە چوار پەنجەی كرد و پەنجە گەورەكەی داخستبوو.

و ئیبن ئەبوشەیبە لە عبداللەی كوڕی حارسەوە ڕیوایەتی كردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: (صَلّى بِنَا ابْنُ عَبَّاسٍ يَوْمَ عِيدٍ، فَكَبَّرَ تِسْعَ تَكْبِيرَاتٍ؛ خَمْسًا فِي الأُولَى، وأَرْبَعًا فِي الآخِرَةِ، ووَالَى بَيْنَ الْقِرَاءَتَيْنِ).

واتە: ئیبن عەباس ڕۆژی جەژن نوێژی بۆ كردین، نۆ (الله أكبر)ی كرد، پێنج لە ڕكاتی یەكەم، چوار لە ڕكاتی دووەم، و خوێندنی قورئانی لە ڕكاتی یەكەم دوای

الله أكبرەکان بوو، ولە ڕکاتی دووەمیش دوای الله أكبرەکان بوو.

ئەلبانی دەڵێت: ئەوەی ڕاستییە (الله أكبر) کردن لە نوێژی جەژنەکان فراوانە، هەرکەس بیەوێت چوار، چوار (الله أكبر) دەکات، و هەرکەس بیەوێت حەوت (الله أكبر) لە ڕکاتی یەکەمدا، و پێنج (الله أكبر) لە ڕکاتی دووەمدا دەکات، .... هەموو ئەوانە دروستە، و پێویست بە دەمارگیری و ناکۆکی ناکات، ئەگەرچی حەوت بە پێنجەکەم پێ خۆشترە[١].

(**وَيَخطُبُ بَعدَهَا**) گوتاری نوێژی جەژن دوای نوێژەکەیە و سوننە، بوخاری لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتی کردووە: ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي فِي الْأَضْحَى وَالْفِطْرِ، ثُمَّ يَخْطُبُ بَعْدَ الصَّلَاةِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی جەژنی قوربان و ڕەمەزانی دەکرد، پاشان دوای نوێژ گوتاری دەخوێند.

وبوخاری و مسلم لە جابرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((شَهِدْتُ مع رَسولِ اللهِ ﷺ الصَّلاةَ يَومَ العِيدِ، فَبَدَأَ بالصَّلاةِ قَبْلَ الخُطْبَةِ، بغيرِ أَذانٍ ولا إقامَةٍ، ثُمَّ قامَ مُتَوَكِّئاً على بلالٍ، فأمَرَ بتَقْوى اللهِ، وحَثَّ على طاعَتِه، ووَعَظَ النّاسَ وذَكَّرَهُمْ)).

واتە: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادەی نوێژی جەژن بووم، نوێژی کرد، پێش گوتار خوێندن، بەبێ بانگدان و قامەتکردن، پاشان دەستی خستە سەرپشتی بیلال و هەستا، و فەرمانی کرد بە لە خوا ترسان و پارێزکاری، و هانی موسڵمانانیدا گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوا بکەن، و ئامۆژگاری کردن و چاکەکاری بیرهێنانەوە.

---

(١). (سلسلة الأحاديث الصحيحة وشيء من فقهها وفوائدها)(١٢٦٤/٦).

و بوخاری و مسلم له ئیبن عومەرەوه ڕیوایەتیان کردووه دەڵێت: ((كَانَ رَسولُ اللّهِ ﷺ، وأَبُو بَكْرٍ، وعُمَرُ، يُصَلّونَ العِيدَيْنِ قَبْلَ الخُطْبَة)).

واته: پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکر و عومەر نوێژی هەردوو جەژنەکەیان پێش گوتارخوێندن کرد.

و بوخاری و موسلم له ئیبن عەباسەوه ڕیوایەتیان کردووه دەڵێت: ((شَهِدْتُ العيدَ مع النَّبيِّ ﷺ، ومع أبي بكرٍ، وعُمرَ، فبَدَؤوا بالصَّلاةِ قَبلَ الخُطبةِ)).

واته: ئامادەی نوێژی جەژن بووم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان، هەموویان نوێژیان پێش گوتار کرد.

و بوخاری له ئەبوسەعیدی خودرییەوه ڕیوایەتی کردووه دەڵێت: ((كَانَ رَسُولُ ﷺ يَخرُجُ يَوْمَ الفِطْرِ والأَضْحَى إلَى المُصَلّى، فَأَوَّلُ شَيْءٍ يَبْدَأُ بِه الصَّلاَةُ، ثُمَّ يَنْصَرِفُ، فَيَقُومُ مُقَابِلَ النَّاسِ، والنَّاسُ جُلُوسٌ عَلَى صُفُوفِهِمْ فَيَعِظُهُمْ، ويُوصِيهِمْ، ويَأْمُرُهُمْ، فَإِنْ كَانَ يُرِيدُ أَنْ يَقْطَعَ بَعْثًا قَطَعَهُ، أَوْ يَأْمُرَ بِشَيْءٍ أَمَرَ بِه، ثُمَّ يَنْصَرِفُ؛ قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: فَلَمْ يَزَلِ النَّاسُ عَلَى ذَلِكَ حَتَّى خَرَجْتُ مَعَ مَرْوَانَ وَهُوَ أَمِيرُ المَدِينَة في أَضْحًى أَوْ فِطْرٍ، فَلَمَّا أَتَيْنَا المُصَلَّى إذَا مِنْبَرٌ بَنَاهُ كَثِيرُ بْنُ الصَّلْت، فَإِذَا مَرْوَانُ يُرِيدُ أَنْ يَرْتَقِيَهُ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ، فَجَبَذْتُ بِثَوْبِه، فَجَبَذَنِي، فَارْتَفَعَ، فَخَطَبَ قَبْلَ الصَّلاَة، فَقُلْتُ لَهُ: غَيَّرْتُمْ واللهِ، فَقَالَ أَبَا سَعِيدٍ: قَدْ ذَهَبَ مَا تَعْلَمُ، فَقُلْتُ: مَا أَعْلَمُ واللهِ خَيْرٌ مِمَّا لاَ أَعْلَمُ، فَقَالَ: إنَّ النَّاسَ لَمْ يَكُونُوا يَجْلِسُونَ لَنَا بَعْدَ الصَّلاَةِ، فَجَعَلْتُهَا قَبْلَ الصَّلاَةَ)).

واته: پێغەمبەری خوا ﷺ له ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان دەردەچوو بۆ نوێژگه یەکەم شتێك که ئەنجامی دەدا نوێژ بوو، دوای ئەوەی که

نوێژەکەی دەکرد، بە پێوە ڕووبەڕووی خەڵك دەوەستا، و خەڵك دانیشتبوون لە ڕیزەکانیان، ئامۆژگاری دەکردن، و وەسییەتی بۆ دەکردن، و فەرمانی پێدەکردن، و ئەگەر بیویستایە نێردراو بنێرێت دەینارد، یان فەرمان بە شتێك بکات دەیکرد، ئەبوسەعید دەڵێت: بەردەوام خەڵك بەم شێوەیە نوێژی جەژنیان بەجێ دەهێنا، هەتاکو مەروان لە نوێژی جەژنی قوربان یان ڕەمەزان دەرچوو لەو کاتەدا ئەمیری مەدینە بوو، کاتێك چووینە نوێژگە بینیمان کەسیری کوڕی صەلت مینبەرێکی دروستکردووە، مەروان سەرکەوت بەسەریدا ویستی گوتار بخوێنێتەوە پێشنوێژ، پۆشاکەکەیم ڕاکێشا، ئەویش منی ڕاکێشا، و سەرکەوت بەسەر مینبەرەکەدا، و گوتاریدا پێش ئەوەی نوێژ بکات، پێمگوت: سوێند بە خوا گۆڕیتان، گوتی: ئەی ئەبو سەعید: ئەوەی تۆ دەیزانی ڕۆیشت، گوتم: سوێند بە خوا ئەوەی دەیزانم باشترە لەوەی کە نایزانم، گوتی: خەڵك دانەدەنیشتن گوێیان بۆ بگرن دوای بەجێهێنانی نوێژ، لەبەر ئەوە گوتارەکەم پێش نوێژ خوێندەوە.

و ئەبوداود لە عبداللەی کوڕی سائبەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((شهدتُ العيدَ مع النَّبيِّ ﷺ فلمّا قضى الصلاةَ قال: إنّا نخطُبُ فمَن أَحبَّ أن يَجلسَ للخُطبةِ فليجلسْ، ومَن أحبَّ أنْ يذهبَ فليذهبْ)).

واتە: ئامادەی جەژن بووم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ، کاتێك نوێژەکەی کۆتایی پێهێنا فەرمووی: ئێمە گوتار دەخوێنین، کێ پێی خۆشە دابنیشێت و گوێ بگرێت با دابنیشێت، و کێ پێی خۆشە بڕوات با بڕوات.

صەنعانی دەڵێت: ئیجماع نەقڵکراوە لەسەر ئەوەی گوتاری هەردوو جەژنەکە واجب نییە، بە بەڵگەی فەرموودەکەی عبداللەی کوڕی سائب[1].

---

(١). (سبل السلام)(١/٤٣٠).

(**وَيُستَحَبُّ: التَّجَمُّلُ**) بوخاری و مسلم لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((أَخَذَ عُمَرُ جُبَّةً مِنْ إِسْتَبْرَقٍ تُبَاعُ فِي السُّوقِ، فَأَخَذَهَا، فَأَتَى بِهَا رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، ابْتَعْ هَذِهِ تَجَمَّلْ بِهَا لِلْعِيدِ والوُفُودِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّمَا هَذِهِ لِبَاسُ مَنْ لاَ خَلاَقَ لَهُ)).

واتە: عمر جوبەیەکی لە ئاوریشمی ئەستور دروستکراوی لە بازاڕ بینی دەفرۆشرا هێنای بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە بکڕە و خۆتی پێ بڕازێنەوە و لەبەری بکە بۆ جەژن و کاتێك کە شاندەکان سەردانت دەکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەمە پۆشاکی ئەو کەسانەیە کە هیچ پاداشتێکیان نییە لە ڕۆژی قیامەتدا.

پێغەمبەری خوا ﷺ نکۆڵی پێشنیارەکەی عومەری نەکرد، بەڵکو نکۆڵی لەبەرکردنی ئاوریشمی لێکرد، ئیبن ڕەجەب دەڵێت: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە کە خۆڕازاندنەوە و لەبەرکردنی پۆشاکی جوانی بۆ ڕۆژی جەژن باوبووە لایان[1].

و بەیهەقی لە نافعەوە ڕیوایەتی کردووە و ئیبن ڕەجەب و بوصەیری بە صەحیحیان داناوە، دەڵێت: (أَنَّ ابْنَ عُمَرَ كَانَ يَلْبَسُ فِي الْعِيدَيْنِ أَحْسَنَ ثِيَابِهِ).

واتە: ئیبن عومەر لە هەردوو جەژنەکە جوانترین پۆشاکەکانی لەبەر دەکرد.

(**وَالخُرُوجُ إِلَى خَارِجِ البَلَدِ**) دەرچوون بۆ نوێژگە بۆ بەجێهێنانی نوێژی جەژن سوننەتە، بوخاری و مسلم لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((كانَ رَسولُ اللهِ ﷺ يَخْرُجُ يومَ الفِطْرِ والأضْحى إلى المُصَلّى)).

---

(١). (فتح الباري)(٤١٣/٨).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان دەرچوو بۆ نوێژگە.

ئیبن حەجەر دەڵێت: نوێژگە شوێنێکی ناسراو بووە لە مەدینە، لە نێوان ئەو شوێنە و دەرگای مزگەوت هەزار باڵ بووە[1]؛ و ئەلبانی دەڵێت: وا دیارە لای ڕۆژهەڵاتی مزگەوتی پێغەمبەری خوا بووە ﷺ نزیك گۆڕستانی بەقیع[2].

و بوخاری و مسلم لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((كانَ ﷺ يغدو إلى المصلّى في يومِ العيدِ والعنَزةُ تُحملُ بينَ يديْهِ فإذا بلغَ المصلّى نُصِبَت بينَ يديْهِ فيصلِّي إليْها، وذلِكَ أنَّ المصلّى كانَ فضاءً ليسَ فيهِ شيءٌ يستترُ بِهِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەردەچوو بۆ نوێژگە لە ڕۆژی جەژن، کورتە ڕمێکیان لەگەڵ دەبرد، ئەگەر بگەیشتایە بە نوێژگە لە پێشی لە زەوی دەچەقێنرا و دادەنرا، و نوێژی دەکرد، لەبەر ئەوەی نوێژگە دەشت بوو هیچ شتێك نەبوو بیکاتە سوترە.

بەڵام ئەگەر عوزریان هەبوو ئاساییە نەچن بۆ بیابان و لە مزگەوت نوێژی جەژن بکەن، شافعی دەڵێت: پێمان گەیشتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەردوو جەژنەکە دەردەچوو بۆ نوێژگە لە مەدینە، هەروەها لە دوای ئەویشەوە بەوشێوەیە بووە، ئیللا لەبەر عوزری باران و هاوشێوەی ئەوانە[3]؛ و نەوەوی دەڵێت: ئەوەی دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژنی قوربان و ڕەمەزاندا دەردەچوو، و

---

(١). (فتح الباري)(٢/٤٤٩).

(٢). (صلاة العيدين في المصلى هي السنة)(١٦).

(٣). (الأم للشافعي)(١/٢٦٧).

بە نوێژ دەستی پێدەکرد، ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەو کەسەی دەڵێت: سوننەتە دەربچیت بۆ نوێژگە بۆ نوێژی جەژن، و باشترە لە بەجێهێنانی لە مزگەوت، و خەڵك لە زۆربەی شارەکان لەسەر ئەمەن، بەڵام ئەهلی مەککە لە مزگەوت نوێژی جەژن بەجێ دەهێنن[1]؛ دیسان دەڵێت: ئەگەر موسڵمانان عوزریان هەبوو دەرنەچن بۆ بیابان و نوێژگەی جەژن، زانایان ناکۆك نین کە فەرمانیان پێکراوە نوێژی جەژن لە مزگەوت بکەن، لەو عوزرانەی کە بە هۆیەوە دەتوانن دەرنەچن بریتییە لە: باران، قوڕ، ترس، سەرما و هاوشێوەی ئەوانە[2].

(**وَمُخَالَفَةُ الطَّرِيقِ**) ڕۆیشتن لە ڕێگایەکەوە و گەڕانەوە لە ڕێگایەکی ترەوە سوننەتە بۆ نوێژگە (مصلى) یان بۆ مزگەوت، بوخاری لە جابری کوڕی عبداللەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((كانَ النبيُّ ﷺ إذا كانَ يَوْمُ عِيدٍ خالَفَ الطَّرِيقَ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژندا ڕێگای ڕۆیشتن و گەڕانەوەی دەگۆڕی.

و سوننەتە بە سواری نەچێت ئیللا لەبەر عوزر نەبێت، ترمزی و ئیبن ماجە لە عەلی کوڕی ئەبوتالبەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: (مِنَ السُّنَّةِ أن تَخرُجَ إلى العيدِ ماشياً، وأن تأكُلَ شَيئاً قبلَ أن تخرُجَ).

واتە: لە سوننەتە لە ماڵ دەربچیت بۆ نوێژی جەژن بە پێ، و پێش ئەوەی دەربچیت شتێك بخۆیت.

---

(١). (المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج)(١٧٧/٦).

(٢). (المجموع شرح المهذب)(٥/٥).

ترمزی دەڵێت: کردار لەسەر ئەم فەرموودەیە لای زۆربەی زانایان، بە سوننەتی دەزانن لە ماڵ دەربچێت بۆ نوێژی جەژن بە پێ، و پێش ئەوەی لە ماڵ دەربچێت بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان شتێك بخوات[1].

و ئیبن ماجە لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ((كان رسولُ اللهِ ﷺ يخرج إلى العيدِ ماشياً ويرجع ماشيًا)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەردەچوو بۆ نوێژی جەژن بە پێ، و بە پێش دەگەڕایەوە.

(**وَالأَكلُ قَبلَ الخُرُوجِ فِي الفِطرِ دُونَ الأَضحَى**) سوننەتە پێش دەرچوون لە ماڵ بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان چەند خورمایەك بە تاك بخورێت، بوخاری لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لاَ يَغْدُو يَوْمَ الفِطْرِ حَتَّى يَأْكُلَ تَمَرَاتٍ))؛ وقَالَ مُرَجَّأُ بْنُ رَجَاءٍ، حَدَّثَنِي عُبَيْدُ اللهِ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَنَسٌ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: ((وَيَأْكُلُهُنَّ وِتْرًا)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵ دەرنەدەچوو هەتاکو چەند خورمایەکی نەخواردایە، و لە ڕیوایەتێکدا: بە تاك دەیخوارد.

ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەم ڕیوایەتە بوخاری بە موعەلەقی هێناویەتی بەڵام ئەحمەد و ئیبن خوزەیمە لە صەحیحەکەیدا و ئیسماعیلی سەنەدەکەیان گەیاندووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە.

---

(١). (سنن الترمذي)(٢/٤١٠).

و ئەحمەد و ترمزی و ئیبن ماجە لە بورەیدەی کوڕی حوصەیبەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((كَانَ النَّبِيُّ ﷺ لاَ يَخْرُجُ يَوْمَ الْفِطْرِ حَتَّى يَطْعَمَ وَلاَ يَطْعَمُ يَوْمَ الأَضْحَى حَتَّى يُصَلِّيَ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان لە ماڵ دەرنەدەچوو هەتاکو خۆراکی نەخواردایە، و لە ڕۆژی جەژنی قوربان هیچی نەدەخوارد هەتاکو نوێژی جەژنی بەجێ نەهێنایە.

زۆربەی زانایان دەڵێن: سوننەتە شت خواردن دوا بخرێت هەتاکو دوای بەجێهێنانی نوێژی جەژنی قوربان، ئیبن حەجەر دەڵێت: دانایی لە خواردن پێش نوێژی جەژنی ڕەمەزان ئەوەیە نەوەك کەسێك واگومان ببات کە پێویستە بە ڕۆژووبن هەتاکو نوێژی جەژن ئەنجام دەدەن[١].

(**وَوَقتُهَا بَعدَ ارتِفَاعِ الشَّمسِ قَدْرَ رُمْحٍ إِلَى الزَّوَالِ**) جمهوری زانایان دەڵێن: سەرەتای کاتی نوێژی جەژنەکان بەرزبوونەوەی خۆرە بە ئەندازەی ڕمێك، بوخاری بە موعەلەقی و ئەبوداود و ئیبن ماجە لە یەزیدی خومەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((خَرَجَ عَبْدُ اللهِ بْنُ بُسْرٍ صَاحِبُ رَسُولِ اللهِ ﷺ مَعَ النَّاسِ فِي يَوْمِ عِيدِ فِطْرٍ أَوْ أَضْحَى فَأَنْكَرَ إِبْطَاءَ الإِمَامِ، فَقَالَ: إِنَّا كُنَّا قَدْ فَرَغْنَا سَاعَتَنَا هَذِهِ، وَذَلِكَ حِينَ التَّسْبِيحِ)).

واتە: عبداللەی کوڕی بوسری ﷺ هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان یان قوربان لەگەڵ خەڵکدا دەرچوو بۆ نوێژ، نکۆڵی دواکەوتنی

---

(١). بڕوانە: (فتح الباري)(٢/٤٤٧).

پێشنوێژی کرد، و گوتی: ئێمە لەم کاتە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی جەژنمان تەواوکردبوو، و ئەوکاتە کاتی نوێژی چێشتەنگاو بوو؛ واتە: کاتە مەکروهەکە ڕۆیشتبوو.

و کۆتایی کاتەکەی پێش نوێژی نیوەڕۆیە، ئەحمەد و ئەبوداود و ئیبن ماجە لە ئەبوعومەری کوڕی ئەنەسی کوڕی مالکەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((حَدَّثَنِي عُمُومَتِي، مِنَ الأَنْصارِ من أَصْحابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ قالُوا: أُغْمِيَ عَلَيْنا هِلالُ شَوَّالٍ، فَأَصْبَحْنا صِيامًا، فَجاءَ رَكْبٌ من آخِرِ النَّهارِ، فَشَهِدُوا عِنْدَ النَّبِيِّ ق أَنَّهُمْ رَأَوُا الهِلالَ بِالأَمْسِ، فَأَمَرَهُمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ يُفْطِرُوا، وأَنْ يَخْرُجُوا إلى عِيدِهِمْ مِنَ الغَدِ)).

واتە: مامەکانم لە هاوەڵە پشتیوانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیان گێڕامەوە، گوتیان: مانگی شەوالمان نەبینی، ڕۆژوومان گرت، لە کۆتایی ڕۆژدا کۆمەڵە سوارییەك هاتن، لای پێغەمبەری خوا ﷺ گەواهیاندا کە دوێنێ مانگیان بینیوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردن ڕۆژووەکەیان بشکێنن، و بەیانی دەربچن بۆ نوێژی جەژن.

زانایان دەڵێن: سەرەتای نوێژی جەژن بەرزبوونەوەی خۆرە بە ئەندازەی ڕمێك هەتاکو پێش لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان و هاتنی کاتی نیوەڕۆ، ئیبن حەزم دەڵێت: زانایان کۆدەنگن کە کاتی نوێژی جەژن لە بەرزبوونەوەی خۆرەوەیە هەتاکو لادانییەتی لە ناوەڕاستی ئاسمان[1]؛ و شەوکانی دەڵێت: کاتی نوێژی

---

(١). (مراتب الإجماع)(٣٢).

جەژنەکان لە هەڵهانی خۆرەوە دەست پێدەکات هەتاکو لاربوونەوەی لە ناوەڕاستی ئاسمان، وەك هەندێك لە زانایان وا دەڵێن، و ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە سوارییەکان سبەی بچن بۆ نوێژگە بەڵگەیە لەسەر ئەوە، و لە (البحر)دا دەڵێت: کاتەکەی لە دوای بەرزبوونەوەی خۆرەوەیە هەتاکو لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان، و هیچ ناکۆکییەك لەوبارەیەوە نازانم[١].

(**وَلَا أَذَانَ فِيهَا وَلا إِقَامَةَ**) بانگ نادرێت و قامەت ناکرێت بۆ نوێژی جەژنەکان، مسلم لە جابری کوڕی سەمورەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ الْعِيدَيْنِ غَيْرَ مَرَّةٍ وَلَا مَرَّتَيْنِ بِغَيْرِ أَذَانٍ وَلَا إِقَامَة)).

واتە: نوێژی هەردوو جەژنەکەم لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ کردووە نەجارێك و نەدوو جاربەبێ بانگ و قامەت.

وبوخاری و مسلم لە جابرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((شَهِدْتُ مع رَسولِ اللهِ ﷺ الصَّلاةَ يومَ العيدِ، فَبَدأَ بالصَّلاةِ قَبلَ الخُطْبَةِ، بغيرِ أذانٍ ولا إقامَةٍ، ثُمَّ قامَ مُتوَكِّئاً على بلالٍ، فأمَرَ بتَقْوى اللهِ، وحَثَّ على طاعَتِهِ، ووَعَظَ النّاسَ وذَكَّرَهُمْ)).

واتە: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادەی نوێژی جەژن بووم، نوێژمان کرد، پێش گوتار خوێندن، بەبێ بانگدان و قامەتکردن، پاشان دەستی خستە سەرپشتی بیلال و هەستا، فەرمانی کرد بە لە خوا ترسان و پارێزکاری، و هانی موسڵمانانیدا گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوا بکەن، و ئامۆژگاری کردن و چاکەکاری بیرهێنانەوە.

(١). (الدراري المضية شرح الدرر البهية)(١١٨/١).

چەند پرسێك: یەكەم: لە ئیسلامدا تەنها دوو جەژن هەیە: ئەحمەد و ئەبوداود و نەسائی لە ئەنەسی كوڕی مالكەوە ڕیوایەتیان كردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((قدِمَ النَّبيُّ ﷺ المدينةَ ولَهُم يومانِ يَلعبونَ فيهما فقالَ: ما هذانِ اليومانِ؟ قالوا: كنّا نَلعبُ فيهِما في الجاهليَّةِ، فقالَ النبــيُّ ق: قد أبدلَكُمُ اللَّهُ بِهما خيرًا منْهُما: يومَ الأضحى ويومَ الفِطرِ)).

واتە: كاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ مەدینە، دوو ڕۆژیان هەبوو یارییان تێدا دەكرد، فەرمووی: ئەم دوو ڕۆژە چییە؟ گوتیان: ئێمە لە سەردەمی نەفامیدا لەم دوو ڕۆژەدا یاریمان دەكرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوا بۆی گۆڕین بە دوو ڕۆژی باشتر، جەژنی قوربان و جەژنی ڕەمەزان.

دووەم: خۆشۆردن بۆ نوێژی جەژنەكانی ڕەمەزان و قوربان: بەڵگەی ڕاشكاوی صەحیحمان لە فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ نییە بەڵگە بێت لەسەر سوننەتی خۆشۆردن بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان، بەڵام ئەلبانی دەڵێت: باشترین شتێك بكرێتە بەڵگە لەسەر سوننەتی خۆشۆرن بۆ نوێژی هەردوو جەژنەكە، ئەو ئەسەرەیە كە بەیهەقی لە ڕێگای شافعییەوە ئەویش لە زازانەوە بە سەنەدێكی صەحیح ڕیوایەتی كردووە دەڵێت: (سَأَلَ رَجُلٌ عَلِيًّا عَنِ الْغُسْلِ، قَالَ: اغْتَسِلْ كُلَّ يَوْمٍ إِنْ شِئْتَ، فَقَالَ: لَا، الْغُسْلُ الَّذِي هُوَ الْغُسْلُ، قَالَ: يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَيَوْمَ عَرَفَةَ، وَيَوْمَ النَّحْرِ، وَيَوْمَ الْفِطْرِ)[1].

---

(١). (إرواء الغليل في تخريج أحاديث منار السبيل)(١٧٦/١).

واتە: کەسێك پرسیاری لە عەلی کرد دەربارەی خۆشۆردن؟ گوتی: ئەگەر ویستت هەموو ڕۆژێك خۆت بشۆ، گوتی: نەخێر، مەبەستم خۆشۆردنی ئاسایی نییە، گوتی: ڕۆژی هەینی و ڕۆژی عەرەفە، و ڕۆژی جەژنی قوربان و ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان خۆت بشۆ.

و مالك و عبدالرزاق و بەیهەقی لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتیان کردووە و نەوەوی بە صەحیحی داناوە: (أَنَّهُ كَانَ يَغْتَسِلُ يَوْمَ الْفِطْرِ قَبْلَ أَنْ يَغْدُوَ إِلَى الْمُصَلَّى).

واتە: ئیبن عومەر ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان پێش ئەوەی بچێت بۆ نوێژ خۆی دەشۆرد.

و مەزهەبی جمهوری زانایانیش ئەوەیە سوننەتە خۆت بشۆیت پێش ئەوەی بچیت بۆ نوێژی جەژن، و هەندێك کۆڕای زانایان لەسەر ئەو باسە دەگێڕنەوە، ئیبن عبدالبر دەڵێت: فەقیهەکان کۆڕان لەسەر ئەوەی کارێکی باشە خۆشۆردن بۆ هەردوو جەژنەکە، و عەتر لە خۆدان لایان جێگای دەگرێتەوە، و هەرکەسێك خۆی بشوات و بۆنی خۆی خۆش بکات کارێکی باشی کردووە[1]؛ و نەوەوی دەڵێت: خۆشۆردن بۆ هەردوو جەژنەکە سوننەتە بە کۆڕا، بۆ پیاوان و ئافرەتان و منداڵان هەمان حوکمی هەیە[2]؛ و دەتوانرێت مەفهومی ئەم فەرموودەیە کە مالك و شافعی و ئیبن ئەبوشەیبە لە عوبەیدی کوڕی سەباقەوە ڕیوایەتیان کردووە و

---

(١). (الاستذكار)(٢/٣٧٨).

(٢). (المجموع شرح المهذب)(٢/٢٠٢).

ئەلبانی بە حەسەن یان صەحیحی داناوە بکرێتە بەڵگە، کە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((يَا مَعْشَرَ الْمُسْلِمِينَ إِنَّ هَذَا يَوْمٌ جَعَلَهُ اللهُ عِيدًا فَاغْتَسِلُوا)).

واتە: ئەی گرۆی موسڵمانان ئەم ڕۆژە (مەبەست ڕۆژی هەینییە) خوا کردوویەتی بە جەژن، خۆتان بشۆن.

و کاتی خۆشۆردنەکەشی نەوەوی دەڵێت: دروستە دوای سپێدە بە ڕەهایی، و ئەوەی کە دیارە پێش ئەوەش دروستە[1].

سێیەم: سوننەتە تەکبیرات بکرێت لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا: ئەمە بۆچوونی جمهوری زانایانە، خوا دەفەرموێت: ﴿وَلِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ۝١٨٥﴾(البقرة).

واتە: بۆ ئەوەی خوا بە گەورە و بەرز و بڵند ڕابگرن لەبەر ئەوەی کە هیدایەتیداون، و بۆ ئەوەی سوپاسگوزار و شوکرانە بژێرن.

ئیبن ئەبوحاتەم لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ﴿وَلِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ ۝١٨٥﴾ مەبەست تەکبیراتی ڕۆژی جەژنی ڕەمەزانە.

و تەبەری دەڵێت: ئەو زیکرەی کە خوا هانیداون کە موسڵمانان بیڵێنەوە تەکبیرکردنە، لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا[2]؛ و ئیبن کەسیر دەڵێت: زۆرێك لە زانایان شەرعییەتی تەکبیرکردنیان لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزانیان لەم ئایەتەوە

---

(١). (روضة الطالبين وعمدة المفتين)(٧٥/٢).

(٢). (جامع البيان في تأويل القرآن)(٤٧٨/٣).

وەرگرتووە، هەتاکو داودی زاهری دەڵێت: واجبە لەبەر ئەوەی فەرمانی کردووە بە تەکبیرکردن....، و لە بەرامبەردا مەزهەبی ئەبوحەنیفە دەڵێن: شەرعی نییە تەکبیرات بکرێت لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا، و زانایانی تر دەڵێن: سوننەتە[1]؛ و ئیبن ئەبو شەیبە لە زهورییەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە دەڵێت: ((كان رَسولُ اللهِ ﷺ يَخرُجُ يومَ الفطرِ فيُكبرُّ مِن حينِ يَخرُجُ مِن بَيتِه حتى يأتيَ المُصَلّى، فإذا قَضى الصَّلاةَ قَطعَ التَّكبيرَ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا ئەو کاتەی لە ماڵ دەردەچوو تەکبیراتی دەکرد هەتاکو دەگەیشتە نوێژگە، ئەگەر نوێژەکەی بەجێ بهێنایە کۆتایی بە تەکبیرات دەهێنا.

ئەلبانی دەڵێت: ئەم فەرموودەیە مورسەلێکی صەحیحە و شاهیدی بۆ هێناوەتەوە لە (الصحيحة)دا[2]، و دارقوتنی و بەیهەقی لە نافعەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە: دەڵێت: ((عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّهُ كَانَ يَجْهَرُ بِالتَّكْبِيرِ يَوْمَ الْفِطْرِ إِذَا غَدَا إِلَى الْمُصَلَّى حَتَّى يَخْرُجَ الْإِمَامُ فَيُكَبِّرُ بِتَكْبِيرِهِ)).

واتە: ئیبن عومەر دەنگی بەرزدەکردەوە بە تەکبیرکردن لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا کاتێك دەڕۆیشت بۆ نوێژگە، هەتاکو ئەو کاتەی پێشنوێژ (إمام) ئامادە دەبوو تەکبیری دەکرد و خەڵك بە تەکبیراتەکەی تەکبیریان دەکرد.

چوارەم: سوننەتە تەکبیرات بکرێت لە جەژنی قوربان: خوا دەفەرموێت: ﴿وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡدُودَٰتٖۚ ٢٠٣﴾.

---

(١). (تفسير القرآن العظيم)(١/٥٠٥).

(٢). (سلسلة الأحاديث الصحيحة وشيء من فقهها وفوائدها)(١/٣٣٠).

واتە: یادی خوا بکەن لەو چەند ڕۆژە دیاریکراو و ژمێردراوەدا کە ڕۆژەکانی (التشریقە)، کە دەکاتە (یازدە و دوازدە و سیازدە)ی مانگی حاجییان.

ئیبن ئەبوحاتەم لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ﴿أَيَّامٍ مَّعۡدُودَٰتٍۚ﴾ چوار ڕۆژە، ڕۆژی جەژنی قوربان و سێ ڕۆژەکەی دوای ئەوە.

و لیژنەی هەمیشەیی فەتوا دەڵێن: تەکبیراتی ڕەها هەتاکو کۆتا ڕۆژی (التشریق) بەردەوامە، و هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان ئەو کەسانەی لە حەجن و ئەو کەسانەی لە حەجنین، چونکە خوا دەفەرموێت: ﴿وَيَذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡلُومَٰتٍ ٢٨﴾(الحج).

واتە: بۆ ئەوەی یادی خوا بکەن لە چەند ڕۆژێکی دیاریکراودا.

و دەفەرموێت: ﴿وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡدُودَٰتٖۚ ٢٠٣﴾(البقرة).

واتە: یادی خوا بکەن لە چەند ڕۆژێکی ژمێردراودا.

﴿أَيَّامٖ مَّعۡلُومَٰتٍ﴾ دە ڕۆژی یەکەمی مانگی حاجییانە، و ﴿أَيَّامٍ مَّعۡدُودَٰتٍۚ﴾ ڕۆژەکانی تەشریقە، ئەمە گوتەی ئیبن عەباسە و بوخاری لێیەوە ڕیوایەتی کردووە، و بوخاری دەڵێت: (كانَ ابْنُ عُمَرَ و ابْنُ عَبّاسٍ يَخْرُجانِ إلى السُّوقِ أيّامَ العَشْرِ، فَيُكَبِّرانِ ويُكَبِّرُ النّاسُ بِتَكْبِيرِهِما).

واتە: ئیبن عومەر و عەباس لە ماڵ دەردەچوون لە دە ڕۆژەکەی سەرەتای مانگی حاجییان تەکبیراتیان دەکرد، و خەڵکیش بە تەکبیراتەکەی ئەوان تەکبیریان دەکرد[1].

---

(١). (فتاوى اللجنة الدائمة - ١)(٣٠٨/٨).

پێنجەم: ئەگەر کەسێك نوێژی جەژنی لە دەست بچێت، دوو ڕکات نوێژ دەکات، ئەگەر کاتەکەی تەواو نەبووبێت، نوسەر لە (**بَابُ القَضَاءِ لِلفَوَائِتِ**) باسی ئەوەی ئەگەر دوای نیوەڕۆ بزانرێت جەژنە ڕۆژێك دوای ئەوە قەزا دەکرێتەوە، و بوخاری بابەتێکی لە صەحیحەکەیدا هێناوە دەڵێت: (بَابٌ: إِذَا فَاتَهُ العِيدُ يُصَلِّي رَكْعَتَينِ، وكَذَلِكَ النِّسَاءُ، ومَنْ كَانَ فِي البُيُوتِ والقُرَى لِقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: هَذَا عِيدُنَا أَهْلَ الإِسْلاَمِ، وأَمَرَ أَنَسُ بْنُ مَالك مَوْلاَهُمْ ابْنَ أَبِي عُتْبَةَ بِالزَّاوِيَةِ فَجَمَعَ أَهْلَهُ وبَنِيهِ، وصَلَّى كَصَلاَةِ أَهْلِ المِصْرِ وتَكْبِيرِهِمْ وقَالَ عِكْرِمَةُ: أَهْلُ السَّوَادِ يَجْتَمِعُونَ فِي العِيدِ، يُصَلُّونَ رَكْعَتَيْنِ كَمَا يَصْنَعُ الإِمَامُ ؛ وقَالَ عَطَاءٌ: إِذَا فَاتَهُ العِيدُ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ).

واتە: بابەتی ئەوەی ئەگەر کەسێك نوێژی جەژنی لە دەست بچێت دوو ڕکات نوێژ دەکات، هەروەها ئافرەتان، و ئەوانەی لەماڵەوە و دانیشتووی گوندەکانن، لەبەر ئەو فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەفەرموێت: ئەمە جەژنی ئێمەیە ئەهلی ئیسلام؛ و ئەنەسی کوڕی مالك فەرمانی بە ئیبن ئەبوعوتبەی مەولایان کرد لە (زاویە) (ناوی شوێنە) منداڵ و کەسوکارەکەی کۆکردەوە، نوێژی کرد وەك نوێژی خەڵکی شار و تەکبیراتەکەیان، و عیکرمە دەڵێت: خەڵکی دەشتەکی و بیابان نشین کۆدەبنەوە لە ڕۆژی جەژندا، و دوو ڕکات نوێژدەکەن وەك چۆن پێشنوێژ نوێژ دەکات، و عەتا دەڵێت: ئەگەر جەژنی لە دەستچوو دوو ڕکات نوێژ دەکات.

شەشەم: لە پێش و دوای نوێژی جەژنەوە نوێژی نییە، بەڵام دوای گەڕانەوە سوننەتە دوو ڕکات نوێژ بکرێت، بوخاری و مسلم لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتیان

کردووە دەڵێت: ((أنَّ رسولَ اللهِ ﷺ خرَجَ يومَ أضْحَى، أو فِطرٍ، فصلّى ركعتينِ لم يُصلِّ قبلها و لا بعدَها)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی جەژنی قوربان یان ڕەمەزان دەرچوو، دوو ڕکات نوێژی جەژنی کرد، لە پێش و لە دوای نوێژەکەوە هیچ نوێژی نەکرد.

و ئەحمەد و ترمزی و حاکم لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە دەڵێت: ((أنَّهُ خَرَجَ يَوْمَ عِيدٍ فَلَمْ يُصَلِّ قَبْلَها ولا بَعْدَها، وذَكَرَ أنَّ النَّبِيَّ ﷺ فَعَلَهُ)).

واتە: لە ڕۆژی جەژندا دەرچووە لە پێش و لە دوای نوێژەکەوە هیچ نوێژێکی نەکرد، و باسی ئەوەی کردووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەیەی کردووە.

و ئەحمەد و ئیبن ماجە لە عبداللەی کوڕی عەمرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ((أنَّ رسولَ اللهِ ﷺ خرَجَ فَصَلّى بِهم العيد، لَمْ يُصَلِّ قَبْلَها ولا بَعْدَها)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو نوێژی جەژنی پێکردین، لە پێش و لە دوای هیچ نوێژێکی نەکرد.

ئەمە بۆ کاتێکە کەلە نوێژگە نوێژی جەژن ئەنجام بدرێت، بەڵام وەك ئێستا بە داخەوە ئەو سوننەتە لاواز بووە، و لە زۆر شوێن نوێژ لە مزگەوت ئەنجام دەدرێت، پێویستە موسڵمان کاتێك چووە مزگەوتەوە پێش ئەوەی دابنیشێت دوو ڕکات نوێژی (تحية المسجد) ئەنجام بدات، چونکە بوخاری و مسلم لە ئەبوقەتادە

حارسی کوڕی ربعییەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویێت: ((إِذا دَخَلَ أحَدُكُمُ المَسْجِدَ، فَلاَ يَجْلِسْ حتّى يُصَلِّيَ رَكْعَتَينْ)).

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە چووە مزگەوت، با دانەنیشێت هەتاکو دوو ڕکات نوێژ ئەنجام دەدات.

و ئەحمەد و ئیبن خوزەیمە لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ((كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُفْطِرُ يَوْمَ الْفِطْرِ قَبْلَ أَنْ يَخْرُجَ، وَكَانَ لَا يُصَلِّي قَبْلَ الصَّلَاةِ، فَإِذَا قَضَى صَلَاتَهُ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ))، و لە ڕیوایەتی ئیبن ماجەدا کە ئەلبانی دیسان بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ((كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، لَا يُصَلِّي قَبْلَ الْعِيدِ شَيْئًا، فَإِذَا رَجعَ إِلَى مَنْزِلِهِ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان شتی دەخوارد پێش ئەوەی لە ماڵ دەربچێت، و پێش نوێژی جەژن هیچ نوێژی نەدەکرد، و ئەگەر نوێژی جەژنی بکردایە دوو ڕکات نوێژی دەکرد، و لە ڕیوایەتی ئیبن ماجەدا دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێش نوێژی جەژن هیچ نوێژی نەدەکرد، بەڵام ئەگەر بگەڕایەتەوە بۆ ماڵەوە دوو ڕکات نوێژی دەکرد.

حەوتەم: ڕۆژووگرتن لە جەژنەکاندا حەرامە: بوخاری و مسلم لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنْ صِيَامِ يَوْمَيْنِ: يَوْمِ الفِطْرِ وَيَوْمِ النَّحْرِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ یاساغی کردووە لە ڕۆژووگرتنی دوو ڕۆژ: ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان، و ڕۆژی جەژنی قوربان.

## بَابُ صَلَاةِ الخَوفِ

**قَد صَلَّاهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَى صِفَاتٍ مُختَلِفَةٍ، وَكُلُّهَا مُجزِيَةٌ، وَإِذَا اشتَدَّ الخَوفُ وَالتَحَمَ القِتَالُ، صَلَّاهَا الرَّاجِلُ والرَّاكِبُ وَلَو إِلَى غَيرِ القِبلَةِ وَلَو بِالإِيمَاءِ.**

## بابەتی نوێژی ترس

**پێغەمبەری خوا ﷺ بە چەند شێوەیەکی جیاواز نوێژی ترسی کردووە، و هەمووی دروستە، و ئەگەر ترس زۆر بوو و شەڕ دەستەویەخە بوو، بە پیادە و سواری نوێژ دەکات ئەگەر ڕووەو قیبلەش نەبێت، ئەگەر بە ئاماژەش بێت.**

نوێژی ترس لە دوژمنان بە بەڵگەی قورئان و سوننەت جێگیربووە و پێغەمبەری خوا ﷺ بە چەند شێوەیەکی جیاواز کردوویەتی، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓاْ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُواْ فَلْيَكُونُواْ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّواْ فَلْيُصَلُّواْ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُواْ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ وَدَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَٰحِدَةً وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓاْ أَسْلِحَتَكُمْ وَخُذُواْ حِذْرَكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٠٢﴾﴾(النساء).

واتە: ئەگەر تۆ لەگەڵیان ئامادەبووی ئەی پێغەمبەری خوا و نوێژت بۆ کردن لە کاتێکدا دەترسان لە دوژمنان، با دەستەیەکیان نوێژت لەگەڵدا بکەن و چەك و ئامرازەکانی شەڕ هەڵبگرن، ئەگەر سوژدەیان برد ئەو دەستەکەی تر لە پشتییانەوەبن و پاسەوانیتان بکەن، پاشان دەستەکەی تر کە نوێژیان نەکردووە

بابێن نوێژت لەگەڵدا بکەن و چەك و ئامرازەکانی شەڕ هەڵبگرن، وریا و ئامادەبن و چەك و ئامرازەکانی شەڕ هەڵبگرن، بێباوەڕان پێیان خۆشە بێئاگابن لە چەك و تفاقی شەڕ و کەرەستەکانتان، بۆ ئەوەی پەلامارتان بدەن بە یەکجار تەفروتوناتان بکەن، تاوانتان ناگات ئەگەر باران تەڕی کردبوون یان نەخۆشبوون چەکەکانتان دابنێن، بەڵام وریا و ئامادەبن، بێگومان خوا سزایەکی سەرشۆڕکەری بۆ بێباوەڕان ئامادەکردووە.

و ئەبوداود و نەسائی و ئیبن حبان لە ئەبو عەیاشی زورەقییەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ بِعُسْفَانَ، فَاسْتَقْبَلَنَا الْمُشْرِكُونَ، عَلَيْهِمْ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ، وَهُمْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ، فَصَلَّى بِنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ الظُّهْرَ، فَقَالُوا: قَدْ كَانُوا عَلَى حَالٍ لَوْ أَصَبْنَا غِرَّتَهُمْ وَهُمْ فِي الصَّلَاةِ، ثُمَّ قَالُوا: تَأْتِي عَلَيْهِمِ الْآنَ صَلَاةٌ بَعْدَ هَذِهِ، هِيَ أَحَبُّ إِلَيْهِمْ مِنْ أَبْنَائِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ فَنَزَلَ جِبْرِيلُ بِهَذِهِ الْآيَاتِ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ: ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ...﴾)).

واتە: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا بووین ﷺ لە عوسفان، هاوبەش بڕیاردەران ڕووبەڕوومان بوونەوە بەسەرکردایەتی خالدی کوڕی وەلید، لە نێوان ئێمە و قیبلەدا بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆی کرد، کاتێك موسڵمانان لە نوێژدا بوون، گوتیان: ئەگەر لەو کاتەدا بماندایە بەسەریاندا تەفروتوونامان بکردایەن، پاشان گوتیان: ئێستا کاتی نوێژێکی ترە خۆشەویستترە لە لایان لە نەوەکانیان و نەفسی خۆیشیان، جبریل ئەم ئایەتەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ

دابەزاند لە لایەن خواوە لە نێوان نیوەڕۆ و عەسردا: ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ...﴾ هەتا کۆتایی ئایەتەکە.

ئیبن کەسیر دەڵێت: نوێژی ترس جۆری زۆرە، چونکە هەندێك جار دوژمن لە ئاراستەی قیبلەیە، و هەندێك جار بە پێچەوانەوەیە، نوێژەکانیش هەندێك جار چوار ڕکاتییە، و هەندێك جار سێ ڕکاتییە وەك نوێژی مەغریب، و هەندێك جار دوو ڕکاتییە وەك نوێژی بەیانی و نوێژی سەفەر، پاشان هەندێك جار بە کۆمەڵ ئەنجامی دەدەن، و هەندێك شەڕی دەستەویەخەیە و ناتوانن بە کۆمەڵ ئەنجامی بدەن، بەڵکو بە تەنها ئەنجامی دەدەن ئەگەر ڕوویان لە قیبلە بێت یان پشتیان لێی بێت، بە پیادە و بە سواری[1]؛ و قەنوجی دەڵێت: ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕوونی نەکردووەتەوە هەریەکە لەو کۆمەڵە چەند ڕکات نوێژ دەکەن، و نوێژی ترس لە سوننەتدا بە چەند شێوازێکی جیاواز هاتووە، هەموویان دروستە، هەرکەسێك بە یەکێك لەو شێوازانە نوێژەکەی بکات ئەوەی فەرمانی پێکراوە بەجێی هێناوە، هەرکەسێك لە زانایان بۆچوونی وابێت کە تەنها شێوازێك هەڵبژێرێت ڕاستی نەپێکاوە[2]؛ و ئەلبانی دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بە چەند شێوازێکی جیاواز نوێژی بە هاوەڵە بەڕێزەکانی کردووە، کە پازدە شێوازە، بەڵام ئیبن قەیم دەڵێت: تەنها حەوت شێوازی صەحیحە، یەکێك لەو شێوازە صەحیحانە: پێش نوێژ ڕووەو قیبلە دەوەستێت و لەو کاتەدا دوژمن لە پشتییانەوەیە، ئەگەر نوێژ بە

(١). (تفسير القرآن العظيم)(٢/٣٩٨).

(٢). (فتح البيان في مقاصد القرآن)(٣/٢٢٦).

هەموو هاوەڵانی بکات لەوانەیە بێباوەڕان بدەن بە سەریاندا، لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵانی دەکرد بە دوو بەشەوە، کۆمەڵێکیان ڕووبەڕووی دوژمنان دەوەستنەوە، و کۆمەڵەکەی تریان لەگەڵیدا نوێژ دەکەن، ڕکاتێك نوێژ دەکەن ئەو ڕیزەی لەگەڵیدایە نییەتی جیابوونەوە لە پێشنوێژ دەهێنن و دادەنیشن و تەحییات دەخوێنن و سەلام دەدەنەوە، و دەچن شوێنی ئەو کۆمەڵە دەگرنەوە کە ڕووبەڕووی دوژمنان وەستاون، پاشان ئەو کۆمەڵە دێن لە پشتی پێغەمبەری خواوە ﷺ نوێژ دەکەن، و چاوەڕوانیان دەکات و لە ڕکاتی دووەمدا بە پێوە وەستاوە، لەگەڵیان سەلام دەداتەوە، بەوەش پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات نوێژی کرد، و هەر کۆمەڵێك ڕکاتێك نوێژیان کرد، ئەمەش مانای ئەو فەرموودەی پێغەمبەری خوایە ﷺ کە دەفەرموێت: ((وَفِي الْخَوْفِ رَكْعَةً))، واتە: نوێژی ترس یەك ڕکاتە[1]؛ بەڵام ئەگەر ترس زۆر بوو و شەڕی دەستەویەخە بوو ڕووکردنە قیبلە و بە کۆمەڵ ئەنجامدانی لەسەر موسڵمانان دەکەوێت، بوخاری لە نافعەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ: كَانَ إِذَا سُئِلَ عَنْ صَلَاةِ الْخَوْفِ، قَالَ: يَتَقَدَّمُ الْإِمَامُ وَطَائِفَةٌ مِنَ النَّاسِ، فَيُصَلِّي بِهِمُ الْإِمَامُ رَكْعَةً، وَتَكُونُ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْعَدُوِّ لَمْ يُصَلُّوا، فَإِذَا صَلَّى الَّذِينَ مَعَهُ رَكْعَةً اسْتَأْخَرُوا مَكَانَ الَّذِينَ لَمْ يُصَلُّوا، وَلَا يُسَلِّمُونَ، وَيَتَقَدَّمُ الَّذِينَ لَمْ يُصَلُّوا فَيُصَلُّونَ مَعَهُ رَكْعَةً، ثُمَّ يَنْصَرِفُ الْإِمَامُ وَقَدْ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، فَيَقُومُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنَ الطَّائِفَتَيْنِ فَيُصَلُّونَ لِأَنْفُسِهِمْ رَكْعَةً بَعْدَ أَنْ يَنْصَرِفَ الْإِمَامُ، فَيَكُونُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنَ الطَّائِفَتَيْنِ قَدْ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، فَإِنْ كَانَ خَوْفٌ هُوَ أَشَدُّ مِنْ

---

(١). (الهدى والنور)(٥٣٣).

ذَلِكَ، صَلَّوْا رِجَالًا قِيَامًا عَلَى أَقْدَامِهِمْ أَوْ رُكْبَانًا، مُسْتَقْبِلِي الْقِبْلَةِ أَوْ غَيْرَ مُسْتَقْبِلِيهَا))؛ قَالَ مَالِكٌ: قَالَ نَافِعٌ: لَا أُرَى عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ ذَكَرَ ذَلِكَ إِلَّا عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ.

واتە: ئیبن عومەر ئەگەر پرسیارت دەربارەی نوێژی ترست لێ بکردایە، دەیگوت: پێشنوێژ ڕکاتێك نوێژ بە کۆمەڵێك دەکات، و کۆمەڵێکیان ڕووبەڕووی دوژمن دەوەستنەوە و نوێژ ناکەن، پاشان دەچن بۆ شوێنی ئەو کەسانەی کە نوێژیان نەکردووە، ئەو کۆمەڵەش ڕکاتێك نوێژ لەگەڵ پێشنوێژەکەدا دەکەن، پاشان پێشنوێژەکە سەلام دەداتەوە دوای ئەوەی دوو ڕکات نوێژی کردووە، و ئەو دوو کۆمەڵەش هەریەکەیان ڕکاتێك نوێژ بۆ خۆیان دەکەن، بەوەش هەر کۆمەڵێکیان دوو ڕکات نوێژ دەکەن، ئەگەر ترس زیاتربوو، بە پێوە یان بە سواری، ڕوویان لە قیبلە بێت یان پشتیان لێی بێت نوێژەکەیان دەکەن؛ مالك لە نافعەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: وادەبینم ئیبن عومەر ئەمەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاوەتەوە.

و بەیهەقی لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((إِذَا اخْتَلَطُوا، فَإِنَّمَا هُوَ التَّكْبِيرُ، وَالإِشَارَةُ بِالرَّأْسِ)).

واتە: ئەگەر هەردوو سوپای باوەڕداران و بێباوەڕان دەستەویەخە بوونەوە، نوێژکردن لەو کاتەدا تەنها (الله أکبر) و ئاماژەکردنە بە سەر.

هەندێك لە زانایان بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی کە مسلم لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((فَرَضَ اللهُ الصَّلَاةَ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّكُمْ ﷺ فِي الْحَضَرِ أَرْبَعًا وَفِي السَّفَرِ رَكْعَتَيْنِ وَفِي الْخَوْفِ رَكْعَةً)).

واتە: خوای پەروەردگار نوێژی لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەتان ﷺ فەرزکردووە، لە شاردا چوار ڕکات و لە سەفەردا دوو ڕکات و لە ترسدا یەك ڕکاتە.

و نەسائی لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ صَلَّى بِذِي قَرَد، وَصَفَّ النَّاسَ خَلْفَهُ صَفَّيْنِ صَفًّا خَلْفَهُ، وَصَفًّا مُوَازِيَ الْعَدُوِّ، فَصَلَّى بِالَّذِينَ خَلْفَهُ رَكْعَةً، ثُمَّ انْصَرَفَ هَؤُلَاءِ إِلَى مَكَانِ هَؤُلَاءِ، وَجَاءَ أُولَئِكَ فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً، وَلَمْ يَقْضُوا)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە (ذي قرد)[1] نوێژی کرد، و خەڵکی لە پشتییەوە کردە دوو ڕیز، ڕیزێك لە پشتی خۆیەوە، و ڕیزێك تەریب و بەرامبەر دوژمنان، نوێژی بەو کەسانە کرد لە پشتییەوە بوون، پاشان ئەو کەسانە ڕۆیشتنە شوێنی ئەوانی تر، و ئەوانیشی هاتن پێغەمبەری خوا ﷺ یەك ڕکات نوێژی پێکردن و هیچیان قەزا نەکردەوە.

بە بەڵگەی ئەم فەرموودانە دەڵێن: نوێژی ترس یەك ڕکاتە، صەنعانی دەڵێت: نوێژی ترس یەك ڕکاتە بە بۆچوونی سەوری و کۆمەڵێك لە زانایان و ئەوە قسەی ئەبوهورەیرە و ئەبوموسایە لە هاوەڵان[2].

و ئەم فەرموودەیە کە بوخاری و مسلم لە جابرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((أَقْبَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِذَاتِ الرِّقَاعِ... قَالَ: فَنُودِيَ بِالصَّلَاةِ فَصَلَّى

---

(١). ناوی ئاوێکە نزیك دوو شەو لە شاری مەدینەوە دوورە لەسەر ڕێگای خەیبەر، و غەزایەك لەو شوێنە ڕوویداوە، و غەزوەی (الغابە)شی پێدەگوترێت، و وشەی (قرد) مانای خوری خراپە. بڕوانە: (نخب الأفکار)(٥/٢٠٤).

(٢). بڕوانە: (سبل السلام)(٣/١٧٣).

بِطَائِفَةٍ رَكْعَتَينِ، ثُمَّ تَأَخَّرُوا وَصَلَّى بِالطَّائِفَةِ الْأُخْرَى رَكْعَتَينِ؛ قَالَ: فَكَانَتْ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ أَرْبَعُ رَكَعَاتٍ وَلِلْقَوْمِ رَكْعَتَانِ)).

واتە: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشتین هەتاکو گەیشتینە (ذات الرقاع)[1]... دەڵێت: بانگدرا بۆ نوێژ و پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات نوێژی بە کۆمەڵێك کرد، پاشان ئەوانە گەڕانە دواوە، و دوو ڕکات نوێژی بە کۆمەڵەکەی تر کرد، دەڵێت: بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بوو بە چوار ڕکات و بۆ هاوەڵانی دوو ڕکات.

بەڵگەی جۆرێکی ترە لە جۆرەکانی نوێژی ترس کە تێدا پێشنوێژ چوار ڕکات نوێژ دەکات و جەنگاوەرەکانیش دەبنە دوو بەشەوە هەر بەشێکیان دوو ڕکات نوێژ لەگەڵ ئیمامەکەیان دەکەن.

و نوێژی مەغریب زانایان باسی ئیجماعیان کردووە کە کورت ناکرێتەوە، شەوکانی دەڵێت: نوێژی مەغریب ئیجماع لەسەرە کە کورت ناکرێتەوە، و ناکۆکی هەیە ئایا باشتروایە بە کۆمەڵی یەکەم دوو ڕکات بکات و بە کۆمەڵی دووەم یەك ڕکات بکات، یان بە پێچەوانەوە، هیچ لەوبارەیەوە لە پێغەمبەر خواوە ﷺ جێگیر نەبووە، و ڕیوایەتکراوە کە عەلی شەوی (الهرير)[2] کردوویەتی و ڕیوایەتەکان

(١). ناوی غەزایەکە، و ناکۆکن بۆچی ئەو ناوەی لێنراوە، ئیبن هیشام دەڵێت: بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە لەبەر ئەوەی ئاڵاکەیان پینە کرد، و گوتراوە: لەبەر دارێك بووە لەو شوێنە کە ئەو ناوەی هەبووە، و گوتراوە: ئەو شوێنەی تێیدا دابەزیون ڕەنگاوڕەنگ بووە هاوشێوەی پارچەیەکی پینەکراو، و گوتراوە: لەبەر ئەوەی ئەسپەکانیان ڕەش و سپی بووە، ئەوە قسەی ئیبن حبانە، و واقیدی دەڵێت: ناوی شاخێکە لەو شوێنە ڕەنگی جیاوازی تێدابووە. بڕوانە: (البحر المحيط الثجاج)(٦١٣/٣١).

(٢). ناوی شەوێکە لە شەڕی (صفين). بڕوانە: (فتح الباري)(١٢٣/١١).

ناکۆکن لە عەلییەوە وەك چۆن بۆچوونەکان ناکۆکن لەوبارەیەوە، ئەوەی دیارە هەمووی دروستە، ئەگەر بۆ هەرکۆمەڵێك سێ ڕکات بکات، بۆ ئیمامەکە دەبێتە شەش ڕکات، و بۆ نوێژکەرەکان سێ ڕکاتە، ئەوەش صەوابە وەك قیاسکردن لەسەر کردەوە لە نوێژەکانی تر، و پێشنوێژی ئیمامێك کە نوێژی سوننەت دەکات بۆ ئەو کەسەی نوێژی فەرز دەکات لە سوننەتدا هاتووە[1].

ئایا نوێژی ترس لە شاردا دەکرێت؟، ئیبن قودامە دەڵێت: نوێژی ترس دروستە لە شاردا ئەگەر ئەوە پێویست بوو، بەوەی دوژمن بێنە نزیك شار، ئەوە بۆچوونی ئەوزاعی و شافعییە، و لە مالکییەوە گێڕدراوەتەوە کە لە شوێنی نیشتەجێ بوون دروست نییە... بەڵام هاوەڵەکانی ناکۆکن لەگەڵیدا و بۆچوونیان وەکو ئێمەیە[2]؛ و نەوەوی دەڵێت: ڕکاتەکانی نوێژ ترس ناگۆڕێت، ئەوە مەزهەبی ئێمە و و مەزهەبی هەموو زاناکانە لە هاوەڵان و تابعییەکان و دوای ئەوانیشە جگە لە ئیبن عەباس و حەسەنی بەصری و زەحاك و ئیسحاقی کوڕی ڕاهویەیە کە دەڵێن: نوێژی ترس یەك ڕکاتە[3].

---

(١). (الدراري المضية)(١/١٢٠-١٢١).

(٢). (المغني)(٣/٣٠٥).

(٣). (المجموع)(٤/٤٠٤).

## بَابُ صَلاةِ السَّفَرِ

**يَجِبُ القَصرُ عَلَى مَن خَرَجَ مِن بَلَدِهِ قَاصِدًا لِلسَّفَرِ، وَإِنْ كَانَ دُونَ بَرِيدٍ، وَإِذَا أَقَامَ بِبَلَدٍ مُتَرَدِّدًا، قَصَرَ إِلَى عِشرِينَ يَومًا، ثُمَّ يُتِمُّ، وَإِذَا عَزَمَ عَلَى إِقَامَةِ أَرْبَعٍ أَتَمَّ بَعدَهَا، وَلَهُ الجَمعُ تَقدِيمًا وَتَأْخِيرًا، بِأَذَانٍ وَإِقَامَتَينِ.**

## بابەتی نوێژی سەفەر

**واجبە لەسەر ئەو کەسەی لە شوێنی نیشتەجێ بوونی دەردەچێت بە مەبەستی سەفەرکردن نوێژ کورت بکاتەوە، ئەگەر ئەو شوێنەی سەفەری بۆ دەکات دوورییەکەی لە بەریدێکیش کەمتر بێت، و ئەگەر کەسێك لە شوێنێك نیشتەجێ بوو و دوودڵ بوو لە مانەوەی، نوێژ هەتاکو بیست ڕۆژ کورت دەکاتەوە، پاشان نوێژەکانی بە تەواوی دەکات، و ئەگەر بڕیاریدا چوار ڕۆژ بمێنێتەوە دوای ئەوە نوێژەکانی بە تەواوی دەکات، و بۆی هەیە نوێژەکانی کۆ بکاتەوە بەپێش خستن یان بە دواخستن، بە یەك بانگ و دوو قامەت.**

(**يَجِبُ القَصرُ عَلَى مَن خَرَجَ مِن بَلَدِهِ قَاصِدًا لِلسَّفَرِ**) کورتکردنەوەی نوێژە فەرزە چوار ڕکاتییەکان شەرعییە بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و ئیجماعی زانایان، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱلْكَٰفِرِينَ كَانُوا۟ لَكُمْ عَدُوًّا مُّبِينًا ﴿١٠١﴾﴾ (النساء).

واتە: ئەگەر سەفەرتان کرد و بەسەر زەویدا گەڕان، گوناهتان ناگات لە نوێژەکان کورت بکەنەوە، ئەگەر ترسان بێباوەڕان بەڵا و ئاشوبتان بەسەردا بهێنن، بێگومان بێباوەڕان دوژمنی ئاشکرای ئێوەن.

و بوخاری و مسلم لە حارسەی کوڕی وەهەبی خوزاعییەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ بِمِنًى أَكْثَرَ مَا كَانَ النَّاسُ وَآمَنَهُ رَكْعَتَيْنِ)).

واتە: نوێژی نیوەڕۆ و عەسرم لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ کرد دوو ڕکات لە مینا، و ئێمە هیچ کاتێك لەو کاتە ژمارەمان زیاتر و ئاسایش تر نەبوو.

و مسلم لە یەعلای کوڕی ئومەیەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((قُلْتُ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ: ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾، فَقَدْ أَمِنَ النَّاسُ، فَقَالَ: عَجِبْتُ مِمَّا عَجِبْتَ مِنْهُ فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ: صَدَقَةٌ تَصَدَّقَ اللهُ بِهَا عَلَيْكُمْ، فَاقْبَلُوا صَدَقَتَهُ)).

واتە: پرسیارم کرد لە عومەری کوڕی خەتاب، گوتم: خوا دەفەرموێت: ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾، ئێستا خەڵك لە ئاسایشدا دەژین، عومەر گوتی: منیش سەرم سوڕما لەوەی تۆ پرسیاری دەربارە دەکەیت، پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد فەرمووی: فەزڵ و بەخشینی خوایە پێی بەخشیون، بەخشینەکەی وەربگرن.

و بوخاری و مسلم لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەمە لەفزی بوخارییە دەڵێت: ((صَحِبْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَكَانَ لَا يَزِيدُ فِي السَّفَرِ عَلَى رَكْعَتَيْنِ، وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ كَذَلِكَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُم)).

واتە: هاوەڵی پێغەمبەری خوام ﷺ کرد، لە سەفەردا دوو ڕکات زیاتری نەدەکرد، هەروەها ئەبوبەکر و عومەر و عوسمانیش خوایان لێیان ڕازی بێت بە هەمان شێوەیان دەکرد.

و نەوەوی دەڵێت: کورتکردنەوەی نوێژ دروستە لە نوێژەکانی نیوەڕۆ و عەسر و عیشا، و دروست نییە لە نوێژی بەیانی و مەغریب، هەروەها لە شوێنی نیشتەجێ بوون، ئەوە هەموو ئیجماعی لەسەرە[1]؛ و ئیبن مونزر دەڵێت: زانایان کۆڕان ئەگەر کەسێك سەفەر بکات کە لە هاوشێوەی ئەو سەفەرەدا نوێژ کورت بکرێتەوە، و سەفەرەکەی سەفەری حەج یان عومەرە یان جهاد بێت، نوێژەکانی نیوەڕۆ و عەسر و عیشا کورت دەکاتەوە و دوو ڕکات نوێژ دەکات، و کۆڕان کە نوێژی مەغریب و نوێژی بەیانی کورت ناکرێتەوە[2].

(**يَجِبُ القَصرُ**) نوسەر بۆچوونی وایە کورتکردنەوەی نوێژەکان لە سەفەردا واجبە و ئەوە بۆچوونی ئەلبانییە لە زانایانی سەردەم، بەڵام زۆربەی زانایان بە سوننەتیان داناوە، بوخاری لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((فَرَضَ اللهُ الصَّلاَةَ حِينَ فَرَضَهَا، رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، فِي الْحَضَرِ وَالسَّفَرِ، فَأُقِرَّتْ صَلاَةُ السَّفَرِ، وَزِيدَ فِي صَلاَةِ الْحَضَرِ)).

واتە: خوای پەروەردگار کاتێك نوێژی سەرەتا فەرزکرد، دوو ڕکات دوو ڕکات فەرزی کرد، لە کاتی جێنیشتنی و لە سەفەریشدا، نوێژی سەفەر وەکو خۆی مایەوە، و لە جێنشنیدا زیادکرا.

---

(١). (المجموع)(٤/٣٢٢).

(٢). (الأوسط في السنن والإجماع والاختلاف)(٤/٣٣١).

و تەحاوی لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((أَوَّلُ مَا فُرِضَتِ الصَّلاَةُ رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، فَلَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ الْمَدِينَةَ، صَلَّى إِلَى كُلِّ صَلاَةٍ مِثْلَهَا غَيْرَ الْمَغْرِبِ فَإِنَّهَا وِتْرُ النَّهَارِ، وَصَلاَةُ الصُّبْحِ لِطُولِ قِرَاءَتِهَا، وَكَانَ إِذَا سَافَرَ عَادَ إِلَى صَلاَتِهِ الْأُولَى)).

واتە: یەکەمجار کە نوێژ فەرزبوو دوو ڕکات بوو، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە هەموو نوێژەکانی کردە چوار ڕکات، جگە لە نوێژی مەغریب چونکە وتری ڕۆژە و نوێژی بەیانی لەبەر درێژی قورئان خوێندنەکەی، ئەگەر سەفەری بکردایە وەك سەرەتا نوێژی دەکرد.

و تەبەری لە سیماکی کوڕی وەلیدەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەحمەد شاکر بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((سَأَلْتُ ابْنَ عُمَرَ عَنْ صَلاَةِ السَّفَرِ، فَقَالَ: رَكْعَتَانِ تَمَامٌ غَيْرُ قَصْرٍ، إِنَّمَا الْقَصْرُ صَلاَةُ الْمَخَافَةِ، فَقُلْتُ: وَمَا صَلاَةُ الْمَخَافَةِ؟ قَالَ: يُصَلِّي الإِمَامُ بِطَائِفَةٍ رَكْعَةً، ثُمَّ يَجِيءُ هَؤُلَاءِ إِلَى مَكَانِ هَؤُلَاءِ، وَيَجِيءُ هَؤُلَاءِ إِلَى مَكَانِ هَؤُلَاءِ، فَيُصَلِّي بِهِمْ رَكْعَةً، فَتَكُونُ لِلْإِمَامِ رَكْعَتَيْنِ، وَلِكُلِّ طَائِفَةٍ رَكْعَةً رَكْعَةً)).

واتە: پرسیارم کرد لە ئیبن عومەر دەربارەی نوێژی سەفەر؟ گوتی: دوو ڕکاتی تەواوە و کورت نەکراوەتەوە، بێگومان کورتکردنەوە بۆ نوێژی ترسە، گوتم: نوێژی ترس چییە؟ گوتی: پێش نوێژ ڕکاتێك نوێژ لەگەڵ کۆمەڵێك دەکات، پاشان ئەمان دەچن شوێنی کۆمەڵێکی تر دەگرنەوە، ئەوانیش دێن پێش نوێژەکە ڕکاتێکی تر نوێژ لەگەڵ ئەمانیش دەکات، بەوەش پێش نوێژەکە دوو ڕکات نوێژ دەکات و ئەو دوو کۆمەڵەش هەریەکەیان یەك ڕکات نوێژ دەکەن.

و ئەحمەد و نەسائی و ئیبن ماجە لە عومەرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((صَلاَةُ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَانِ، وَصَلاَةُ الْفِطْرِ رَكْعَتَانِ، وَصَلاَةُ الْأَضْحَى رَكْعَتَانِ، وَصَلاَةُ السَّفَرِ رَكْعَتَانِ تَمَامٌ غَيْرُ قَصْرٍ عَلَى لِسَانِ مُحَمَّدٍ ﷺ)).

واتە: نوێژی سەفەر و هەینی و جەژن دوو ڕکاتن و تەواون و کورت نەکراونەتەوە لەسەر زاری محمدەوە ﷺ.

ئەمانە ئەو بەڵگانە کە هەندێك لە زانایان کردوویانەتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کورتکردنەوەی نوێژ لە سەفەردا واجبە، ئەلبانی دەڵێت: ئەو فەرموودانە بەڵگەن کە سەفەر لە بنەڕەتدا دوو ڕکاتە و کورت نەکراوەتەوە لە نوێژە چوار ڕکاتییەکان وەك هەندێك وا دەڵێن، وەکو نوێژی جەژنەکانە، ئەمەش ئیبن حەجەر پەسەندی کردووە لە (فتح الباري) دوای ئەوەی باسی ناکۆکی زانایان دەکات دەربارەی حوکمی کورتکردنەوەی نوێژ لە سەفەردا، و باسی بەڵگەی هەموویان دەکات دەڵێت: ئەوەی بۆم دەردەکەوێت و هەموو بەڵگەکان کۆ دەکاتەوە نوێژەکان لە شەوڕەویەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ (ليلة الإسراء) دوو ڕکات دوو ڕکات فەرزکران جگە لە نوێژی مەغریب، پاشان دوای کۆچ نوێژەکانی تر زیاد کران جگە لە نوێژی بەیانی[1].

بەڵام وەك ئاماژەمان بۆ کرد زۆربەی زانایان کورتکردنەوەی نوێژە چوار ڕکاتییەکان لە سەفەردا بە سوننەت دەزانن، و دەڵێن: لە ئایەتەکەدا کە خوای

(١). (الصحيحة)(٧٤٨/٦).

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿لَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَقۡصُرُواْ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ﴾، دەڵێن: نەفی ئەوەی گوناهتان لەسەر نییە بەڵگەی واجبوون نییە.

و ئەوەی عومەر دەڵێت: ((صَدَقَةٌ تَصدَّقَ اللهُ بِهَا عَلَيْكُمْ، فَاقْبَلُوا صَدَقَتَهُ)).

واتە: فەزڵ و بەخشینی خوایە پێی بەخشیون، بەخشینەکەی وەربگرن؛ ئەمەش بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوە نییە.

و ئەوەی جێگیربووە لە هەندێك هاوەڵانەوە لە سەفەردا نوێژیان کورت نەکورتووەتەوە، مسلم لە زوهرییەوە لە عوروەوە لە عائیشەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((أَنَّ الصَّلَاةَ أَوَّلَ مَا فُرِضَتْ رَكْعَتَيْنِ فَأُقِرَّتْ صَلَاةُ السَّفَرِ وَأُتِمَّتْ صَلَاةُ الْحَضَرِ؛ قَالَ الزُّهْرِيُّ: فَقُلْتُ لِعُرْوَةَ: مَا بَالُ عَائِشَةَ تُتِمُّ فِي السَّفَرِ؟ قَالَ: إِنَّهَا تَأَوَّلَتْ كَمَا تَأَوَّلَ عُثْمَانُ)).

واتە: بێگومان سەرەتا کە نوێژ فەرزکرا دوو ڕکات بوو، لە سەفەردا وەکو خۆی مایەوە و لە شوێنی نیشتەجێ بوندا زیاد کرا؛ زوهری دەڵێت: بە عوروەم گوت: ئەی بۆچی عائیشە نوێژەکانی لە سەفەردا کورت ناکاتەوە؟ گوتی: تأویلی کرد وەك چۆن عوسمان تأویلی کرد.

زانایان زۆر بۆچوونیان باسکردووە کە بۆ بۆچی عائیشەی دایکی باوەڕداران و پێشەوا عوسمان لە سەفەردا نوێژیان کورت نەکردووەتەوە، ئەرجەحترینیان ئەو بۆچوونەیە کە دەڵێت: لەبەر ئەوەبووە بە ڕوخسەتیان زانیوە، و کورتکردنەوەی نوێژیان لە سەفەردا بە واجب نەزانیوە[1].

---

(١). بڕوانە: (البحر المحيط الثجاج)(٤٩/١٥).

و موسافر ئەگەر لە پشتی کەسێکەوە نوێژ بکات کە لە سەفەردا نەبێت دەبێت نوێژەکەی وەك ئیمامەکەی بکات، و بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیە ئەبوداود لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەن و صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى وَضَعَ شَطْرَ الصَّلَاةِ، أَوْ نِصْفَ الصَّلَاةِ وَالصَّوْمَ عَنِ الْمُسَافِرِ، وَعَنِ الْمُرْضِعِ، أَوِ الْحُبْلَى)).

واتە: بێگومان خوای باڵادەست نیوەی نوێژ و ڕۆژووی لەسەر موسافر و ئافرەتی شیردەر و دووگیان لاداوە.

ئەم فەرموودە بەڵگەیە ڕۆژوو لەسەر موسافر واجب نییە، بەڵام ئەگەر ڕۆژ بگرێت دروستە، ئەمەش بەڵگەیە نوێژکردن بە کورت نەکراوەی لە سەفەردا دروستە وەك چۆن ڕۆژووگرتن لە سەفەردا دروستە.

و ئیبن ئەبوشەیبە لە (المصنف) لە ڕەبیعی کوری نەزڵەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: (خَرَجْنَا فِي سَفَرٍ وَنَحْنُ اثْنَا عَشَرَ، أَوْ ثَلَاثَةَ عَشَرَ رَاكِبًا، كُلُّهُمْ قَدْ صَحِبَ النَّبِيَّ ﷺ وَغَزَا مَعَهُ، قَالَ: فَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ، فَتَدَافَعَ الْقَوْمُ، فَتَقَدَّمَ شَابٌّ مِنْهُمْ فَصَلَّى بِهِمْ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ، فَلَمَّا صَلَّى قَالَ سَلْمَانُ: مَا لَنَا وَلِلْمَرْبُوعَةِ؟ يَكْفِينَا نِصْفُ الْمَرْبُوعَةِ، نَحْنُ إِلَى التَّخْفِيفِ أَفْقَرُ، فَقَالُوا: تَقَدَّمْ أَنْتَ يَا أَبَا عَبْدِ اللهِ فَصَلِّ بِنَا، فَقَالَ: أَنْتُمْ بَنُو إِسْمَاعِيلَ الْأَئِمَّةُ، وَنَحْنُ الْوُزَرَاءُ).

واتە: دەرچووین بۆ سەفەرێك دوازدە یان سیازدە سواری بووین، هەموویان هاوەڵی پێغەمبەری خوایان ﷺ و غەزایان لەگەڵدا کردبوو، دەڵێت: کاتی نوێژ هات، بوو بە پاڵپاڵێن، گەنجێکیان پێشکەوت نوێژی بە چوار ڕکات پێکردن،

کاتێك نوێژەکەی تەواو کرد سەلمان گوتی: ئەوە چییە چوار ڕکات نوێژمان بۆ دەکەن؟ نیوەی چوارمان بەسە، ئێمە پێویستمان بە سوککردنە، گوتیان: پێشکەوە ئەی ئەبوعبداللە نوێژمان بۆ بکە، گوتی: ئێوە نەوەکانی ئیسماعیل ئیمامن، و ئێمە وەزیرن.

ئەم ئەسەرە بەڵگەیە کورتکردنەوەی نوێژ لە سەفەردا سوننەتە، چونکە سەلمان فەرمانی پێنەکردن نوێژەکە دووبارە بکەنەوە، و باسی ئەوەی بۆ نەکردن کورتکردنەوەی نوێژ لە سەفەردا واجبە بەڵکو گوتی: (نَحْنُ إِلَى التَّخْفِيفِ أَفْقَرُ)، وەك زانراوە لە ڕیساکاندا هاتووە: (تأخير البيان عن وقت الحاجة لا يجوز)[1].

(**وَإِنْ كَانَ دُونَ بَرِيدٍ**) کۆمەڵێك بەڵگە هاتووە باسی ئەو دوورییە دەکەن کە نوێژی تێدا کورت دەکرێتەوە، و زانایان ناکۆکن و ئیبن مونزر دەڵێت: نزیکەی بیست بۆچوونیان هەیە لەوبارەیەوە، و ناکۆکن کام دەرچوون پێی دەگوترێت سەفەر؟ ئیبن قەیم دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دووری سەفەری بۆ ئوممەتەکەی دیاری نەکردووە بۆ کورتکردنەوەی نوێژ و ڕۆژوو نەگرتن، بەڵکو بە ڕەهایی باسی کردووە بۆیان بۆ ئەوەی هەموو سەفەرکردن و دەرچوون و گەڕانێك بەسەر بەزەویدا بگرێتەوە، وەك چۆن بە ڕەهایی باسی تەیەمومی بۆ کردوون لە هەموو سەفەرێکدا، ئەوەی دەیگێڕنەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە ڕۆژە ڕێیەك یان دوو یان سێی دیاریکردووە، هیچی صەحیح نییە[2]؛ و ئیبن تەیمییە دەڵێت: هەموو

---

(١). بڕوانە: (التعليقات على الدرر البهية)(٢١٥).

(٢). (زاد المعاد)(٦١٣/١).

ناوێك پێناسە نەكرابێت و سنوری بۆ دیاری نەكرابێت نەلە زماندا و نەلە شەرعدا، دەبێت بگەڕێتەوە بۆ دابونەریتی خەڵك، هەر دەرچوونێك لە دابونەریتی خەڵكدا سەفەر بوو، ئەوە ئەو سەفەرەیە كە شەرع حوكمەكانی پێوە وابەستەكردووە، وەك سەفەری دانیشتووانی مەككە بۆ عەرەفە ئەمە دووری (برید)ێكە كە (دەكاتە نزیكەی بیست كیلۆ مەتر)، ئەم سەفەرە لە سوننەتدا هاتووە دروستە نوێژی تێدا كورت و كۆ بكرێتەوە، كە نیو ڕۆژ ڕێگایە بە ڕۆیشتنی حوشتر و بە پیادە، ئەوە كەمترین دوورییە كە لە زمانی شەرعدا پێی دەگوترێت سەفەر، بەڵام كەمتر لە بەریدێك وەك میل نەهاتووە، لە هەردوو صەحیحەكەدا هاتووە كە پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو شەممەیەك دەچوو بۆ قوبا بە سواری و بە پیادە، گومانی تێدا نییە كە خەڵكی قوبا و عەوالی و دەوروبەری مەدینە دەهاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، نەپێغەمبەری خوا ﷺ و نەئەوانیش نوێژیان كورت نەدەكردەوە، و دەهاتن بۆ نوێژی هەینی لە دووری میل و فەرسەخێكەوە كە (دەكاتە نزیكەی پێنج كیلۆمەتر) نوێژیان كورت نەدەكردەوە [1]؛ ئەوە بۆچوونی ئەلبانی و ئیبن عوسەیمینە، كە دیاریكردنی دووری بۆ سەفەر لە شەرعدا نەهاتووە، و ئەوەی سەفەر دیاری دەكات دابونەریتی خەڵكە، و محمد ئەسیوبی دەڵێت: هیچ دەقێكی یەكلاكەرەوە نییە دووری سەفەر دیاری بكات، گوتەی هاوەڵان و دوای ئەوانیش جیاوازە لەسەر ئەم پرسە، و پێویستە بگەڕێنەوە بۆ مانای سەفەر لە شەرعدا، دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ سێ ڕۆژ و

---

(١). (مجموع الفتاوى)(٢٤/٤١).

دوو ڕۆژ و یەك ڕۆژی ناو لێناوە سەفەر، هەروەها بەریدێکیشی ناو لێناوە سەفەر، و کەمترین دووری کە بە صەحیحی هاتووە لە سەفەردا بەریدێکە[1].

مسلم لە یەحیای کوڕی یەزیدی هونائییەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((سَأَلْتُ أَنَس بْنَ مَالِك، عَنْ قَصْرِ الصَّلَاة، فَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا خَرَجَ مَسِيرَةَ ثَلَاثَةِ أَمْيَالٍ، أَوْ ثَلَاثَةِ فَرَاسِخَ -شُعْبَةُ الشَّاكُّ- صَلَّى رَكْعَتَيْنِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر دووری سێ میل یان سێ فەرسخ بڕۆیشتایەتە دەرەوە، دوو ڕکات نوێژی دەکرد.

ئەسیوبی دەڵێت: لەم دەقەوە دەزانین کە سێ فەرسەخ کەمترین دوورییە کە لە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕیوایەتکراوە نوێژی تێدا کورتکردووەتەوە، و ئیعتبارمان بە سێ میلەکە نەکرد لەگەڵ ئەوەی لە سێ فەرسەخەکە کەمترە، چونکە گومانێ تێکەوتووە، و سێ فەرسەخەکەمان پشت پێ بەستووە لەبەر دڵنیایی، بەوەش ڕوون دەبێتە کەمترین دووری کە صەحیحە دیاری بکرێت بۆ کورتکردنەوەی نوێژ سێ فەرسەخە[2]؛ و بەریدێك چوار فەرسەخە، و فەرسەخێك سێ میلە، و میلێك زیاترە لە هەزار و شەش سەد مەتر.

و بوخاری لە صەحیحەکەیدا دەڵێت: (بَابٌ فِي كَمْ يَقْصُرُ الصَّلَاةَ): ((وَسَمَّى النَّبِيُّ ﷺ يَوْمًا وَلَيْلَةً سَفَرًا، وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ وَابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ، عَنْهُم يَقْصُرَانِ وَيُفْطِرَانِ فِي أَرْبَعَةِ بُرُدٍ وَهِيَ سِتَّةَ عَشَرَ فَرْسَخًا)).

---

(١). (ذخيرة العقبى)(٣٤١/١٦).

(٢). (البحر المحيط الثجاج)(٣٠/١٥).

واتە: بابەتی لە چی دوورییەكدا نوێژ كورت دەكرێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دووری شەو و ڕۆژێكی ناولێناوە سەفەر، و ئیبن عومەر و ئیبن عەباس نوێژیان كورت دەكردەوە و ڕۆژوویان دەشكان لە دووری چوار بەریدەوە كە دەكاتە شازدە فەرسەخ.

هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەو سەفەرە ی نوێژی تێدا كورت دەكرێتەوە هەموو سەفەرێك دەگرێتەوە، بەڵام زۆربەی زانایان دەڵێن: سەفەرێك نوێژی تێدا كورت دەكرێتەوە كە سەفەری گوێڕایەڵی خوا بێت: وەك دەرچوون بۆ جیهاد و حەج و عومرە، یان سەفەرێكی حەڵاڵ بێت، وەك سەفەركردن بۆ بازرگانی، بەڵام ئەگەر كەسێك سەفەر بكات بە مەبەستی ئەنجامدانی تاوانێك بۆی نییە نوێژەكانی كورت بكاتەوە، وەك ئەو كەسەی سەفەر دەكات بۆ ڕێگا بڕین لە خەڵك.

(**وَإِذَا أَقَامَ بِبَلَدٍ مُتَرَدِّدًا، قَصَرَ إِلَى عِشرِينَ يَومًا، ثُمَّ يُتِمُّ، وَإِذَا عَزَمَ عَلَى إِقَامَةِ أَربَعٍ أَتَمَّ بَعدَهَا**) ئەم پرسەش دیسان زانایان ناكۆكن لەبارەیەوە، چەند بەڵگەیەك هاتووە كە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە ماوەتەوە نوێژی كورتكردووەتەوە، بوخاری و مسلم لە یەحیای كوڕی ئەبوئیسحاقەوە ڕیوایەتیان كردووە گوێم لێ بوو ئەنەس دەیگوت: ((خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ حَتَّى رَجَعَ، قُلْتُ :كَمْ أَقَامَ بِمَكَّةَ؟ قَالَ: عَشْرًا)).

واتە: لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ لە مەدینەوە دەرچووین بۆ مەككە، دوو ڕكات دوو ڕكات نوێژی كرد هەتاكو گەڕایەوە، گوتم: چەند ڕۆژ لە مەككە مایەوە؟ گوتی: دە ڕۆژ مایەوە.

و ئەحمەد و ئەبوداود لە جابرەوە ڕیوایەتیان كردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((أَقَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِتَبُوكَ عِشْرِينَ يَوْمًا يَقْصُرُ الصَّلَاةَ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بیست ڕۆژ لە تەبوك مایەوە نوێژی کورت دەکردەوە.

بەڵام بوخاری لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((أَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ تِسْعَةَ عَشَرَ يَقْصُرُ، فَنَحْنُ إِذَا سَافَرْنَا تِسْعَةَ عَشَرَ قَصَرْنَا، وَإِنْ زِدْنَا أَتْمَمْنَا)).

واتە: پێغەمبەر خوا ﷺ نۆزدە ڕۆژ مایەوە نوێژ کورت دەکردەوە، ئێمە ئەگەر سەفەرمان بکردایە نۆزدە ڕۆژ بمابنایەتەوە نوێژمان کورت دەکردەوە، ئەگەر لەوە زیاتر بمابنایەتەوە نوێژمان کورت نەدەکردەوە.

ترمزی دەڵێت: ڕیوایەتکراوە لە عەلییەوە دەڵێت: هەرکەسێك دە ڕۆژ لە سەفەردا بمێنێتەوە نوێژ کورت ناکاتەوە؛ و لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێت: هەرکەسێك پازدە ڕۆژ لە سەفەردا بمێنێتەوە نوێژ کورت ناکاتەوە؛ و لێیەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێت: دوازدە ڕۆژ؛ و لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێت: ئەگەر چوار ڕۆژ بمێنێتەوە نوێژەکانی بە چوار ڕکات دەکات؛ قەتادە و عەتای خۆراسانی ئەوەیان لێوە ڕیوایەتکردووە، و داودی کوڕی ئەبوهند پێچەوانەی ئەوەی لێوە ڕیوایەتکردووە، دوای ئەوە زانایان لەوبارەیەوە ناکۆکن، سوفیانی سەوری و ئەهلی کوفە پازدە ڕۆژیان دیاریکردووە و دەڵێن: ئەگەر دڵنیابوو پازدە ڕۆژ دەمێنێتەوە نوێژ کورت ناکاتەوە، و ئەوزاعی دەڵێت: ئەگەر دڵنیابوو دوازدە ڕۆژ دمێنێتەوە نوێژ کورت ناکاتەوە، و مالك و شافعی و ئەحمەد دەڵێن: ئەگەر دڵنیابوو چوار ڕۆژ دەمێنێتەوە نوێژ کورت ناکاتەوە؛ بەڵام ئیسحاق بۆچوونی وایە بەهێزترین مەزهەب ئەو مەزهەیە کە فەرموودەکەی ئیبن عەباس بەڵگەیە لەسەری، دەڵێت: لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ڕیوایەتی کردووە، پاشان دوای پێغەمبەری خوا ﷺ لێکدانەوەی بۆ کردووە و دەڵێت: ئەگەر دڵنیابوو لەوەی نۆزدە ڕۆژ دەمێنێتەوە نوێژ کورت ناکاتەوە؛ پاشان زانایان کۆران

کە موسافیر نوێژ کورت دەکاتەوە ئەگەر دڵنیا نەبوو لە مانەوەی ئەگەر چەند ساڵێکیش بەسەردا بێت[١].

(**وَلَهُ الجَمعُ تَقدِيمًا وَتَأخِيرًا**) کۆکردنەوەی نوێژەکان بە پێش خستن یان بە دواخستن پەیوەندی بە سەفەروە نییە، بەڵکو پەیوەندی بە نارەحەتییەوە هەیە کە بۆ موسڵمانان دروست ببێت، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە نوێژی کۆ کردووەتەوە لەبەر ئەو مەبەستەی باسکرا، مسلم لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((صَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا بِالْمَدِينَةِ فِي غَيْرِ خَوْفٍ وَلَا سَفَرٍ؛ قَالَ أَبُو الزُّبَيْرِ: فَسَأَلْتُ سَعِيدًا لِمَ فَعَلَ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ كَمَا سَأَلْتَنِي، فَقَالَ: أَرَادَ أَنْ لَا يُحْرِجَ أَحَدًا مِنْ أُمَّتِهِ)).

واتە: پێغەمبەر خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ و عەسری پێکەوە کۆکردەوە لە مەدینە، ترس نەبوو و لە سەفەریشدا نەبوو؛ ئەبوزوبیر دەڵێت: پرسیار لە سەعید کرد بۆچی وای کرد؟ گوتی: پرسیارم لە ئیبن عەباس کرد وەك تۆ پرسیارت کرد، گوتی: ویستی ئوممەتەکەی نارەحەت نەبێت.

و بوخاری لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَجْمَعُ بَيْنَ هَاتَيْنِ الصَّلَاتَيْنِ فِي السَّفَرِ، يَعْنِي: الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ئەم دوو نوێژەی لە سەفەردا کۆ دەکردەوە، واتە: نوێژی مەغریب و عیشا.

و مسلم لە موعازەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، فَكَانَ يُصَلِّي الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا، وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ جَمِيعًا)).

---

(١). (سنن الترمذي)(٢/٤٣١).

واتە: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین بۆ غەزای تەبوك نوێژی نیوەڕۆ و عەسر پێکەوە کۆ دەکردەوە، و نوێژی مەغریب و عیشای پێکەوە کۆ دەکردەوە.

و بوخاری و مسلم لە ئەنەسەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا ارْتَحَلَ قَبْلَ أَنْ تَزِيغَ الشَّمْسُ، أَخَّرَ الظُّهْرَ إِلَى وَقْتِ الْعَصْرِ، ثُمَّ يَجْمَعُ بَيْنَهُمَا، وَإِذَا زَاغَتْ، صَلَّى الظُّهْرَ ثُمَّ رَكِبَ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ئەگەر پێش کاتی نیوەرۆ و لادانی خوار لە ناوەڕاستی ئاسمان سەفەری بکردایە نوێژی نیوەرۆی دوادەخست بۆ کاتی نوێژی عەسر، پاشان پێکەوە کۆی دەکردنەوە، و ئەگەر دوای هاتنی کاتی نیوەڕۆ و لادانی خۆر لە ناوەڕاستی سەفەری بکردایە نوێژی نیوەرۆی دەکرد پاشان سوار دەبوو.

(**بِأَذَانٍ وَإِقَامَتَيْنِ**) ئەبوداود لە جەعفەر کوڕی محمدەوە لە باوکییەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە: ((أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ بِأَذَانٍ وَاحِدٍ بِعَرَفَةَ، وَلَمْ يُسَبِّحْ بَيْنَهُمَا وَإِقَامَتَيْنِ، وَصَلَّى الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ بِجَمْعٍ بِأَذَانٍ وَاحِدٍ، وَإِقَامَتَيْنِ وَلَمْ يُسَبِّحْ بَيْنَهُمَا)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ و عەسری کرد بە بانگێك و دوو قامەت لە عەرەفە، و نوێژی سوننەتی لە نێوانیاندا نەکرد، و نوێژی مەغریب و عیشای کرد لە موزدەلیفە بە بانگێك و دوو قامەت و نوێژی سوننەتی لە نێوانیاندا نەکرد.

## بَابُ صَلاةِ الكُسُوفَينِ

**وَهِيَ سُنَّةٌ، وَأَصَحُّ مَا وَرَدَ فِي صِفَتِهَا رَكعَتَانِ، فِي كُلِّ رَكعَةٍ رُكُوعَانِ، وَوَرَدَ ثَلَاثَةٌ، وَأَربَعَةٌ، وَخَمسَةٌ، يَقرَأُ بَينَ كُلِّ رُكُوعَينِ مَا تَيَسَّرَ، وَوَرَدَ فِي كُلِّ رَكعَةٍ رُكُوعٌ، وَنُدِبَ: الدُّعَاءُ، وَالتَّكبِيرُ، وَالتَّصَدُّقُ، والاستِغفَارُ.**

## بابەتی نوێژی خۆرگیران و مانگگیران

**ئەو نوێژە سوننەتە، صەحیحترین ڕیوایەت دەبارەی چۆنییەتییەکەی دوو ڕکاتە، و لە هەر ڕکاتێکدا دوو ڕکوعی تێدایە، و سێ ڕکوع، و چوار ڕکوع، و پێنج ڕکوعیش هاتووە، لە نێوان هەموو دوو ڕکوعێکدا ئەوەندەی دەتوانێت قورئان دەخوێنێت، هەروەها لە هەموو ڕکاتێکدا یەك ڕکوعیش هاتووە، و سوننەتە: دوعا و الله أكبر و بەخشین و داوای لێخۆشبوون بکرێت.**

(**وَهَي سُنَّةٌ**) نوێژی خۆرگیران و مانگگیران (الخسوف والكسوف) جمهوری زانایان بە سوننەتی دەزانن، و هەندێك لە زانایان لەوانە ئەبوعەوانە و ئەلبانی و ئیبن عوسەیمین بە واجبی دەزانن، و نوسەر لە (السيل الجرار) دەڵێت: بزانە لە نوێژ خۆرگیران کردار و گوفتار پێکەوە کۆبوونەتەوە، لەو بەڵگانە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللهِ، وَإِنَّهُمَا لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ، وَلَا لِحَيَاتِهِ فَإِذَا رَأَيْتُمُوهَا كَذَلِكَ فَافْزَعُوا إِلَى الْمَسَاجِدِ))؛ وَفي رِوَايَةٍ: ((فَصَلُّوا وَادْعُوَا))؛ ئەوەی دیارە واجبە، ئەوەی ئەوەی دەگوترێت: ئیجماع هەیە واجب نییە، ئەگەر صەحیح بێت دەبێت هۆکار ئەوەی فەرمانەکە بکاتە سوننەتە ئەگەرنا واجبە[1]؛ ئەلبانی دەڵێت: ئەوەی بانگەشەی ئیجماع دەکرێت، ئەو ئیجماعە دانەمەزراوە، چونکە ئەبوعەوانە لە صەحیحەدا (٣٩٨/٢)دا دەڵێت: (بيان وجوب صلاة الكسوف)[2].

---

(١). (السيل الجرار)(١٩٧).

(٢). (تمام المنة)(٢٦١).

(**وَأَصَحُّ مَا وَرَدَ فِي صِفَتِهَا رَكعَتَانِ، فِي كُلِّ رَكعَةٍ رُكُوعَانِ**) لە ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها یەکجار ڕوویداوە و هاوکات بووە لەگەڵ ئەو ڕۆژەی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کردووە، بوخاری لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((كَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ يَوْمَ مَاتَ إِبْرَاهِيمُ، فَقَالَ النَّاسُ: كَسَفَتِ الشَّمْسُ لِمَوْتِ إِبْرَاهِيمَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ فَصَلُّوا وَادْعُوا اللَّهَ)).

واتە: خۆر لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ گیرا لەو ڕۆژەی ئیبراهیم مرد، خەڵك گوتیان: خۆرئاوا بوو بۆ مردنی ئیبراهیم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دڵنیابن خۆر و مانگ بۆ مردن و ژیانی کەس ناگیرێن، ئەگەر ئەوەتان بینی نوێژ بکەن و لە خوا بپاڕێنەوە.

و بوخاری و مسلم لە عائیشەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((خَسَفَتِ الشَّمْسُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَصَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ بِالنَّاسِ، فَقَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ قَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ فَعَلَ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ مِثْلَ مَا فَعَلَ فِي الْأُولَى، ثُمَّ انْصَرَفَ، وَقَدِ انْجَلَتِ الشَّمْسُ، فَخَطَبَ النَّاسَ، فَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللهِ، لَا يَنْخَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَادْعُوا اللهَ وَكَبِّرُوا، وَصَلُّوا وَتَصَدَّقُوا)).

واتە: لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆرگیرا، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بە خەڵك کرد، وەستا وەستانێکی درێژ، پاشان ڕکوعی برد ڕکوعێکی درێژ، پاشان وەستا وەستانێکی درێژ، لە وەستانی یەکەم کورتتر بوو، پاشان ڕکوعی برد و زۆر لە ڕکوعەکەدا مایەوە، و لە ڕکوعی یەکەم کورتتر بوو، پاشان سوژدەی برد سوژدەیەکی درێژ، پاشان بە هەمان شێوەی ڕکاتی یەکەمی کرد لە ڕکاتی دووەم، پاشان نوێژەکەی تەواو کرد، و خۆرگیرانەکە تەواو بوو، گوتاری بۆ خەڵك خوێندەوە، سوپاس و ستایشی خوای کرد، پاشان فەرمووی: دڵنیابن خۆر و مانگ دوو ئایەتن لە ئایەتەکانی خوا، ناگیرێن بۆ مردن و ژیانی کەس، ئەگەر ئەو حاڵەتان بینی لە خوا بپارێنەوە و الله أکبر بکەن، و نوێژ بکەن و ببەخشن.

(**وَوَرَدَ ثَلَاثَةٌ، وَأَربَعَةٌ، وَخَمسَةٌ، يَقرَأُ بَينَ كُلِّ رُكُوعَينِ مَا تَيَسَّرَ، وَوَرَدَ فِي كُلِّ رَكعَةٍ رُكُوعٌ**) لە پێشدا ئاماژەمان بەوەکرد تەنها یەك جار لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خۆر گیراوە، ئەویش هاوکاتی ئەو ڕۆژە بووە کە ئیبراهمی کوڕی مردووە، بۆیە تەنها یەك جار نوێژی خۆرگیرانی کردووە، و ئەو ڕیوایەتانەی کە باس لە یەك ڕکوع و یان زیان لە دوو ڕکوع دەکەن هەڵەیە، ئەوە بۆچوونی ئیبن تەیمییە و ئیبن قەیمە[١]، و ئەلبانیش ئەوەی تەرجیح کردووە[٢].

---

(١). بڕوانە: (زاد المعاد)(٤٣٩/١).

(٢). بڕوانە: (إرواء الغليل)(١٢٧/٣).

(**وَنُدِبَ: الدُّعَاءُ، وَالتَّكبِيرُ، وَالتَّصَدُّقُ، والاستِغفَارُ**) بوخاری و مسلم لە عائیشەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەر خوا ﷺ دەفەرموێت: ((فإذا رَأَيْتُمْ ذلكَ، فادْعُوا اللّهَ، وكَبِّرُوا وصَلُّوا وتَصَدَّقُوا)).

واتە: ئەگەر بینیتان خۆر یان مانگگیرا، لە خوا بپاڕێنەوە، و الله أكبر بکەن و نوێژ بکەن و لە سامانتان ببەخشن.

و بوخاری و مسلم لە ئەبوموسای ئەشعەرییەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((فإذا رَأَيْتُمْ شيئًا مِن ذلكَ، فافْزَعُوا إلى ذِكْرِهِ ودُعائِهِ واسْتِغْفارِهِ)).

واتە: ئەگەر بینیتان خۆر یان مانگگیرا، لە خوا بپاڕێنەوە، و بترسن و پەنا بە خوا بگرن بە زیکر و پاڕانەوە و داوای لێخۆشبوون.

چەند پرسێك: یەکەم: کاتێك خۆرگیران یان مانگگیران ڕوو بدات سوننەتە بانگی خەڵك بکرێت بۆ نوێژ بە گوتنی (الصلاة جامعة)، مسلم لە عائیشەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((أَنَّ الشَّمْسَ خَسَفَتْ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَبَعَثَ مُنَادِيًا، الصَّلَاةُ جَامِعَةٌ فَاجْتَمَعُوا، وَتَقَدَّمَ فَكَبَّرَ، وَصَلَّى أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ، فِي رَكْعَتَيْنِ، وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ)).

واتە: خۆرگیرا لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ، کەسێکی نارد جاڕیدا: (الصَّلَاةُ جَامِعَةٌ) خەڵك کۆبوونەوە، پێشکەوت و الله أكبری کرد، چوار ڕکوعی چوار سوژدەی برد برد لە دوو ڕکاتدا.

دووەم: هەموو کاتێك ئەو نوێژە ئەنجام دەکرێت، لەبەر ئەوەی نوێژێکە هۆکاری هەیە، و پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((فإذاَ رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَادْعُوا اللَّه، وَكَبِّرُوا، وَصَلُّوا، وتَصَدَّقُوا...)).

سێیەم: لە نوێژی خۆرگیران و مانگگیران لە کاتی خوێندنی قورئان دەنگ بەرز دەکرێتەوە، بوخاری لە عائیشەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((جَهَرَ النَّبِيُّ ﷺ فِي صَلَاةِ الْخُسُوفِ بِقِرَاءَتِهِ، فَإِذَا فَرَغَ مِنْ قِرَاءَتِهِ كَبَّرَ فَرَكَعَ، وَإِذَا رَفَعَ مِنَ الرَّكْعَةِ قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، ثُمَّ يُعَاوِدُ الْقِرَاءَةَ فِي صَلَاةِ الْكُسُوفِ، أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ فِي رَكْعَتَيْنِ، وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە خوێندی قورئاندا لە نوێژی خۆرگیران دەنگی بەرزکردەوە، ئەگەر قورئان خوێندنەکەی کۆتایی پێ بهێنایە الله أکبری دەکرد و دەچووە ڕکوع، و ئەگەر لە ڕکوع سەری بەرز بکردایەتەوە دەیفەرموو: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ)، پاشان دووبارە لە نوێژدا دەستی دەکردەوە بە قورئان خوێندن، چوار ڕکوع و چوار سوژدەی دەبرد لە دوو ڕکاتدا.

چوارەم: ئایا لە ڕکوعی دووەمدا فاتحە دەخوێنێتەوە، نەوەوی دەڵێت: زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی سورەتی فاتحە دەخوێنێت لە وەستانی یەکەمدا لە هەموو ڕکاتێکدا، و ناکۆکن لە وەستانی دووەم، مەزهەبی ئێمە و مەزهەبی مالك و جمهوری هاوەڵەکانی ئەوەیە نوێژ دورست نابێت بە خوێندنی نەبێت[1]؛ و ئیبن باز

(١). (المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج)(١٩٩/٦).

بۆچوونی وایە لە وەستانی دووەمدا سورەتی فاتحە دەخوێندرێت پاشان سورەتێکی تر دەخوێندرێت[1].

پێنجەم: نوێژی خۆرگیران و مانگگیران بە جەماعەت دەکرێت، بوخاری لە صەحیحەکەیدا بابەتێکی هێناوە: (باب صَلاَةِ الْكُسُوفِ جَمَاعَةً)، بوخاری لە عائیشەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((خَسَفَتِ الشَّمْسُ فِي حَيَاةِ النَّبِيِّ ﷺ، فَخَرَجَ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَصَفَّ النَّاسُ وَرَاءَهُ، فَكَبَّرَ)).

واتە: خۆرگیران لە ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ مزگەوت، خەڵکی لە پشتییەوە ڕیزیان بەست، الله أكبری خوێند؛ و بە بۆچوونی چوار مەزهەبەکە دەتوانرێت بە تەنهاش ئەنجام بدرێت، بۆ نموونە ئەگەر کەسێك نەخۆش بێت نەتوانێت بچێت بۆ مزگەوت یان ئافرەت، یان کەسێك لە شوێنێك بێت بە تەنها بێت.

شەشەم: ئافرەتان دەتوانن ئامادەبن بۆ بەجێهێنانی نوێژی خۆرگیران و مانگگیران لە مزگەوتدا بە جەماعەت، بوخاری لە ئەسمائی کچی ئەبوبەکرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((أَتَيْتُ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ حِينَ خَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَإِذَا النَّاسُ قِيَامٌ يُصَلُّونَ، وَإِذَا هِيَ قَائِمَةٌ تُصَلِّي)).

واتە: ڕۆیشتم بۆ لای عائیشەی هاوسەری پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك خۆرگیرا، خەڵك بەپێوە وەستابوون نوێژیان دەکرد، و عائیشەش بەپێوە وەستابوو نوێژی دەکرد.

---

(١). بڕوانە: (فتاوى نور على الدرب)(٣٨١/١٣).

حەوتەم: دوای نوێژەکە پێشنوێژ سوننەتە گوتارێك بخوێنێتەوە هانی موسڵمانان بدات لە خوا بترسن و تەوبە بکەن و داوای لێخۆشبوونی لێ بکەن، و لە سامانیان ببەخشن، بوخاری و مسلم لە عائیشەوە ریوایەتیان کردووە دەڵێت: ((خَسَفَتِ الشَّمْسُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَصَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ بِالنَّاسِ... ثُمَّ انْصَرَفَ، وَقَدِ انْجَلَتِ الشَّمْسُ، فَخَطَبَ النَّاسَ، فَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللهِ، لاَ يَنْخَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَادْعُوا اللهَ وَكَبِّرُوا، وَصَلُّوا وَتَصَدَّقُوا)).

واتە: لە سەردەمی پێغەمبەری خوا خۆرگیرا، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بە خەڵك کرد... پاشان نوێژەکەی تەواو کرد، خۆرگیرانەکە تەواو بوو، گوتاری بۆ خەڵك خوێندەوە، سوپاس و ستایشی خوای کرد، پاشان فەرمووی: دڵنیابن خۆر و مانگ دوو ئایەتن لە ئایەتەکانی خوا، ناگیرێن بۆ مردن و ژیانی کەس، ئەگەر ئەو حاڵەتان بینی لە خوا بپارێنەوە و الله أکبر بکەن، و نوێژ بکەن و ببەخشن.

## بَابُ صَلاةِ الاستِسقَاءِ

**تُسَنُّ عِندَ الجَدْبِ رَكعَتَانِ، بَعدَهُمَا خُطبَةٌ تَتَضَمَّنُ التَّذكِيرَ، وَالتَّرغِيبَ فِي الطَّاعَةِ، وَالزَّجرَ عَن المَعصِيَةِ، وَيَستَكثِرُ الإِمَامُ وَمَن مَعَهُ مِن الاستِغفَارِ، وَالدُّعَاءِ بِرَفعِ الجَدبِ، وَيُحَوِّلُونَ جَمِيعًا أَردِيَتَهُم.**

## بابەتی نوێژەبارانە

**سوننەتە لە کاتی وشەکەساڵیدا دوو ڕکات نوێژ بکرێت، لە دوای نوێژەکە گوتارێك دەخوێندرێت، بیرخستنەوە و هاندان بۆ گوێڕایەڵی خوا، و یاساغیکردن و وریاییدان لە سەرپێچیکردنی لەخۆ دەگرێت، و ئیمامەکە و ئەوانەی لەگەڵیدا نوێژ دەکەن زۆر داوای لێخۆشبوون و پۆشینی تاوانەکانیان دەکەن، و دوعا دەکەن و دەپاڕێنەوە بۆ ئەوەی خوا بێ بارانی و وشەکەساڵییان لەسەر هەڵبگرێت، و هەموویان بەشی سەرەوەی پۆشاکەکەیان هەڵدەگێڕنەوە.**

(**تُسَنُّ عِندَ الجَدْبِ رَكعَتَانِ**) ئەم نوێژە دوو ڕکات نوێژە لە کاتی نەبارانی باراندا ئەنجام دەدرێت بۆ ئەوەی داوا لە خوای پەروەردگار بکەن بارانیان بۆ ببارێنێت و وشکە ساڵییان لەسەر هەڵبگرێت، ئەبوداود لە عائیشەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ((شَكَا النَّاسُ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ قُحُوطَ الْمطَرِ، فَأَمَرَ بِمِنْبَرٍ، فَوُضِعَ لَهُ فِي الْمُصَلَّى، وَوَعَدَ النَّاسَ يَوْمًا يَخْرُجُونَ فِيهِ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَخَرَجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ حِينَ بَدَا حَاجِبُ الشَّمْسِ، فَقَعَدَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَكَبَّرَ ﷺ، وَحَمِدَ اللهَ عَزَّوَجَلَّ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّكُمْ شَكَوْتُمْ جَدْبَ دِيَارِكُمْ، وَاسْتِئْخَارَ الْمَطَرِ عَنْ إِبَّانِ زَمَانِهِ عَنْكُمْ، وَقَدْ أَمَرَكُمُ اللهُ عَزَّوَجَلَّ أَنْ تَدْعُوهُ، وَوَعَدَكُمْ أَنْ يَسْتَجِيبَ لَكُمْ، ثُمَّ قَالَ: الْحَمْدُ للهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ مَلِكِ يَوْمِ الدِّينِ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ، يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ، اللَّهُمَّ أَنْتَ اللهُ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ الْغَنِيُّ وَنَحْنُ الْفُقَرَاءُ، أَنْزِلْ عَلَيْنَا الْغَيْثَ، وَاجْعَلْ مَا أَنْزَلْتَ لَنَا قُوَّةً وَبَلَاغًا إِلَى حِينٍ، ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ، فَلَمْ يَزَلْ فِي الرَّفْعِ حَتَّى بَدَا

بَيَاضُ إِبطَيْهِ، ثُمَّ حَوَّلَ إِلىَ النَّاسِ ظَهْرَهُ، وَقَلَبَ، أَوْ حَوَّلَ رِدَاءَهُ، وَهُوَ رَافِعٌ يَدَيْهِ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ وَنَزَلَ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، فَأَنْشَأَ اللهُ سَحَابَةً فَرَعَدَتْ وَبَرَقَتْ، ثُمَّ أَمْطَرَتْ بِإِذْنِ اللهِ، فَلَمْ يَأْتِ مَسْجِدَهُ حَتَّى سَالَتِ السُّيُولُ، فَلَمَّا رَأَى سُرْعَتَهُمْ إِلىَ الْكِنِّ ضَحِكَ ﷺ، حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ، فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ اللهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، وَأَنِّي عَبْدُ اللهِ وَرَسُولُهُ)).

واتە: خەڵك سكاڵای باران نەبارینیان كرد لای پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمانی كرد مینبەرێكی لە نوێژگە (مصلى) بۆ دانرا، و ڕۆژێكی بۆ خەڵك دیاری كرد لەو ڕۆژدا دەربچن بۆ نوێژگە، عائیشە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ سەرەتای هەڵهاتنی خۆر لە ماڵ دەرچوو، لەسەر مینبەرەكەی دانیشت، پێغەمبەری خوا ﷺ الله أكبری كرد، و ستایشی خوای باڵادەستی كرد، پاشان فەرمویی: ئێوە سكاڵای وشكە ساڵی شار و دواكەوتنی باران بارینتان لە كاتی خۆیدا كرد، و خوا فەرمانی پێكردوون لێ بپاڕێنەوە، و بەڵێنی پێداون وەڵامی داواكارییەكانتان بداتەوە، پاشان فەرمووی: سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگاری هەموو بوونەوەر، خاوەن بەزەیی و میهرەبانییەكی فراوانە و ڕەحم دەكات بە هەركەس لە بەندەكانی كە بیەوێت، خوا پاشا و خاوەنی ڕۆژی لێپرسینەوەیە، هیچ پەرستراوێكی حەق نییە جگە لە خوا، چی بوێت ئەنجامی دەدات، پەروەردگار تۆ خوای هیچ پەرستراوێكی حەق نییە جگە لە تۆ، تۆ دەوڵمەندیت و ئێمە هەژارین، بارانمان بەسەردا ببارێنە، و ئەوەی بۆمان دەبارێنیت بیكە بەهێز و ئەوەندە بەردەمی بكە هەتاكو ئەو كاتەی پێویستمان پێیەتی، پاشان دەستەكانی

بەرزکردەوە، بەردوام دەستی بەرز دەکردەوە هەتاکو سپیایی ژێر باڵەکانی دەرکەوت، پاشان پشتی کردە خەڵکەکە، و پۆشاکەکەی سەرەوەی هەڵگەڕاندەوە و دەستاکانی بەرزکردبوویەوە، پاشان ڕووی کردە خەڵکەکە و لەسەر مینبەرەکەی دابەزی، و دوو ڕکات نوێژ کرد، خوای پەروەردگار هەورێکی دروستکرد و بروسکە و گرمەی هات، پاشان بە ئیزی خوا باران باری، نەگەیشتەوە مزگەوتەکەی هەتاکو لافاو هەستا، کاتێك بینی بەخێرا گەڕانەوە بۆ ماڵەوە پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی هەتاکو کاکیلەکانی دەرکەوت، فەرمووی: گەواهی دەدەم کە خوا توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، و من بەندە و پێغەمبەری خوام.

نەوەوی دەڵێت: زانایان کۆدەنگن دوعاکردن و پاڕانەوە بۆ بارینی باران سوننەتە، و ناکۆکن ئایا سوننەتە نوێژی بۆ بکرێت یان نا؟ ئەبوحەنیفە دەڵێت: سوننەت نییە نوێژی بۆ بکرێت بەڵکو دوعا دەکرێت بۆ بارینی باران بەبێ نوێژ، و زانایانی تر لە سەلەف و خەلەف لە هاوەڵان و تابعییەکان و زانایانی دوای ئەوانیش دەڵێن: سوننەتە[1].

(**بَعدَهُمَا خُطبَةٌ**) نوسەر بەم بڕگەیە ئاماژەی بەوە دەکات گوتاری نوێژەبارانە دوای نوێژەکەیە، بە بەڵگەی فەرموودەیەك کە ئەحمەد و ئیبن ماجە لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە، بەڵام ئەلبانی ئەو فەرموویەی بە زەعیف

---

(١) . ( المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج)(٦/١٨٧).

داناوە و دەڵێت: (منكر بذلك الخطبة بعد الصلاة)[1]؛ بەڵكو لە فەرموودەکەی عائیشە باسی ئەوەی کرد گوتاری بۆ خوێندووە، پاشان لەسەر مینبەرەکە دابەزیوە پاشان دوو ڕکات نوێژی کردووە.

(**تَتَضَمَّنُ التَّذكِيرَ، وَالتَّرغِيبَ فِي الطَّاعَةِ، وَالزَّجرَ عَن المَعصِيَةِ، ويَستَكثِرُ الإمَامُ وَمَن مَعَهُ مِن الاستِغفَارِ، وَالدُّعَاءِ بِرَفعِ الجَدبِ**) لەبەر ئەوەی وشکەساڵی و باران نەبارین هۆکارەکەی تاوان و خراپەکارییە، خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ وَلَٰكِن كَذَّبُوا۟ فَأَخَذْنَٰهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٩٦﴾﴾(الأعراف).

واتە: ئەگەر خەڵکی شارەکان باوەڕ بهێنن و پارێزکاربن و لە خوا بترسن، ئەوا دەرگای فەڕ و بەرەکەتی ئاسمان و زەویمان بۆ دەکردنەوە، بەڵام باوەڕیان نەهێنا و پێغەمبەرانیان بە درۆزانی، بۆیە سزاماندان بەهۆی کردەوەکانیانەوە.

و ئیبن ماجە لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی هەندێك تاوانی کردووە ئەگەر بڵاوبوونەوە ڕووبەڕووی چەند سزایەك دەبنەوە، دەفەرمویێت: ((وَلَمْ يَمْنَعُوا زَكَاةَ أَمْوَالِهِمْ إِلَّا مُنِعُوا الْقَطْرَ مِنَ السَّمَاءِ، وَلَوْلَا الْبَهَائِمُ لَمْ يُمْطَرُوا)).

واتە: ئەگەر زەکاتی سامانەکانیان دەرنەکەن بارانیان بۆ ناباریێت لە ئاسمانەوە، و ئەگەر ئاژەڵەکان نەبووایە بارانیان بۆ نەدەباری.

(١) . بڕوانە: (سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة وأثرها السيئ في الأمة)(٢٨٥/١٢).

بۆیە پێویستە گوتارخوێن هانیان بدات لە خوا بترست و دەست لە تاوان هەڵبگرن و تەوبە بکەن و بە باشی زەکاتی سامانەکانان دەبکەن و داوا لە خوا بکەن بارانیان بۆ ببارێنێت.

(**وَيُحَوِّلُونَ جَمِيعًا أَرْدِيَتَهُم**) بوخاری لە عبداللەی کوڕی زەیدەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ يَسْتَسْقِي، فَتَوَجَّهَ إِلَى الْقِبْلَةِ يَدْعُو، وَحَوَّلَ رِدَاءَهُ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، جَهَرَ فِيهِمَا بِالْقِرَاءَةِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ داوای باران بارین، ڕووی کردە قیبلە و پاڕایەوە، و پۆشاکەکەی هەڵگەڕاندەوە، پاشان دوو ڕکات نوێژی کرد، دەنگی لە نوێژەکەدا بەرزکردەوە.

بەڵام ئایا ئەو موسڵمانەی ئامادەی نوێژەکە دەبن پۆشاکەکانیان هەڵدەگەڕێننەوە، لە ڕیوایەتی ئیمامی ئەحمەددا هاتووە: ((وَحَوَّلَ رِدَاءَهُ فَقَلَبَهُ ظَهْرًا لِبَطْنٍ، وَتَحَوَّلَ النَّاسُ مَعَهُ))، ئەلبانی دەڵێت: ئەحمەد بە سەنەدێکی بەهێز ڕیوایەتی کردووە بەڵام باسکردنی: ((وَتَحَوَّلَ النَّاسُ مَعَهُ)) (شاذ)ە، وەك چۆن لێکۆڵینەوەم بۆ کردووە لە (سلسلة الأحاديث الضعيفة)(٥٦٢٩)[1].

چەند پرسێك: یەکەم: هەندێك لە زانایان دەڵێن: نوێژە بارانە لە نوێژگە بە ڕوخسەت و داوای کاربەدەستان دەکرێت[2]، بەڵام ئیبن عوسەیمین دەڵێت: مەرج نییە بۆ نوێژەبارانە کاربەدەست ڕوخسەتی پێ بدات، بەڵکو ئەگەر وشکە ساڵی

(١). (تمام المنة)(٢٦٤).

(٢). بڕوانە: (شرح صحيح البخاري لابن بطال)(٨/٣).

بێت و باران نەبارێت خەڵك دەردەچێت و نوێژ دەكەن، و ئەگەر هەموو ناوچەیەك بە تەنها نوێژ بكەن پێچەوانەی سوننەتیان نەكردووە[1].

دووەم: ترمزی لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی كردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ((إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ خَرَجَ مُتَبَذِّلًا مُتَوَاضِعًا مُتَضَرِّعًا، حَتَّى أَتَى الْمُصَلَّى، فَلَمْ يَخْطُبْ خُطْبَتَكُمْ هَذِهِ، وَلَكِنْ لَمْ يَزَلْ فِي الدُّعَاءِ وَالتَّضَرُّعِ وَالتَّكْبِيرِ، وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ كَمَا كَانَ يُصَلِّي فِي العِيدِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بە پۆشاكی شڕ و خاكییانە و ملكەچانە ڕۆیشت بۆ نوێژگە، وەك ئەم گوتارەی ئێوە گوتار نەدەخوێندەوە، بەڵكو بەردەوام دوای دەكرد و زەلیلی دەردەبڕی و الله أكبری دەكرد، و دوو ڕكات نوێژی كرد وەك چۆن لە جەژندا نوێژی دەكرد.

سێیەم: جمهوری زانایان دەڵێن: نوێژە بارانە هەموو كاتێك دەكرێت كە پێویست بێت جگە لە كاتە مەكروهەكان[2].

چوارەم: سوننەت مینبەر لە نوێژگە دابنرێت و ڕۆژێك بۆ خەڵك دیاری بكرێت كۆببنەوە، چونكە لە فەرموودەكە عائیشەدا گوتی: ((فَأَمَرَ بِمِنْبَرٍ، فَوُضِعَ لَهُ فِي الْمُصَلَّى، وَوَعَدَ النَّاسَ يَوْمًا يَخْرُجُونَ فِيهِ)).

پێنجەم: سوننەتە ئیمام دەستەكانی زۆر بەرز بكاتەوە لە كاتی دوعاكردندا، چونكە: ((رَفَعَ يَدَيْهِ، فَلَمْ يَزَلْ فِي الرَّفْعِ حَتَّى بَدَا بَيَاضُ إِبِطَيْهِ)).

---

(١). (الشرح الممتع)(٥/٢٢٤).

(٢). بڕوانە: (المجموع)(٥/٧٦).

شەشەم: ئیمام پۆشاکەکەی سەرەوەی هەڵدەگەڕێنێتەوە و لەبەری دەکات: ((وَحَوَّلَ رِدَاءَهُ)).

حەوتەم: نێو لەپی دەستەکانی ڕووەو زەوی و پشتی دەستەکانی ڕووەو ئاسمان بەرز دەکاتەوە، مسلم لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اسْتَسْقَى فَأَشَارَ بِظَهْرِ كَفَّيْهِ إِلَى السَّمَاءِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ پاڕایەوە بۆ بارینی باران بە پشتی لەپی دەستەکانی ئاماژەی کرد و بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان.

و خەڵکیش دەستەکانیان بۆ دوعا بەرز دەکەنەوە، بوخاری لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((أَتَى رَجُلٌ أَعْرَابِيٌّ مِنْ أَهْلِ الْبَدْوِ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ هَلَكَتِ الْمَاشِيَةُ هَلَكَ الْعِيَالُ هَلَكَ النَّاسُ فَرَفَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَدَيْهِ يَدْعُو وَرَفَعَ النَّاسُ أَيْدِيَهُمْ مَعَهُ يَدْعُونَ، قَالَ فَمَا خَرَجْنَا مِنَ الْمَسْجِدِ حَتَّى مُطِرْنَا)).

واتە: پیاوێکی دەشت نشین هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جومعەدا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئاژەڵ و خێزان و خەڵك فەوتان و لەناوچوون، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستەکانی بەرزکردەوە و دوعای کرد و خەڵکیش لەگەڵیدا دەستیان بەرزکردەوە و دوعایان دەکرد، دەڵێت: لە مزگەوت دەرنەچووین بارانمان بۆ باری.

هەشتەم: نوێژەبارانە بانگ و قامەتی نییە، بوخاری لە ئەبوئیسحاقەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((خَرَجَ عَبْدُ اللهِ بْنُ يَزِيدَ الْأَنْصَارِيُّ، وَخَرَجَ مَعَهُ الْبَرَاءُ بْنُ

عَازِب وَزَيْدُ بْنُ أَرْقَمَ، رَضِيَ اللهُ عَنْهُم، فَاسْتَسْقَى، فَقَامَ بِهِمْ عَلَى رِجْلَيْهِ عَلَى غَيْرِ مِنْبَرٍ فَاسْتَغْفَر، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ يَجْهَرُ بِالْقِرَاءَةِ، وَلَمْ يُؤَذِّنْ وَلَمْ يُقِمْ)).

واتە: عبداللەی کوڕی یەزیدی ئەنصاری دەرچوو بۆ نوێژەبارانە، بەرائی کوری عازب و زەیدی کوری ئەرقەمیش لەگەڵیدا دەرچوون خوایان لێ ڕازی بێت، دوعا کرد بۆ باران بارین، و بەپێوە وەستاو و لەسەر مینبەر نەبوو و داوای لێ خۆشبوونی لە خوا کرد، پاشان دوو ڕکات نوێژی کرد دەنگی بەرز کردەوە لە قورئان خوێندنەوەکەی، و بانگی نەدا و قامەتەی نەکرد.

و دوو ڕکاتە نوێژەکەی وەك نوێژی بەیانی و الله أکبری تێدا ناکرێت، و ئەوەی ئیبن عەباس دەڵێت: ((وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ كَمَا كَانَ يُصَلِّي فِي العِيدِ))، جمهوری زانایان دەڵێن: مەبەستیان چۆنییەتی و ژمارەی ڕکاتەکانە.

نۆیەم: سوننەتە ئەو کەسەی بە ڕواڵەت پیاوچاك و لە خواترسە پێش بخرێت نوێژەبارانە بکات و داوای باران بارین لە خوای پەروەردگار بکات، بوخاری لە ئەسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ كَانَ إِذَا قُحِطُوا اسْتَسْقَى بِالْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنَّا كُنَّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّنَا ﷺ فَتَسْقِينَا، وَإِنَّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِعَمِّ نَبِيِّنَا فَاسْقِنَا، قَالَ: فَيُسْقَوْنَ)).

واتە: عومەر کوری خەتاب ئەگەر وشەکە ساڵی بێ و بارانی بووایە داوای دوعای باران بارینی لە عەباسی کوری عبدالمتەلب دەکر، و دەیگوت: پەروەردگار ئێمە داوامان لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد لێت بپارێتەوە بارانمان بۆ ببارێنیت، بارانت بۆ دەباراندین، ئێمە ئێستا داوا لە مامی پێغەمبەرەکەمان ﷺ دەکەین لێت بپارێتەوە بارانما بۆ ببارێنیت، بارانمان بۆ ببارێنە، ئەنەس دەڵێت: بارانیان بۆ دەباری.

## ناوەرۆك

